# كورد



له كتێبی (وفيات الأعيان و أنباء أبناء الزمان) ی (إبن خلكان)

(٦٨١ك/١٢٨٢ز)

## (لێكۆڵینەوەیەكە لە ڕۆڵی سیاسی و شارستانیەتی كورد)



حسین شاكر شریف

ناریین

# كـــــورد

## له كتێبی ( وفيات الأعيان و أنباءأبناءالزمان ) ی ( إبن خلكان )

## ( ٦٨١ك/١٢٨٢ز )

### ( لێكۆڵینەوەیەكە لە ڕۆڵی سیاسی و شارستانیەتی كورد )

نووسینی

حسين شاكر شريف

نـــاوی کتێـــــــب: کـــورد لە کتێبی (وفيات الأعيان و أنباءأبناءالزمان) ی (إبن خلكان) (٦٨١ك/١٢٨٢ز). (نامەی ماستەر)

نووسیـــنــــــــی: حسين شاكر شريف

نـەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین(کامران رفيق)

نورەو ســـاڵی چـــاپ: چاپی یەکەم؛ ساڵی ٢٠١٦

ژمـــــارەی سپـــاردن: (٧٦٦) ی ساڵی (٢٠١٥) ی پێدراوە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ ﴾

**الحجرات- الاية (١٣)**

# پێشەکی

کتێبی (وفیات الأعیان وأنباء أبناء الزمان) ی مێژوونووس و قازی و ئەدیبی بەناوبانگ (ئیبن خەلەکان) یەك لە دیارترین و بەبایەخترین کتێبە ژیننامەییەکانە کە لە ڕەوتی مێژوونووسی ئیسلامیدا بەرهەمهاتبێت، گرنگی ئەو کتێبە هەر لەوەدانیە کە ژیان و سەربووردەی کەسەکانی نێو مێژووی ئیسلامی کردۆتە تەوەر و هەروەتر لەچەندایەتی ئەو ژیننامانەش دانیە کە خراونەتە ڕوو، بەڵکو لە شێوازی هەڵبژاردنی ئەو کەسانەو چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو زانیاریانەدایە کەلەبارەی ئەوکەسانە وەدەستهەڵاتوون. ئیبن خەلەکان زۆر وەستایانە هەم لەهەڵبژاردنی کەسەکان و هەمیش لەسەرەودەریکردن لەگەڵ ووردەکاریەکانی ژیانیان مامەڵەی کردووە،ئەمەش وایکردووە، کە لە نێو ئەدەبی ژیننامە نووسی ئیسلامیدا، کتێبەکەی ئیبن خەلەکان پێگەیەکی تایبەتی هەبێ و دوای خۆی مێژوونووسانی دیکە لاسایان کردۆتەوەو لەمەیدانی ژیننامەنووسی ئیبن خەلەکاندا خۆیان تاقیکردۆتەوە، بەلأم کەس نەیتوانیوە جێی بگرێتەوە،بەڵکو ڕۆژ دوای ڕۆژ، بەهای زانیاریە مێژووییەکانی نێو کتێبی (وفیات الأعیان) لەزۆربوون و نێوبانگی نووسەرەکەشی لەهەڵکشان .لەم سۆنگەیەوە، کارنامە زانستیەکەی (م.حسین شاکر) بایەخەکەی لەوەدایە کە لەنێو پانتایی بەرفراوانی ئەو ژیننامانەدا، لەزانیاریە دیرۆکیەکانی تایبەت بە کوردو کوردستان گەڕاوەو پشت ئەستور بەو ڕاستیەی کە ئیبن خەلەکانی هەولێری و کورد لەنێو کتێبەکەیدا چ وەکو تۆمارکردنی ژیننامەی تایبەت بە کەسایەتیە کوردیەکان و چ لەنێو باسوخواسی تایبەت بە کەسایەتی و بابەتەکانی دیکە، زانیاری ناوازەی لەبارەی کوردو ولأتەکەیان یاداشت کردووە، دەرهێنانی ئەو زانیاریانەو بەراوردکردنیان بەزانیاری هاوشێوەو هی دیکەی سەرچاوەمێژوویەکان و شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنیان، کاری سەرەکی توێژەر بووە، کەپێم وایە لەو کارەدا سەرکەوتووبووە،چونکە من وەکو سەرپەرشتیاری نامەکە لەسەرەتای دەستپێکردنی

کارە ئەکادیمیەکە، ئەوەم لەگەڵ توێژەر بڕاندبوّوە کە پێویستە کارێکی شایستە بکات و توانا زۆرەکەی خۆی بەشێوەیەك بخاتەگەڕ، کەهەم شایانی نێوبانگی ئیبن خەلەکان بێت و هەمیش گوزارشت بێت لەو وزە ئەکادیمیە لێبڕاوانەی کەهەر لەقۆناغی خوێندنی بەکالۆریۆسـەوە لـەکاك حسـێن دا بەدیمانکردبوو،لەڕاستیشـدا کارەکـە وەکـو کەپێشبینیمانکردبوو وادەرچوو سوپاس بۆخوا بەسەرکەوتویی ئەنجامدرا .کاری ئەکادیمی شایان، پـتر بـە ڕێبـاز و میتـۆدە زانسـتیەکەی دەناسـرێتەوە ،لـەم نامـە زانستیەدا توێـژەر پابەنـدی ڕێبـازی زانسـتیانەی توێژینـەوەی مێـژوویی بـووە و جـار بەجاریش لە میتۆدی شیکاری و لێکەڕانیش بەهرەمەنـد بـووە، هەربۆیـە، خـۆی لـەوە بـواردوە تـەنها زانیاریـەکانی نێـو کتێبەکـە بگوازێتـەوەو بـەپێی پلانەکـەی ڕیزیـان بکا،بـەڵکو لەگـەڵ زانیاریـە هاوشـێوەکانی سەرچـاوەکانی دیکـە، لەبەریـەکی ڕانـاون وهەڵیسـەنگاندن و لـەو جێیـەی پێویسـتی کردبێـت شـیکردنەوەی بـۆکردون و ڕاسـتکردنەوەو ڕەخنەشـی خسـتوونەتە سـەر،ئەمەش وایکـردووە، توێـژەر هـەم بەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ سەرچاوەکاندا بکاو هـەروەتر کەسایەتی خۆشـی موتوربـەی ئەو بەرپرسیاریەتیە بکات، سەرەنجام سەرەودەریەکی نوێی لەتەك ئەو جـۆرە ڕێبـازە توێژینەوەیە کردووە کە تایبەتە بە مامەڵەکردن لەگـەڵ چـەند زانیاریـەکی جـۆری نێـو یەك سەرچـاوە . لەکۆتاییـدا جێـی خۆیـەتی هـەم دەستخۆشـی و هـەم پیرۆزبـایی لـە م.حسێن شاکر بکەم و ئومێدی سەرکەوتنی زیـاترو کـاری بـەپێزتری لیبکـەم، دڵنیـام زۆرتری پێیە و لە ئایندەدا چاومان بە بەرهەمی دیکە ڕۆشـن دەکـات،بۆمنیش جێگـای شـانازیە لـەنێو سـەدان قوتـابی کـە لـەزانکۆ ڕۆڵـم لەپێگەیانـدن و ئاڕاسـتەکردن و مشتومالکردنی زەین و توانایان دا هەبووە، بەرهەمی هەندێکیان بەچاوی خۆم ببینم و لەهەوڵ و خولیاو ڕەنج و توانای زانستیان بەهرەمەندبم ،هیوادارم خویابێت کە خەبات وخەم و خەونەکانمان لە توانست و شایستەیی ئەواندا درێژەی هەیە .

د.قادر محمد حسن پرۆفیسۆری هاریکار /کۆلێژی ئاداب/زانکۆی سەلاحەدین

# پێشکەشە بە

- بۆ ئەو خۆشەویستەی کە خوای گەورە بەهەشتی لە ژێر پێیەکانی داناوە، کە بەفرمێسکەکانی سۆزو بەزەییی پڕ رەحمەتی بەدەستهێناوە. (دایکم)
- ئەو کەسەی کە هەوڵی چەندین ساڵانی دابوو بۆ ئەوەی بمانخاتە سەر رێگەی ژیانێکی خۆش، وە ئەو کەسەی کە هەموو رەوشتەکانی راست گۆییی و دەست پاکی و چاکی لە ناو دڵ و بیرمدا رێ ئەکا.(باوکم خوا لێ خۆشبێت)
- بۆ ئەو کەسانەی کە ژیانم لە گەڵیان دابەشکردووە، بە هەموو خۆشی وناخۆشیەکانەوە، بۆ ئەو کەسانەی کە هاوپشتی رێگا کەم بوون.(برا و خوشکەکانم)
- بۆ ئەو کەسانەی کە رووناك کەری رێگاکەم بوون بە رۆشنایی زانست وباوەڕ، وە بۆ ئەوانەی منیان گەیاندە کەناری ئارام بە زانست و زانیاری و عەقلی سەرکەوتوویان.(مامۆستاکانم)
- بۆ ئەو کەسانەی ژیانی منداڵی و قۆناغەکانی خوێندنم لە گەڵیان دا بەسەربردووە. (هاورێکانم)

# سوپاس وپێزانین

دوای سوپاس وستایشی خوای پەروەردگار، کە هاوکاریکردم، لە تەواوکردنی ئەم توێژینەوەیەدا، بەپێویستی دەزانم، ڕۆڵی هەموو ئەوانە بەرز بنرخێنم، کەلە بەڕێوەچوونی خوێندن وتەواوکردنی ئەو نامەیەدا بەجۆرێك لە جۆرەکان شوێن پەنجەیان دیارە. لەسەرەتادا سوپاسی بێ پایانم بۆ مامۆستای ئازیز (پ.ی.د. قادر محمد حسن)کە ئەرکی سەرپەرشتی کردنی ئەو نامەیەی گرتە ئەستۆ، بە تەرخان کردنی کاتی زێرینی خۆی، بە پێدانی سەرچاوە وخستنە ڕووی تێبینی و سەرنج وپێشنیازە زانستیەکانیو هاندان و مامەڵەی برایانەی، نامەکەی دەوڵەمەنتر کرد.

هەروەها سوپاس وپێزانینم بۆ هەریەکە لە (پ.د.ارسن موسی رشید) و(پ.د.محسن محمد) و(پ.ی.د.حسام الدین نەقشەبەندی) لەسەر هاوکاری و پشت گیری کردنەکانیان سوپاسیان دەکەم. هەروەها زۆر سوپاس ودەست خۆشی لەیەکە بەیەکەی ئەو مامۆستا بەڕێزانە دەکەم، کەلە میانەی هەردوو کۆرسی خوێندنی بالآدا، لەگەڵمان ماندوو بوون. دیسانەوە سوپاسی هەریەك لە بەڕێز(پ.ی.د.قادر محمد)و(پ.ی.د.احمد عبدالعزیز)دەکەم کە پێشنیاری نووسینی توێژینەوەکەمیان لەسەرئەو ناونیشانەکرد. دەستخۆشی خۆم ئاراستەی هەریەکە لە هاورێی خۆشەویست ودڵسۆزم (م.سامان صلاح فتاح) کەئەرکی بەدواداچوونەوەی زمانەوانی بۆی ئەنجام دام، هەروەها سوپاسی (م.یاسین محمد)دەکەم ئەرکی وەرگێڕانی پوختەی توێژینەوەکەی لەکوردی یەوە بۆ زمانی ئینگلیزی ئەنجام دا .

سوپاسێکی تایبەتم بۆ هاوڕێیانی سەردەمی خوێندنی بالآ هەیە، کە هەمیشە ڕێنمایی وئالوگۆڕکردنی بیرو بۆچوونەکانمان مایەی سودو بەهرەمەندی بوون. لەهەمان کاتدا سوپاس ودەست خۆشی بۆ هەریەکە لە (م.خسرو جبار)و(د.همزە کاکە یاسین)و

(م.كـــامران علـــی فـــتح الله)(م.محســـين مامـــل)و(م.يوســـف صـــابر)و(م.بـــارزان محمـد)و(م.محمـد عبـد العزيـز)و خالـّـه(طلعــت شـێخانی) وخالـّـه(ديـار) و(م.شـێرزاد ڕەمـەزان)و(م.نيـوار مـراد) و هـەموو ئەوماموٚسـتاو برادەرانـه دەكـەم، ئەگـەر بەيـەك هەنگاويش بێت هاوكاريان كردووم.

بەهـەمان شـێوه سوپاسـی يەكـه يەكـەی كارمەنـدانی كتێبخانـەی بەشـی مێـژوو، كتێبخانەی بەشـی كۆليـژی ئـەدەبيات (زانكـۆی سـەلاحەددين)، كتێبخانـەی ناوەنـدی هەولێر، كتێبخانـەی زەيتونـەی هـەولێر، كتێبخانـەی مزگـەوتی سـەحابە، كتێبخانـەی كۆمەڵەی ڕۆشنبيری مێژوويی كوردستان، كتێبخانەی بەشـی مێـژوو (زانكـۆی دهـۆك)، كتێبخانەی ناوەندی پارێزگای دهۆك، كتێبخانەی گشـتی زانكـۆی موسـل، كتێبخانـەی بەشـی مێـژوو وگشـتی زانكـۆی سـلێمانی، كەلـەكاتی بەدواداچـوون وگـەڕان بـه دوای سەرچاوەكانم كارئاسانی ويارمەتی زۆريان داوم.

## هێما کورتکراوەکان

أ- هێما عەرەبیەکان :

ت : توفي

ت : ترجمة

ص : الصفحة

ص ص : الصفحات

مج : المجلد

ق : القسم

ط : الطبعة

ه : التاريخ الهجري

م : التاريخ الميلادي

د.م : دون مكان الطبع

د.ت : دون تاريخ الطبع

د.م.ت : دون مكان وتاريخ الطبع

ب_ هێما کوردییەکان :

ز : زایینی

ك : کۆچی

ل : لاپەڕە

ل ل : لاپەڕەکان

چ : چاپ

و : وەرگێران

م : مردوو (ئەگەر لە پێش ناو هاتبێ )

ج_ هێما فارسیەکان :

ص : الصفحه

ص ص : الصفحات

د_ هێما ئینگلیزیەکان

p : page > (لاپەڕە )

p.p : pages > (لاپەڕەکان )

vol : volume > (بەش )

# پوختەی نامە

توێژینەوەکە لە ژێر ناونیشانی، کورد لە کتێبی (وفيات الاعيان وأنباء أبناء الزمان ) ی (ابن خلكان)ە، باس لە ڕۆڵی سیاسی و شارستانیەتی کورد لە چوارچێوەی کتێبەکە دەکات، ئاماژە بەو کەسایەتیە ناودارە کوردییانە کراوە کە خزمەتێکی زۆریان لە بوارە سیاسی وسەربازی و زانستی وڕۆشنبیری بەشارستانی ئیسلامی کردووە، کتێبی(وفيات الاعيان) لە نێو کتێبە ژیننامەکاندا بە پێشەنگ دادەنرێت. کە لە لایەن ( ابن خلكان ) زانا و مێژوو نووسی کوردەوە نوسراوە. تیایدا ژیان و سەر بووردەی بە شێکی زۆر لە کە سایەتییە ناسراو و فەرمانڕەوا و ئەدیبەکانی سەردەمی خۆی و پێش خۆیشی تێدا کۆکردۆتەوە، لە نێو ئەو کە سایەتیانەشدا بە شێکی کوردن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە باسی کەسایەتییەکاندا چەندین ڕووداوی باسکردووە، کە پەیوەندییان بە کوردەوە هەیە و گرنگییەکی تایبەتی هەیە، لە توێژینەوەی مێژووی کورد و ناوچە کوردییەکاندا.

توێژینەوەکە سەرەڕای پێشەکی و ئەنجامگیری، بەسەر سێ بەشی سەرەکیدا دابەش ئەبێت وێرای ئەوەش لە کۆتاییدا پاشکۆ ولیستی سەرچاوەکانیش خراوەتەڕوو. بەشی یەکەم تایبەت کراوە بە لەدایك بوون وپێگەیشتنی نووسەرو پەیرەوی کتێبەکەی، کە لە پێنج تەوەرە پێك هاتووە، لەتەوەرەی یەکەمدا تیشك خراوەتە سەر ژیانی نووسەر و پێگەیشتن و خانەوادەکەی.لە تەوەرەی دووەم ئاماژە بە گەشتە زانستییەکانی بۆ شام ومیسرودیارترین مامۆستاکانی کراوە، تەوەرەی سێیەمیش تایبەتە بەو پۆستە کارگێری وزانستیانەی کە نووسەر وەریگرتوون، تەوەرەی چوارەم، باس لە بیروڕای مێژوونوسان لەبارەیەوە کراوە، دوا تەوەریش تایبەت کراوە بە لێکۆڵینەوە لەسەر کتێبی (وفيات الاعيان)و تیشك خراوەتە سەر ناوی کتێبەکەو پاڵنەری نووسینی کتێبەکەوکات وشوێنی نووسینی و بەشەکانی و ئەو میتۆدەی کە نوسەر لە کۆکردنەوە و تۆمارکردنی ژیاننامەکاندا بەکاریهێناوە. لەگەڵ گرنگی وکاریگەری کتێبەکە .بەشی دووەمیش لە شەش تەوەرە پێکدێت، لە تەوەرەی یەکەم

باسی سەڵتەنەت وفەرمانڕەوایی ومیرە کوردەکان کراوە، لەتەوەرەی دووەم ئاماژە بە وەزیرە کوردییەکان کراوە.

هەرچی تەوەرەی سێیەمە، تایبەتە بە سەرگوزشتەی دادوەرە کوردەکان، تەوەرەی چوارەمیش باس لە سەرکردە سەربازییەکان کراوە، تەوەرەی پێنجەم تایبەت کراوە بە پەردەدارە کوردەکان و لە کۆتا تەوەرەشدا باس لە بەرپرسی قەلا کراوە.لە بەشی سێیەم وکۆتاییدا جەخت کراوەتەوە سەر ڕەهەندی شارستانیەتی، کە تایبەتە بە ژیننامەی کەسایەتییە کوردییەکان و ڕۆڵی شارستانییەتیان لە بوارە زانستی وهزری وڕۆشنبیرییەکاندا ودابەشکراوە بۆ سێ تەوەرە، لەتەوەرەی یەکەم ودووەمدا باس لەو کەسایەتیە کوردیانە کراوە کە شارەزابوون لە زانستە نەقڵی و عەقلییەکاندا، کۆتا تەوەرەش تیشك خراوەتەسەر ڕۆڵی کەسایەتییە کوردییەکان لە بواری بیناسازی وئاوەدانکاری و پەروەردەییدا و زیاتر جەخت لەو کەسایەتیانە کراوە کە ڕۆڵیان بینیوە لە دروستکردنی قوتابخانەوخانەی فەرمودەوخانەقاوبیمارستان وهەروەها ئاماژەمان بەوانەبێژانی کورد لەقوتابخانەوشوێنە زانستی یەکان کردووە. دوای ئەوەش ئاماژە بە گرنگترین ئەو ئەنجامانەی کە توێژەر پێیان گەیشتووە لەچەند خالێکی پوخت تۆمار کراون.

# پێشەکی و چوارچێوەی لێکۆڵینەوەکە

( ابن خلكان ) مێژوو نووس، ئەدیب و قازی، یەکێکە لە ناودارترین مێژوو نووسانی ئیسلام، کە بەڕەچەڵەك کورد و لە دایك بووی شاری هەولێرە. لە گرینگترین بەرهەمەکانی کتێبی ( وفيات الاعيان وانباء ابناء الزمان ) ە، کە کتێبێکی ژیاننامەیە، تیایدا ژیان و سەر بووردەی بە شێکی زۆر لە کە سایەتییە ناسراو و فەرمانڕەوا و ئەدیبەکانی سەردەمی خۆی و پێش خۆیشی تێدا کۆکردۆتەوە، لە نێو ئەو کە سایەتیانەشدا بە شێکی کوردن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە باسی کەسایەتییەکاندا چەندین ڕووداوی باسکردووە، کە پەیوەندییان بە کوردەوە هەیە و گرنگییەکی تایبەتی هەیە، لە توێژینەوەی مێژووی کورد و ناوچە کوردییەکاندا.

ئەم کتێبە هەندێك زانیاری گرنگ وپەیوەندیداری لە بارەی کوردەوە لە خۆگرتووە، بە تایبەتی دەربارەی هەندێك لەسەرکردە سەربازییە کوردەکانی سەردەمی عەباسی و کۆتا ڕۆژگارەکانی فاتمییەکان ولەناوچونیان ودامەزراندنی دەولەتی ئەیوبیەکان. هەروەها ئەم کتێبە گرنگییەکی زۆری بە پاشاو سەرکردە ومیرەکانی ئەیوبیی داوە و چۆنیەتی گەیشتنی بنەماڵەی ئەیوبی کوردی بۆ لووتکەی دەسەلات وناوبانگیان لەجیهانی ئیسلامیدا و ڕۆڵی شارستانیەتی وئاواکارییان بە وردی باس کردووە. سەرەڕای ئەو گرنگییە گەورەیەی، ئەم کتێبە بۆ مێژووی کورد هەیەتی، هێشتا توێژینەوەیەکی ئەوتۆی لەو بارەوە نەکراوە، لە زانکۆکانی هەرێمی کوردستاندا. ئەگەرچی گرنگیدراوە بە لێکۆڵینەوەی تایبەت، بۆ ئەو سەرچاوانەی ئاماژەیان بۆ مێژووی کورد وناوچە کوردنشینەکان کردووە، بەتایبەتی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کە بە سەردەمی مێژووی ئیسلام ناودەبرێت. هەر لەم بوارەشدا چەندین لێکۆڵینەوەی نامەی ماستەرو تێزی دکتۆرا بەدی دەکەین، کە ڕۆڵی سیاسی وسەربازی وشارستانێتی کوردیان لەسەردەمەکاندا لە چوارچێوەی کتێبێك هەڵسەنگاندووە. هەموو ئەم

توێژینەوانەش بایەخێکی زۆریان هەیە، لە کۆکردنەوە و شیکردنەوەی ئەو نووسینانەی لەسەر کورد هەنە و لە بەراوردکردن و سەر لە نوێ ڕێکخستنەوەیاندا.

ئەوەندەی ئاگادارین ئەم توێژینەوەیەش ئەبێتە یەکەم توێژینەوە، لەسەر ڕۆڵی سیاسییانە و شارستانییانەی کورد، لە کتێبی (وفیات الاعیان) ی ( ابن خلکان) دا. کە تێیدا، پێداچوونەوەمان بۆ ژیان و ڕەچەڵەکی هەموو ئەو کە سایەتیە کوردانە کردووە، کە نوسەر ناوی هێناون و هەڵسەنگاندنمان بۆ گێڕانەوەکانی کردووە و بەراوردمان کردوون، بەو نوسینانەی تر، کە لە سەرچاوەکانی ترەوە لەسەر ئەو بابەتانە بەدەستمان گەیشتوون.

لەبارەی هەڵبژاردنی بابەتەکەشەوە دەکرێت ئاماژە بەچەند خاڵێك بکەین، کە سەرەکیترینیان حەز و ئارەزووی کەسی توێژەر بووە، بۆ بەشداریکردن لەو هەوڵانەی کە کار لەسەر کۆکردنەوە و سەرلەنوێ پۆلێنکردنەوەی بەشە پەرتەوازەبووەکانی مێژووی کورد ئەدەن. بۆیە وەك لە ئەستۆ گرتنی بەشێك لەو ئەرکە کتێبی (وفیات الاعیان)مان هەڵبژارد، ئەمەش لەبەر ئەو گرنگیی و تایبەتمەندییانەی کە ئەم کتێبە لە خۆی ئەگرێت، وەك چۆن لەسەرەوە باسمان کرد.

سەرەرای ئەوەی ئەم مێژوو نووسە هاوچەرخی هەردوو سەردەمی ئەیوبی ومەمالیکەکان بووە. بە جۆرێك کە بەشێکی ئەو کەسایەتیە کوردیانەی کەلەسەر گوزشتەی تایبەت باسی کردوون، پێشتر خۆی چاوی پێیان کەوتووە و لەگەڵ هەندێکیشیاندا لە نزیکەوە پەیوەندی هەبووە. بۆیە ئەم کتێبە یەکێکە لە گرنگترین ئەو سەرچاوانەی کە ناتوانین لێی بێنیازبین و هەر توێژینەوەیەکی مێژووی لەسەر کورد لەو سەردەمەدا بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەم کتێبە، توێژینەوەیەکی ناتەواو ئەبێت. لەبەر ئەم هۆیانەش بە پێویستمان زانی ئەم کتێبە بکەینە بابەتی سەرەکی توێژینەوەکە بە ناونیشانی: ( کورد ) لە کتێبی(وفیات الأعیان وأنباء أبناء الزمان)ی(ابن خلکان).لە توێژینەوەکەشدا هەوڵمداوە پابەندبم بە ڕێبازی توێژینەوەی مێژووە و ئەمانەتی

زانستی بپارێزم و لە کاتی وەرگرتنی زانیارییەکان لە سەرچاوەکانەوە، ڕەچاوی شێوازی زانستییانەی وەرگرتن و دارشتنەوەی دەقەکان بکەم، لە وەرگرتنەوە ناراستەوخۆکاندا و هەندێك جاریش لە بەر گرنگی دەقەکە وەك خۆی دامان ڕشتووەتەوە، واتە بە وەرگرتنی ڕاستەوخۆی دەق. لە هەڵبژاردنی کە سایەتی و زاناکانی ناو توێژینەوەکەشدا ڕەچاوی چەند خاڵێکمان کردووە، لەوانە ناسراوی هەندێکیان لە سەرچاوە مێژووییەکاندا و هەندێکیش لەوانە سەر بە تیرە و ماڵباتە کوردییە بە ناوبانگەکانی سەدەکانی ناوەراست، یان کەسایەتی بە ناوبانگ و کاربەدەستی ناوچە کوردنشینەکان بوون.

لە گرنگترین ئەو کۆسپانەش کە دەکرێت بێتە بەردەم ئەم توێژینەوەیە و هاوشێوەکانی ئەوەیە، کە ئێمە بە شوێن مێژووی نەتەوەدا ئەگەرێین، لە قۆناغێکی مێژوویدا، کە پەیوەندییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان لەسەر بنەمایەکی تری جیاواز، لە نەتەوە ( بۆ نموونە: کوردبوون) بنیادنراوون. سەردەمێك کە ئایین تێیدا ڕۆڵی سەرەکی بینیوە، لە بازنەیەکی فراوانتردا لە ڕێکخستنی پەیوەندییە سیاسییەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش، تا ڕاددەیەك بە تۆڕی تیرە و هۆزەوە گرێدرابوون. بۆیە دۆزینەوە و دارشتنەوەی مێژووی نەتەوە لەو سیاقە مێژووییەدا پێوستی بە شەنوکەو و لە بێژنگدانە.بەتایبەتی لەهەمبەر دیاریکردن وهەڵبژاردنی کەسایەتییە کوردییەکان لە چوارچێوەی کتێبەکە، یەکێك بوو لەو کۆسپە دیارانەی کە هاتونەتە بەردەمان، هەربۆیە چەند پێوەرێکمان دیاریکردبوو بۆ کوردبوونی ئەو کەسایەتییانە، بۆ نموونە یان لەلایەن نووسەر و سەرچاوەکانی ترەوە لەدوای ناوی کەسەکە ووتراوە کورد بووە، یاخود هۆزێکی کوردی خراوەتە پاڵ کەسەکە، یانیش کەسەکە دەگەرێتەوە بۆ شارێکی کوردی کە زۆرینەی دانیشتوانی شارەکە کوردبوونە، بەومەرجەی لەهیچ سەرچاوەیەك هۆزێکی عەرەبی یاخود ناکوردی نەخرابێتە پاڵ کەسەکە.بۆیە هەوڵمداوە بە پێی توانا

وردکۆڵیم و پێڕەوی ڕێبازی زانستیو بەراوردکاری بکەم، بە تایبەت لە سەلماندنی ڕەچەڵەکی کوردی ئەوانەی لەم توێژینەوەیەدا ناویان هاتووە.

توێژینەوەکەش بەسەر سێ بەشی سەرەکیدا دابەشکراوە، هەربەشێکیش چەند تەوەرەو لقێك لە خۆ دەگرێت، وێرای ئەوەش لە کۆتاییدا ئەنجام وپاشکۆ ولیستی سەرچاوەکانیش خراوەتەڕوو.

بەشی یەکەم: تایبەت کراوە بەباسکردنی لەدایك بوون وپێگەیشتنی نووسەرو پەیرەوی کتێبەکەی، کە لە پێنج تەوەرە پێك هاتووە، لەتەوەرەی یەکەمدا تیشك خراوەتە سەر خودی ژیانی نووسەر، لە ڕووی ناوو نازناوی و ڕەچەڵەکی و لەدایك بوون وپێگەیشتنی زانستی وخانەوادەی و تاوەکو مردنی.

لە تەوەرەی دووەم ئاماژە بە گەشتە زانستییەکانی بۆ شام ومیسرودیارترین مامۆستاکانی کراوە، تەوەرەی سێیەمیش تایبەتە بەو پۆستە کارگێڕی وزانستیانەی کە نووسەر وەریگرتوون، تەوەرەی چوارەم لەبەر ئەو پێگەو ڕۆڵە زانستیەی کە (ابن خلکان) هەیبووە، باس لە بیروڕای مێژوونووسان لەبارەیەوە کراوە، دوا تەوەرەی ئەو بەشە، تایبەت کراوە، بە لێکۆڵینەوە لەسەر کتێبی (وفیات الاعیان) کە تێیدا تیشك خراوەتە ناوی کتێبەکەو پاڵنەری نووسینی کتێبەکەوکات وشوێنی نووسینی ولەگەڵ بەشەکانی وپەیرەوی کتێبەکە وگرنگی وکاریگەری کتێبەکە.

بەشی دووەمیش: لە شەش تەوەرە پێکدێت، لە تەوەرەی یەکەم باسی سەڵتەنەت و فەرمانڕەوایی ومیرە کوردەکانمان کردووە، لەتەوەرەی دووەم، ئاماژەمان بە وەزیرە کوردییەکان کردووە، هەرچی تەوەرەی سێیەمە، تایبەتە بە سەرگوزشتەی دادوەرە کوردەکان، تەوەرەی چوارەمیش، باس لە سەرکردە سەربازییەکان کراوە، تەوەرەی پێنجەم، تایبەتە بە پەردەدارە کوردەکان، لەدوا تەوەرەش، باس لە بەرپرسی قەلا کراوە، جگە لەوەی لەکۆتایی بەشەکە ئاماژەمان بەو ئەنجامانە کردووە، کە لە ئەنجامی

خوێندنــەوە و لێکۆڵینــەوە، لــە نوســینەکانی (ابــن خلكــان) وبــەراود کردنیــان بــە سەرچاوەکانی تر، پێی گەیشتین. بەشێوەیەکی گشتی لەم بەشە تیشك خراوەتـە سـەر ڕۆڵی سەربازی وسیاسی و کارگێڕی کەسایەتییە کوردییەکان.

لە بەشی سێیەم وکۆتاییدا، جەخت کراوەتەوە، لە سەر ڕەهەنـدی شارسـتانیەتی، کە تایبەتە بە ژیننامەی کەسـایەتییە کوردییـەکان و ڕۆڵـی شارسـتانییەتیان لـە بـوارە زانسـتی وهـزری وڕۆشـنبیرییەکاندا، ئـەویش بەسـەر سـێ تـەوەردا دابـەش کـراوە، لەتەوەرەی یەکەم ودووەم باس لەو کەسایەتیە کوردیانـە کـراوە، کـە شـارەزابوونە لـە زانستە نەقلّی و عەقلییەکاندا، کۆتا تەوەرەش تیشـك خراوەتەسـەر ڕۆڵـی کەسـایەتییە کوردییەکان، لە بواری بیناسـازی وئاوەدانکـاری و پـەروەردەیی دا، زیـاتر جـەخت لـەو کەسـایەتیانە کـراوە، کـە ڕۆڵیـان بینیـوە لـە دروسـت کردنـی قوتابخانەوخانـەی فەرمودەوخانـەقاو بیمارسـتان. هـەروەها ئاماژەمـان بەوانەبێـژانی کـورد لەقوتابخانـەو شـوێنە زانسـتییەکاندا کـردووە و لـەکۆتای ئـەم بەشەشـدا، باسمـان لـە شـێوازی هەڵسـەنگاندنی کـە سـایەتییە کوردەکـان کـردووە، لـە لایـەن نووسـەرەوە. دوا بەشـی توێژینەوەکەش تایبەتە بەو ئەنجامگیریانەی کە لە توێژینەوەکەدا پێی گەشتووم.

لە کۆتاییدا هیوادارین لە ڕێی ئەم توێژینەوەیەوە توانیبێتم هـەم خـۆم، لـە مـاوەی ئامادەکردنی توێژینەوەکەدا، پەی بە قەبارەی ئەو بەشدارییە گەورە و گرنگە بەرم، کە کورد لە شارستانییەتی ئیسلامیدا کردوویـەتی و هـەم ئـەم وێنـە گرنگـەم لـە ڕێـی ئـەم توێژینەوەیـەوە گواسـتبێتەوە و تـوانیبێتم بـۆ شـاییەکی بچـووکی لـە دەلاقـەی نوسـینەوەی مێـژووی کـورد پڕکاتـەوە و خزمـەتێك بکـەین بـە پرۆسـەی زانسـت و توێژینەوە. ئەگەرچی دان بەوەدا ئەنێم کە وەك هـەر توێژینەوەیـەکی زانسـتی تـر ئـەم توێژینـەوەش بـێ کـەموکوڕی نییـە، کـە ڕەنگـە هەنـدێك لـە کەموکوڕییـەکان بـەهۆی کورتهێنـانی خۆمـەوە بـووبێ. هـیچ شـتێکیش بـێ کـەم و کـوڕی نییـە، تـەنها خـوای پەروەردگار نەبێ.

# هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکان

لەم توێژینەوەیەدا ژمارەیەکی بەرچاو لە سەرچاوە و ژێدەری هەمە چەشن بەکارهێنراون، لە خوارەوە هەڵوەستە لەسەر گرنگترینیان دەکەین:

**١) سەرچاوەکانی ژیننامەو پێڕەکان (کتب التراجم والطبقات):**

وەك دیارە توێژینەوەکە تایبەتە بە ژیننامەی کەسایەتییە کوردییەکان، بۆیە لە توێژینەوەکە بەپلەی یەکەم پشت بە سەرچاوە ژیننامەکان بەستراوە، لەگرنگترینیان:

کتێبی(قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان)ی(ابن الشعار)(م: ٦٥٤ك/١٢٥٦ز)ە، کتێبێکی ناوازەیە سەرگوزشتەی زۆرێك لەئەدیب وشاعیرانی تیایە لەنێوانیشیاندا لە دوو سەرگوزشتەی تایبەت باسی (ابن خلكان)وئامۆزایەکی کردووە، زانیاری باشی تیابوو دەربارەی ڕەچەڵەکی خەلەکانییەکان.

هەروەها (التكملة لوفيات النقلة)ی (المنذري) (م:٦٥٦ك/١٢٥٨ز)یە، کە سەرچاوەیەکی گرنگ بوو، بۆ ئەم لێکۆلینەوەیە، بەتایبەتی ناوبراو مامۆستای (ابن خلكان) بووە و کتێبەکەی بەشێکی زۆری ئەو زانا موسڵمانانەی لە خۆ گرتووە، کە لەسەدەکانی ناوەراستدا ژیاون. لەنێوانیانیشدا زانیاری دەگمەن و سەرنج ڕاکێشی تیایە دەربارەی خانەوادەی ( ابن خلكان )، بۆیە گرنگییەکی تایبەتی هەبوو، بۆ ئەم توێژینەوەیە، هەروەها لەبەراوردکاری زانیارییەکانی نێوان ( ابن خلكان ) و (المنذري) دا سودی لێبینراوە.

هەروەها سودمان لە کتێبی(تراجم رجال القرنين السادس والسابع)ناسراوە بە ( الذيل على الروضتين ) ی ( ابو شامة )(م:٦٦٥ك/١٢٦٦ز) وەرگرتووە، بەحوکمی ئەوەی ( ابو شامة ) لە شام ژیاوە، ڕووداوەکانی تۆمارکردووە، لەم کتێبە باسی بەرواری دەست بەکاربوونی (ابن خلكان)ی بۆ پۆستی دادوەری دادوەران(قازيقوزات)کردووە، تەنانەت پەیوەندی وناسیاوی لە نێوان (ابن خلكان)و(ابو شامة) هەبووە، هەروەها سودێکی زۆرمان لە (عيون الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية) کتێبی

دووەمی (ابو شامة)وەرگرتووە کە گەلێك زانیاری گرنگی سەبارەت بە ئەیوبیەکان تێدایە .بە جۆرێك ناکرێت مێژوونووس باسی ئەیوبیەکان بکات بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەم پەرتووکە، بۆیە بۆ پشتراستکردنەوەی زانیارییەکان پشتی پێبەستراوە.هەروەها سودێکی باشمان لەکتێبی (الوافي بالوفيات )ی(الصفدي)(م:٧٦٤ك/١٣٦٣ن) وەرگرتووە، کە ژیننامەو سەربوردەی زۆر لە زانایان وناودارانی لە تەواوی بوارەکان لە خۆ گرتووە. بەشێك لەزانیاریەکانی لە (ابن خلكان) وەرگرتووە، بۆیە زۆرجار بۆ دووپات کردنەوەی زانیاریەکان، کەلکمان لێوەرگرتووە. هەروەها سودمان لە کتێبێکی تری (الصفدی)، ( أعيان العصر وأعوان النصر) وەرگرتووە.

کتێبی (فوات الوفيات)ی (الکتبی)(م:٧٦٤ك/١٣٦٣ن) سەرچاوەیەکی گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیە بوو. زیاتر لەمەڕ ژیانی نووسەر تیشکی خراوەتە سەری.هەروەهاکتێبی (شفاء القلوب في مناقب بني ايوب) ی مێژوونووس(الحنبلی)(م:٨٧٦ك/١٤٧١ن) بەشێوەی پەرتووکی ژیننامە باسی کەسایەتیەکانی کردووە، جگە لەمە لەزانیارییەکان پشتمان بەچەندین سەرچاوەی تری ژیننامەو چینەکان بەستووە، لەوانەش هەردوودانراوی (الوفيات)و(المقتفي)ی( البرزالي)(م:٧٣٩ك/١٣٣٨ن)کە هەندێك زانیاری گرنگی دەربارەی خانەوادەی نووسەری تێدایە.

هەروەها هەردوو کتێبی (طبقات الشافعية)ی (الاسنوي)(م: ٧٧٢ك/١٣٧٠ن)و(طبقات الشافعية )ی(ابن قاضي شهبة)(م:٨٥١ك/١٤٤٧ن) لەپێشەوەی سەرچاوەی چینەکان دێت، کەبۆ فراوانکردنی زانیاری لەسەر شەرعناسە کوردییەکان سودیان لێ وەرگیراوە.جگە لەوەی زۆر شوێن تیشك خراوەتە سەر کتێبی (طبقات الشافعيين)ی(ابن کثیر) (م:٧٧٤ك/١٣٧٢ن).

**٢) سەرچاوەکانی مێژوویيە گشتیەکان (کتب التواريخ العامة):**

ئەم جۆرە سەرچاوانە لەناوەکەیانەوە دیارە، کە زانیاری مێژووی گشتی تێدایە، ئەم سەرچاوە مێژوویانەش بێبەش نین لەناساندنەکانی ناودارانی جیهانی ئیسلامیدا، لەنێوانیانیشدا کورد، بۆیە سەرچاوەی گرنگ بوون بۆ توێژینەوەیەکە:

لە گرنگترین ئەو سەرچاوە مێژووییانەش کە لەم توێژینەوەیەدا سودمان لێوەرگرتووە (الكامل في التاريخ)ی (ابن الاثير)(م٦٣٠ك/١٢٣٢ز)ە، کە سەرچاوەیەکی سەرەکی وبنچینەییە بۆ لێکۆلینەوەی مێژووی کورد، لەماوەی دەولەتی عەباسیدا، تەنانەت (ابن خلكان) لەژیننامەی فەرمانڕەوایانی ئەیوبییدا زۆر جەختی لەسەر ئەم سەرچاوەیە کردۆتەوە، بۆیە لە بەراوردکردن و پشتڕاستکردنەوەی زانیارییەکاندا سودی لێبینراوە. ئەمە سەرەڕای کتێبی( تاريخ الباهر في الدولة الاتابكية)ی ( ابن الاثير) کە تیشکی خستۆتە سەر ئەیوبیەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتی زەنکیەکاندا، جگە لەوەی سود لەکتێبی(أسد الغابة)شی وەرگیراوە.هەروەها سودێکی زۆرمان لە کتێبی(ذيل مرآة الزمان)ی(اليونيني)(م:٧٢٦ك/١٣٢٦ز)لەبواری ژیاننووسەردا بینیووە، تەنانەت (اليونيني)یەکێك بوو، لەهاوڕێیەکانی (ابن خلكان)بۆیە کتێبەکەی زانیاری ناوازەی تیایە دەربارەی خودی (ابن خلكان). هەروەها لە زۆر شوێن تیشکخراوەتە سەر زانیاریەکانی کتێبی(النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية )ی(ابن شداد)(م:٦٣٢ك/١٢٣٤ز) جگە لەبەراوردکاری زانیارییەکان لەگەڵ (ابن خلكان)، بۆفراوان کردنی زانیاریەکانی سودی لێوەرگیراوە.

هەروەها سودمان لە چەند کتێبێکی (الذهبي)(م:٧٤٨ك/١٣٤٧ز) وەرگرتووە، لە دیارترینیان(تاريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام)ە، کە نووسەر لەم کتێبەدا لە تۆمارکردنی ڕووداوە مێژووییەکان شێوازی (حولی) واتە بەپێی ساڵ لەدوای ساڵ ڕووداوەکانی تۆمارکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەمیانەی خستنە ڕووی، ڕووداوەکاندا زۆر لە کەسایەتیە ناودارەکانی ناساندووە وبەشێکی زۆری کتێبەکەی بۆ ئەم بوارە تەرخان کردووە، لەگەڵ ئەوەی بەیەکێك لەو نووسەرانە دادەنرێت، کە لە نووسینەکانیدا زۆر

وردبـین بـووه.(الـذهبي) بەشـێكی زۆر لەزانیارییەكانیـدا لەسـەر سەرگوزشـتەی زانـا كوردەكان پشتی بە (وفیات الاعیان)بەستووەو بـەكاری هێنـاون، بۆیـە ئێمـە بـۆ پشـت راست كردنـەوەو ناسینی زیـاتری زانایـانی كـورد پشـتمان بـەم سەرچـاوە بەسـتووە، چـونكە لـەدایك بـوون وپێگەیشـتنی ومردنـی بەشـێكی زۆر لەزاناكوردییـەكان ئامـاژە پێداوە. جگە لەم سەرچاوە هەریەكە لەكتێبەكانی(سیر اعلام النبلاء)و(العـبر في خـبر مـن غبر)و( المعین في طبقات المحدثین)سودی لێبینراوە.

هەروەها بۆ دڵنیابوون لە سود بینین وگواستنەوەكانی(ابن خلكان) تەماشای چەند سەرچاوەیەكی تری مێژوویی كراوە، كەهەریەكەیان بەگوێرەی تایبەتمەندییەكەی خۆی سودمان لێوەرگرتن، لە گرنگترین ئەو دانراوانـەش: (تـاریخ الفـارقی)ی مێـژوونوس(ابـن الازرق الفارقی)(م.دوای: ٥٧٧ك/١١٨١ن)، (الفتح القسی فی الفتح القدسی)و(البرق الشامی) كە دوودانراوی(عماد الدین الكاتب الاصفهانی)(م:٥٩٧ك/١٢٠١ن)ن.

هـــەروەها (مفـــرج الكـــروب فی اخبـــار بنـــی ایـــوب)ی مێـــژوونووس (ابـــن واصـــل)(م:٦٩٧ك/١٢٩٧ن) دانراوێكـــی تـــرە، كـــە تایبەتـــە بـــە ئەیوبیـــەكان و بـــەپێی گرنگیەكەیان سودی لێوەرگیراوە.هەروەها سودمان لە كۆمـەلێك سەرچـاوەی مێـژوویی تر وەرگرتووە .

**٣) كتێبـەكانی مێژووی شارو ئینسكلۆپیدییەكان( تـواریخ المـدن والمصـادر الموسوعیة):**

هـــەر لـــەم بـــوارەدا ســـودێكی باشمـــان لـــە كتێبـــی (تـــاریخ اربـــل)ی (ابـــن المستوفی)(م:٦٣٧ك/١٢٣٩ن) وەرگرتووە، كە ژیننامـەو سـەربوردەی زۆرێـك لـە زانایـان وناودارانی موسڵمانانی لـە تـەواوی بـوارە جیاجیاكـانی تیایە، تەنانـەت (ابـن خلكـان) بەشێك لە زانیارییەكانی لە(ابن المستوفی) وەرگرتووە، بۆیـە زۆرجـار بـۆ سەرگوزشـتەی كەسایەتیەكانی نێو كتێبی (ابن خلكان) گەڕاوینەتەوە بۆ كتێبی (تاریخ اربل) و سودمان

لەبەراوردکاری وفراوانی زانیارییەکان وەرگرتووە، جگە لەوەی زانیاری باشی تێدایە دەربارەی خانەوادەی خەلەکانیەکان..

دواتر سود لە کتێبی (تاریخ دمشق)ی(ابن العساکر)(م:٥٧١ك/١١٧٦ز)ی بینیووە، (ابن خلکان) بەشێك لە زانیارییەکانی پشتی بەم سەرچاوەیە بەستووە، بۆیە بۆ پشتراستکردنەوەو بەراودکاری زانیارییەکان تیشکمان خستۆتە سەرئەم سەرچاوەیە.هەروەها کتێبی(زبدة الحلب في تاريخ حلب)ی(ابن العديم)(م:٦٦٠ك/١٢٦١ز) بۆفراوان کردنی زانیاریەکانی سودی لێوەرگیراوە.

یەکێکی تر لەو سەرچاوانە (صبح الاعشى فى صناعه الانشا)ی (القلشندي)(م:٨٢٠ك/١٤١٧ز)یە کەبەیەکێك لە گرنگترین مەوسوعەکانی ئیسلامی هەژمار دەکرێت، ئەم کتێبەی زانیاری هەمە جۆری لە خۆ گرتووە، کە زۆربەی زانیاریەکانی زیاتر لایەنی شارستانین، لەگەڵ ئەوەی ناوبراو بەشێك لە زانیاریەکانی لە (ابن خلکان) وەرگرتووە، بەڵام لەهەمان کاتدا زانیاری نوێی هێناوەتە ناو نووسینەکانی، بۆیە لە ناساندنی پۆستە کارگێرییەکاندا سودی لێ وەرگیراوە.جگە لەوەی سودێکی باشمان لەزانیاریەکانی کتێبی (الدارس في تاريخ المدارس)ی(النعيمى)(م:٩٢٧ك/١٥٢٠ز) لەبواری شارستانی بەتایبەت قوتابخانەکان وەرگرتووە.

## ٤) سەرچاوەکانی مێژووی ئەدەب وشاعیرەکان :

لەدیاترین ئەو سەرچاوانەی کەلەم بوارە سودی لێبینراوە، هەریەکە لە کتێبی(معجم الأدباء)ی (ياقوت الحموي)(م:٦٢٦ك/١٢٢٩ز)و(نهاية الأرب في فنون الأدب)ی(النويري)(م:٧٣٣ك/١٣٣٣ز)بووە، دواتر سودمان لەکتێبی(خريدة القصر وجريدة العصر)( عماد الدين الكاتب الأصبهاني)(م: ٥٩٧ك/١٢٠٠ز) بینیوە، تەنانەت (ابن خلکان)یش ئەم سەرچاوەیەی بەکارهێناوە، زانیاری بەسودی تیایە دەربارەی شاعیرەکانی بنەماڵەی ئەیوبی.

**٥) کتێبی گەریدەو وڵاتناسان (کتب الرحالة والبلدانيين):**

گەریدەو وڵاتناسەکانی ئیسلامی لەسەدەکانی ناوەراست دا رۆڵێکی گرنگیان بینیووە، لە ناساندن ودیاری کردنی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی، ناوچە کوردییەکانیش بەشێك بوون لەو نەخشە وباسکردنەدا، بۆیە سودمان لەچەند دانراوێکی گەریدەو شارناسەکان وەرگرتووەبۆ ناسینی ئەو شوێن وناوچانەی کەلە لێکۆڵینەوەکەدا ئاماژەیان بۆ کراوە و پێویستیان بە پێناسەکردن هەبووە، لەو دانراوانەش کتێبی (معجم البلدان)ی(یاقوت الحموی)(م:٦٢٦ك/١٢٢٩ن) کەلەبەر گشتگیری ووردی لەباسکردنی شوێنەکان، بەشێوەیەکی سەرەکی پشتمان بەزانیاریەکانی بەستووە.هەروەها (نزهە المشتاق فی اختارق الافاق)ی(الادریسی)(م:٥٦٠ك/١١٦٥ن) و (رحلة ابن جبیر)ی(ابن جبیر)(م:٦١٤ك/١٢١٧ن) و(مسالك الابصار في ممالك الأمصار)ی(العمري)(م:٧٤٩ك/١٣٤٩ن) و لەگەڵ چەندین کتێبی گەریدەناسانی تربۆ زانیاری وناساندنی هەندێك شوێن ئاماژەیان بۆ کراوە.

**٦) ژێدەرە عەرەبی و کوردییەکان(المراجع):**

لە نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا سود لە گەلێك ژێدەری گرنگ بەزمانی کوردی وعەرەبی وەرگیراوە، لێرەدا ئاماژە بەهەندێکیان دەکەین، وەك کتێبی (تاريخ الادب العربي) دانراوی رۆژهەلاتناس (کارل برۆکلمان) کەتایبەتە بە دانراوەکانی نووسەرانی موسڵمان لە رێزی دانراوەکانی ژیننامەکاندا ئاماژەی بۆ کتێبی(وفیات الاعیان) کردووەو سەرنج وبیرو رای خۆی سەبارەت بەم کتێبە ودانرەکەی خستۆتە رو، هەروەها سودێکی زۆرمان لەهەریەکە لەنامەی ماستەری (خلیل ابراهیم جاسم)ی( منهج ابن خلكان في وفیات الاعیان)و ((منهج البحث عند ابن خلكان)ی (فخرالدین محمد یوسف)و کتێبی (حیاة ابن خلكان)ی(زبیر بلال)و کتێبی (چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورد)ی

(محسن محمد حسين) وەرگرتووە، کەلەم سەرچاوانەدا تیشك خراوەتە سەر ژیانی (ابن خلكان) وبنەماڵەکەی وپەیرەوی کتێبەکەی.

هەروەها بۆ دووپاتکردنەوەی زانیارییەکان سەبارەت بە کەسایەتیە ناودارە کوردییەکانی نێو کتێبەکەی (وفیات) پشتمان بەهەریەکە لە کتێبی(الاعلام)ی دانراوی(خير الدين الزركلي)و(معجم المؤلفين)ی(عمر ابن كحالة)و(خطط الشام)ی(محمد كرد علي)و(اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية)ی (قادر محمد حسن)و( مشاهير الكرد وكردستان)ی(محمد امين زكي) هتد وەرگرتووە.

# بەشی یەکەم / ژیاننامەی ( ابن خلکان ):

**تەوەرەی یەکەم: ژیانی :**

**تەوەرەی دووەم :گەشتەکانی بۆ شام ومیسر:**

**تەوەرەی سێیەم: پۆستە کارگێری و زانستیەکان:**

**تەوەرەی چوارەم: بیروڕای مێژوونوسان لەبارەی( ابن خلکان ):**

**تەوەرەی پێنجەم: لێکۆلینەوە لەسەر کتێبی ( وفیات الاعیان ):**

# بەشی یەکەم : ژياننامەی (ابن خلكان) :

## تەوەرەی یەکەم: ژیانی :

### یەکەم : ناوو نازناوی و ڕەچەڵەکی :

ناوی تەواوی( شمس الدين أبو العباس أحمد بن محمد بن إبراهيم بن أبي بكر بن خلكان[١]، بائك بن عبدالله بن شاكل بن الحسين بن مالك[٢]، بن جعفر بن يحيى بن خالد بن برمك البرمكي[٣]، الاربلي[٤]،

---

(١)ابن الشعار، قلائد الجمان في فرائد شعراء هذا الزمان، تحقيق: كامل سلمان الجبوري، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٥م) ج١، ص٣٤٥؛ابن خلكان، وفيات الاعيان وأنباء أبناء الزمان، تحقيق: إحسان عباس، (بيروت: ١٩٩٤)،ج١، ص٤؛الذهبي، العبرفي خبر من غبر، تحقيق: ابوهاجر محمد السعيد، دار الكتب العلمية، بيروت، ج٣، ص٣٤٧؛العمري، مسالك الابصار في ممالك الأمصار، تحقيق: كامل سلمان الجبوري، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠١٠م) ج٦، ص٢١٩؛ابن كثير، البداية والنهاية، تحقيق: علي شيري، دار إحياء التراث العربي، (بيروت: ١٩٨٨م)،ج١٣، ص٣٥٢.

(٢) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٥؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، دار الكتب، مصر، ج٧، ص٣٥٤؛كحالة، معجم المؤلفين، دار إحياء التراث العربي،بيروت، ج٢، ص٩.سەبارەت بەناوی (بائك) لەسەرچاوەكان بەشێوازی جیاواز نووسراوە هەروەكو (ابن خلكان: وفيات الاعيان) بە (بائك) ئامـاژەی پێكردووە، بەلام (ابن الشعار: قلائدالجمان) بە (ياوك) هێناويەتی، هەروەها (ابن تغري بردي: النجوم الزاهرة) بە (باول) باسی كردووە، هەروەها ابن الزبيدى دەڵێت: (وبائِك: جد القاضي شمس الدين بن خِلِّكان، ضبطه مَنْصوربن مسلم هكذا) ) (تاج العروس، تحقيق: مجموعة المحققين، دار الهداية، ج٢٧، ص٨٩.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٩، ص٤٤ المقريزي، المقفى الكبير،، تحقيق: محمد اليعلاوى، دار الغرب الاسلامي، (بيروت: ١٩٩١) ج١، ص ٦١٥ ؛ ابن تغرى بردي، النجوم الزاهرة، ج٧، ص٣٥٤؛ احمد محمود خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، دار الساقي، (بيروت: ٢٠١٣)،ص٣٥٧.

(٤) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٥ ؛الذهبي، العبر، ج٣، ص٣٤٧؛ العمري، مسالك الابصار، ج٦، ص٢١٩؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٠٠؛ كارل بروكلمان، ماددة (ابن خلكان)،دائرة المعارف الاسلامي، ت: ابراهيم زكي واخرون، الشعب، قاهرة، ج١، ص٢٧٥.

الدمشقي[١]، الشافعي[٢].

ناوبراو لە ماوەی ژیانیدا، کۆمەڵێك نازناوی هەبووە، وەکو (شمس الدین )[٣]، هەروەها لە زۆر لە سەرچاوەکاندا بە ( قاضي القضاة شمس الدين ابن خلكان ) ناسراوە[٤]، ئەمەش دوای ئەوەی لەلایەن ( الظاهر بيبرس )[٥]ە

---

(١) المقريزي، المقفى الكبير، ج١، ص٦١٥؛ابن الغزي، ديوان الإسلام، تحقيق: سيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٠)،ج٢، ص٢٤٢.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١؛ابن تغري بردي، المنهل الصافي والمستوفى بعد الوافي، تحقيق: محمد محمد أمين، الهيئة المصرية العامة للكتاب، قاهرة، ج٢، ص٨٩.هەروەها (الخوانساري) به (الاشعري)ناوی دەبات .روضات الجنات، المطبعة الحيدرية، (طهران: ١٣٩٠)،، ج١، ص٢٠؛ حسام الدين النقشبندي، ما طبع من مخطوطات مصادر التاريخ الاسلامي والمؤلفة بين القرنين الثاني والثاني عشر الهجريين، دار ومكتبة البصائر، (بيروت: ٢٠١٤)،ص١١٦.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١؛ الاسنوي، طبقات الشافعية، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٨٧ز)،ج١، ص ٢٣٨، هەروەها به (شمس الدين أبو العباس) هاتووه. (وفيات الاعيان / ابن خلكان، ج١، ص١).

(٤) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، دار الكتاب الإسلامي، (قاهرة: ١٩٩٢)،ج١، ص١٤٤؛الدواداري، كنزالدرر وجامع الغرر، تحقيق: اونرخ هارمان، (القاهرة: ١٩٧١)،ج٨، ص١٠٨؛العمري، مسالك الابصار، ج٦، ص٢١٩؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٠٠.

(٥) الظاهر بيبرس: بيبرس بن عبد الله، ركن الدين أبو الفتح الصالحي، لەسالی (٦٢٥ك/١٢٢٨ز) لە قەبجاق لەدایك بووە، لەگەڵ مەلیك(قطز) دا جەنگا لەدژی تەتەرەکان لە جەنگی عین جالوت (٦٥٨ك/١٢٦٠ز)،پاشان هەرلەوێ مەلیك(قطز) دەکوژێت ودەبێتە سولتانی میسرو شام، نازناوی (ملك ظاهر) وەردەگرێت لە سالی (٦٧٦ك/ ١٢٧٧ز) لە دیمەشق کۆچی دوای دەکات، الكتبي، فوات الوفيات،تحقيق:إحسان عباس (بيروت:١٩٧٣) ج١، ص٢٣٥؛خير الدين الزركلي، الاعلام، دار العلم للملايين، (بيروت: ٢٠٠٢م) ج٢، ص٧٢.

وه له ساڵی (٦٥٩ك/١٢٦٠ز) ەوه كرا به (قاضي القضاة )ی ولاَتی شام[١]،

جگە لەوەی بە ( البرمكي الاربلي الشافعي) ناسراوه[٢]، هەروەها بە ( الشيخ المقتدى الامام والعلم العلام قاضي القضاة وزين الحكم شمس الدين ابو العباس )یش ناسراوه[٣]، بەڵام له زۆربەی سەرچاوەكان زیاتر بە كونیەی ( ابن خلكان ) ناوبانگی دەركردووه[٤].

---

(١) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص١٢٤؛الاسنوي، طبقات الشافعية، ج١، ص٢٣٩.جگە لەوەی بە (قاضي شمس الدين ابن خلكان) یش ناسراوه، الفاسي، ذيل التقييد في رواة السنن والاسانيد، تحقيق: كمال يوسف، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٠)،ج٢، ص٣١.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص٤؛ الذهبي، تاريخ الإسلام ووفيات المشاهير والأعلام، تحقيق: بشار عواد معروف، دار الغرب الإسلامي،(بيروت: ٢٠٠٣) ج١٥، ص٤٤٤.

(٣) الخوانساري، روضات الجنات، ج١، ص٢٠.تاكە سەرچاوەیە ناوەكەی بەم شێوەیەی هێناوه.(توێژەر)

(٤) أبو الفداء،المختصر في أخبار البشر، المطبعة الحسينية،مصر، ج٢، ص٤٩؛ الذهبي، تاريخ الإسلام، ج٢، ص٩٣٠؛ ابن الوردي،تاريخ ابن الوردي، دار الكتب العلمية (بيروت: ١٩٩٦)،ج١، ص١٣٧؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، خليل المنصور، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٧) ج١، ص٧؛ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، تحقيق: خليل شحادة، دار الفكر، (بيروت: ١٩٨٨) ج٥، ص٢٨٥؛السيوطي، تاريخ الخلفاء، تحقيق: حمدي الدمرداش، مكتبة نزار(الرياض: ٢٠٠٤م)،ص١٠، سەبارەت بەجۆنیەتی خوێندنەوەو نوسینی وشەی (ابن خلكان) لەسەرچاوەكان بەشیوەی جیاواز نوسراوه، هەروەكو(ابن خلكان) بەفەتحە لەسەر پیتی خاو، شەدەی كەسرە لەسەر پیتی لامەكەو، بەسكون لەسەر پیتی نون هێناویەتی، (ابن خلكان /وفيات الاعيان)،ج١، ص١، هەروەها (خوانساری) بەم شیوەیە زەبتی ووشەكەی كردووه دەڵیت ((ابن خلكان_ بفتح الخاء المعجمة وتشديد الام المكسورة. او بضم الخاءوفتح الام المشددة كما اسند الى المشهور. اوبكسر الخاء والام جميعا كما قد يوجد في بعض الكتب) ) (روضات الجنات، ج١، ص١١٣).

بۆ چونی جیاواز بەدی دەکرێ، لە نیوان مێـژوو نووسـان، لەسـەر نـاوی (خلكـان)، هەندێك لە مێژوو نووسان پێان وایە، گوایە (ابن خلكان) زۆر جـار شـانازی و پێهەڵـدانی کردووە ، بە باب و باپیران و ڕەچەڵەکی خۆیەوە، خەڵکیش پێان وتووە (خل كان) واتـە واز لە خۆهەڵکێشان بە باب وباپیران و ڕەچەڵەکەوە بێنە، دواتریش (خل كان) بووە بە نازناوێك و بەسەریدا بڕاوە[1]،

بەڵام هەندێکی تر دەڵێن (خلكان) ناوی گوندێکە سەر بەهەولێرە[2]، مێژوو نووسی هەولێر (ابن المستوفی:٦٣٧ك/١٢٣٩ز) ش ئەو بۆچوونە پشتڕاست دەکاتـەوە، کاتێـك باسی دوو ئەندامی ماڵباتی خەلەکان (عمر ابن خلكان ) و (حسين ابن خلكـان )دەکـات، کە دەبنـە مـامی (ابـن خلكـان) دەڵێـت: ئەمانـە خـەڵکی گونـدی (خەلـەکان)ن،[3] ئـەم

---

([1])ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، تحقيق: محمـود الأرنـاؤوط، دار ابـن كـثير (بيروت: ١٩٨٦) مج١٠، ص٤٧؛العيدروسـي، النـور السـافر عـن أخبـار القـرن العاشـر، دار الكتـب العلمية (بيروت:١٤٠٥) ص٣٤٧؛الخوانساری، روضات الجنات، ج١، ص٢٠.

([2]) الاسنوي، طبقات الشافعية، ج١، ص٤٩٥.

(٣)گوندی خەلەکان: سەبارەت بەجوگرافیای ئەم گوندە بۆجوونی جیاواز هەیە:

أ) دوو گوند بەم ناوە هەیە یەکـەمیان دەکەوێتـە قـەزای ڕانیـە، نزیکـەی سـێ کاتـژمێر لـە گونـدی (چناران) دوورە، دووەمیـان دەکەوێتـە قـەزای ڕەوانـدز لەکـەنار گـەلی عـەلی بـەگ بـەلام هـیچ شـوێنەوارێکی دیـار نـەماوە، وادەردەکـەوێ قـازی شمـس الـدين وبراکـەی خـەلکی ئـەم گوندەبن.محمد امين زكي، مشـاهير الكـرد وكردسـتان، ت: سـانحة زكـي بـك، ط٢، دار الزمـان (دمشق: ٢٠٠٦) ج١، ص٧٥.

ب) گونـدی خەلـەکان دەکەوێتـە بەشـی ڕۆژئـاوای دۆکـان لەسـەر دۆلی مەشـجەر، کەوتۆتـە نێـوان زنجیرە چیاکانی نێوان کوسرات و هەیبەت سولتان. (پێمان وایە مەبەستی ناحیەی خەلـەکانی ئێستایتی کەدەکەوێتە نێوان دووکان و کۆیی) (زبـير بـلال، حيـاة ابـن خلكـان، مطبعـة الامـة، (بغداد: ١٩٧٩م)،ص١٨.بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە پاشکۆی وێنەی ژمارە (٥).

ج) ئەم گوندە دەکەوێتـە ڕۆژهـەلاتی قـەزای ڕەوانـدزو بـاکوری هاوینـە هـەواری جونـدیان، لەسـەر ڕووباری ڕەواندز کە لقێکە لە زێی گـەورە، (بـەهار عبـاس جبرائيـل، کـوردە زرزارییـەکان ڕۆلی

گونـدەش بـەناوى ( خەلـەكان )ى بـاپيرە گەورەيانـەوە نـاونراوە[١]. هـەروەها ميـژوو نوسيكى تر دەلَيت: ((خِلّكان: الجد الرابـع للقاضـي شمـس الـدين احمـد بـن محمـد بـن ابراهيم بن ابي بكر بن خلكان)[٢].

---

راميـارى وشارسـتانييان لەهـەردوو سـەدەى شەشـەم وحەوتـەمى كـۆجى، ماسـتەرنامەى بلاونەكراوە، پێشكەش بە كۆليـژى زانسـتە كۆمەلايەتييـەكان، زانكـۆى كـۆيى كـراوە (كـۆيى: ٢٠١٠) ل١١. هـەروەها دەگوترێـت (خـەليكان) گـۆرانى بەسـەر هـاتووە تادواجـار بۆتـە (خەللەكان)،جابەوبۆنەوە كە شەهابەدين وباقى بنەمالەى مى ئەم گوندەن، بە (ابناء خلكـان) ناسـراون، وردە وردە كـەنازناوى (ابـن خلكـان) براوتـە سـەر قـازى شمسـەدين، ميژوونوسـى بەناوبانگەوە، كەكورى شەهابەدينيە.بابە شێخى مـەردۆخ رۆحـانى، ميـژووى نـاودارانى كـورد، وەرگێرانــى: ماجـدى مــەردۆخ رۆحــانى، ئـەكاديمياى كـوردى، (هــەولێر: ٢٠١١م) ب١، ل ل٧٣_٧٤.

(١)تاريخ اربل، تحقيق: سامي بن سيد خماس الصقار، دار الرشيد للنشر(العـراق: ١٩٨٠م) ج١، ص ص٢٨٣، ٣٣٢.زۆر لە بۆچوونەكان پێيان وايە خەلكى ناحيەى خەلكانى سەر بەقەزاى دوكانـە، ئێمەش لەگەل ئەم بۆچونەداين.

(٢) الزبيدى، تاج العروس، ج٢٧، ص١٢٦.

بەشێك لە مێژوونوسان کۆ دەنگن، لەسەر گەڕاندنەوەی ڕەچەڵەکی (ابن خلکان) بۆ سەر (بەرمەکی)[1] یەکان[2]. تەنانەت (کمال الدین موسی) ی کوڕی (ابن خلکان) دەڵێت: باوکم پێی ڕاگەیاندوم، کە ڕەچەڵەکمان دەگەڕێتەوە بۆ هۆزێکی کوردی ناسراو، کە هۆزی زەرزارییە[3]. هەروەها پێی تووم:((وأن أباه وأمه أصلها من مدينة

---

(1) بەرمەکیەکان: بنەماڵەیەکی ناوداری فارسن، ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆباپیرەیان (برمك) کەچاودێری پەرستگای (النوبهار) ی دەکردلە شاری بلخ لەخوراسان، لای فارسەکان پیرۆز بووە، ئەم بنەماڵەیە لەسەردەمی عەباسیەکان ناوداربوونەو بەتایبەتی لەسەردەمی خەلیفە هارونە رەشید(١٧٠_١٩٣ك/٧٨٦_٨٠٩ن)،پۆستی بالایان وەرگرتووە وەکو وەرزیرو کاربەدەست و هتد بەلام لەکۆتای دەسەلاتی خلیفە هارون لەسالی (١٧٨ك/٧٩٤ن) لەناوبردران، کەلە مێژوودا بە(نكبة البرامكة) ناسراوە. الطبري، تاريخ الرسل والملوك،ط٢، دار التراث (بيروت: ١٣٨٧) ج٨، ص ص٢٨٨_٣٠٠ ؛ المسعودي، التنبيه والإشراف، تصحيح: عبد الله إسماعيل الصاوي، دار الصاوي،القاهرة، ص٢٩٩ ؛المقدسي، البدء والتاريخ، مكتبة الثقافة الدينية، بور سعيد، ج٦، ص١٠٤ ؛مسكويه، تجارب الأمم وتعاقب الهمم،ط٢، سروش، (طهران: ٢٠٠٠م)،ج٣، ص٥٣٧؛القلقشندي، قلائد الجمان في التعريف بقبائل عرب الزمان، تحقيق: إبراهيم الإبياري، دار الكتب اللبناني، (بيروت: ١٩٨٢م)،ص٧٤؛بەهار عباس جبرائيل، کوردە زرزارییەکان ڕۆڵی رامیاری وشارستانییان لەهەردوو سەدەی شەشەم وحەوتەمی کۆچی، ل١١.

(2) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص١٤٩؛أبو الفداء،المختصر في أخبار البشر، ج٤، ص١٦؛ الذهبي، المعين في طبقات المحدثين، تحقيق: همام عبد الرحيم سعيد، دار الفرقان(عمان: ١٤١٤)،ص٢١٧؛ ابن الوردي،تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص٢٢٣؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، تحقيق: محمود محمد الطناحي و عبد الفتاح محمد، ط٢، دار هجر، (مصر: ١٤١٣)،ج٨، ص٣٢.

(3) زەرزارییەکان، هۆزێکی دێرینی کوردن، زۆربەی سەرچاوە مێژوویەکان ئەوانەی لەسەر هۆزی زەرزاری ئاخافتون هەر بەکورد دایانناون، تەنانەت زۆر لەمیرو کەسایەتیەکانی کورد لەمێژووی ئیسلامی دەگەڕێنەوە بۆ ئەم هۆزە، کەلەناو جەرگەی خاکی کوردستان لەناوچەیەکی شاخاوی سەخت وناستەنگ جێنشین بوون، لەبارەی چەمك وواتای ووشەی زەرزاری تەنها (العمری) لێکی داوەتەوە وای دەبینی وشەی زەرزاری وشەیەکی عەجەمیەویەمانای (ولد الذئب)

(بلخ)[1] إحدى كراسي خراسان، وذلك أن أباه هو محمد بن إبراهيم بن أبي بكر بن خلكان بائك بن عبد الله بن الحسين ابن مالك بن جعفر بن يحيى بن خالد بن برمك (البرمكي)، وبرمك وبيته من أهل(بلخ).[2]

لێرەدا نازانرێت بۆچی( ابن خلكان ) ڕەچەڵەکی کورد لەگەڵ ( بەرمەکی )ەکان بەیەکەوە کۆدەکاتەوە، زانراویشە ( بەرمەکی )ەکان فارسن، کە وابێ بە بۆچونی (ابن خلكان) لەسەر زاری کورەکەی، کورد دەگەڕێتەوە بۆ ئەسلی فارس، تەنانەت (العمري م:٧٤٩ك/١٣٤٩ن) ئاخافتنێکی گواستۆتەوە، کە ڕەچەڵەکی ئەم هۆزە دەگەڕێنێتەوە سەر عەجەم، کە مەبەستی فارسە و دەڵێت:زەرزارییەکان لەو عەجەمانەن، کە بنەچەیان دەگەڕێتەوە سەر پادشاکانیان دوایی بوون بەکورد[3].

وا دیارە (العمري) لە ژێر کاریگەری ڕای قازی (شمس الدين احمد بن خلكان)بووە؟، کە یەکێکە لە ئەندامانی ئەم هۆزە و زیاتر لە شەست ساڵ پێش (العمري)، کۆچی دوایی کردووە. هەر وەکو ئاماژەمان پێکرد، لەسەر زاری کوڕەکەی، بنەچەی بنەماڵەکەیانی گەڕاندۆتەوە سەر (بەرمەکی)ەکان، گوایە، بەڕەسەن خەڵکی

---

دەگەینێت. ابن الأثير،الكامل في التاريخ، تحقيق: عمر عبد السلام تدمري، دار الكتاب العربي، (بيروت:١٩٩٧م) ج٩، ص٤٦٦؛ ابن العديم،زبدة الحلب في تاريخ حلب، وضع حواشيه: خليل المنصور، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٦م) ص٣٨٩ ؛ العمري، مسالك الابصار، ج٣، ص٢٠٢.

(1) بلخ: لە بەناوبانگترین شارەکانی هەرێمی خوراسانە، پەرستگای (النوبهار) ی لێبووە، دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی هەرێمی فارس لەسەر رووباری (جيحون).اليعقوبي، البلدان، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٤٢٢ هـ)، ص ص ١١٦_١١٧؛ياقوت الحموي، معجم البلدان،ط٢، دار صادر،(بيروت: ١٩٩٥)، ، ج١، ٥، ص ص٤٧٩، ٣٠٧.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ترجمة المؤلف بقلم ابنه موسى، ج٤، ص٩.

(3) مسالك الابصار، ج٣، ص٢٠٢.

(بلخ)، و لە دایك بووی (اربل)ە[1]. هەروەها یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە (ابـن خلکـان) بە ( بەرمەکی ) دادەنرێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەیوەندییە باش و دۆستانەیەی کە لـە نێوان (ابن خلکان) و (احمد بن حجی )[2] هەبووە، کە ناو براو (بەرمەکی) بووە بە (ابـن خلکان)ی دەووت :((انت ابن عمي))[3].

سەرەڕای ئەو گێڕانەوانەی کە ڕەچەڵەکی (ابن خلکان) دەبەنەوە سەر فارسـەکان، گـرنگترین بەڵگـەکان ئـەوە دەسـەلمێنن کـە (ابـن خلکـان) بـە ڕەچـەڵەك کـوردە و نـا گەڕێتەوە سـەر( بەرمـەکی )یـەکان . دەتـوانین ئـەوەش بەچـەند بەڵگەیـەکی واقیعـی و مێژوویی پشت ڕاست بکەینەوە و بسەلمێنین و ساغی بکەینەوە، وەك چۆن بـەم چـەند خاڵەی خوارەوە ڕوونمان کردووەتەوە:

١) ( ابن خلکان ) لە پێشەکی کتێبەکەیدا، خۆی دەناسێنێت و ناوی خـۆی وبـاب و باپیرانی دەهێنێت، بـەبێ ئـەوەی ڕەچـەڵەکی خـۆی بگەڕێنێتـەوە بـۆ سـەر ( بەرمـەکی )ەکان و دەڵێت:(( يقول الفقير إلى رحمه الله تعـالى شمـس الـدين أبـو العبـاس أحمـد بـن

---

([1]) ابن خلکان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٩.

([2]) احمد بن حجي: احمد بن حجي بن بريد، میرو گەورەی بنەماڵەی (مـري) بـووە، کەسـایەتیەکی ناودارویەئازا بوو، هێرشەکانی دەگەیشتە (نجد وحيجان)،پایەکی مەزنی هەبووە لـەلای هـەردوو سولتان(الملك الظاهر) وسولتان(الملك المنصور)،خۆی دەگەڕانـدەوە بـۆ (جعفـر) ی بەرمـەکی، گوایە یەکێکە لەمنالەکانی خوشکی خەلیفە هارونە رەشید، پەیوەندی بـاش بـووە لەگـەل (ابـن خلکان) ی، بەئامۆزای خۆی داناوە، دیـاری ومیوانـداری کـردن لـەنێوانیان هەبووەلەسـالی(٦٨٢ ك/١٢٨٣ز) مردووە. الذهبي، تاريخ الإسلام، ج١٥، ص٤٦٢.

([3]) الذهبي، تاريخ الإسلام، ج١٥، ص٤٦٢؛ المقريزي، السلوك لمعرفـة دول الملـوك، تحقيـق: محمـد عبد القـادر عطـا، دار الكتـب العلميـة (بـيروت: ١٩٩٧م) ج٢، ص١٨١؛ابـن تغـري بـردي،المنهـل الصافي، ج١، ص٢٦٢.

محمد بن إبراهيم بن أبي بكر بن خلكان، الشافعي)). [١] ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ( بەرمەکی )نیە، ئەگینا لە کۆتاییدا دەیووت (البرمکي)یە.

٢) ( ابن الشعار) (م:٦٥٤هـ/١٢٥٦م) کە مێژوو نووسێکی هاوچەرخی (ابن خلكان)ە، سەردانی هەولێری کردووە و چاوی بە (ابن خلكان) کەوتووە، پەیوەندیان باش بووە، لە کتێبەکەی باسی ژیان و ڕەچەڵەکی ( ابن خلكان )ی کردووە، لە ناوی (احمد) تاوەکو گەراندویەتیەوە سەر (الحسین بن المالك)، بە بێئەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ سەر ( بەرمەکی )ەکان، [٢] هەروەها باسی ئامۆزایەکی (ابن خلكان)ی کردووە، ناوو بنەچەی بەم شێوە هێناوە ( احمد بن عبد الرحمن بن ابراهیم بن ابی بکر بن خلكان بن باوك بن عبدالله بن شاكل الاربلي الاصل) بەبێ ئەوەی بیگەڕێنێتەوە بۆ ڕەچەڵەکی ( بەرمەکی )ەکان، تەنانەت بۆ زیاتر جەخت کردنەوە لەسەر ڕەچەڵەکی کوردی ئەو بنەماڵەیە، دەڵێت:((من ابناء الاكراد). [٣]

(ابن خلكان) لە هەولێر چاوی بە (ابن الشعار) کەوتووەو بینیوویەتی، لە شاری (حلب)یش یەکتر دەبینەوە، ئەگەر ( بەرمەکی) بوایە (ابن الشعار) دەبوو ئاماژەی پێ بکردایە، ئەمەش لە کاتێکدایە کە (ابن الشعار) ڕەچەڵەکی گەڕاندونەتەوە بۆ سەر کور (ابن خلكان)یش لەهەمبەر ئەمەدا بێدەنگ بووە، لە کاتێکدا (ابن الشعار) نەیووتوە ڕەچەڵەکیان ( بەرمەکی)ە، ئەگەر (ابن خلكان) ( بەرمەکی) بووایە، بەبێ دوو دڵی بە (ابن الشعار)ی دەوت، چونکە (ابن خلكان) تەنانەت باسی لە دایکبوونی خۆی زۆر بەوردی بۆ (ابن الشعار) کردووە، تەنانەت باسی ڕۆژ و مانگ و ساڵ و شوێنی لەدایکبوونی خۆیشی بۆکردووە[٤]، بەڵام هیچی لەسەر ( بەرمەکیی ) بوونی خۆی، بۆ

---

([١]) وفيات الاعيان، ج١، ص١.

([٢]) قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٥.

([٣]) قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٠.

([٤]) قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦.

باس نەکردووە، دیارە ( بەرمەك ) نەبووە، بۆیە قسەی لەسەر نەکردووە، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە پێمان دەڵێت کوردە و ( بەرمەکی )نیە، چونکە نەی ووتوە کوردی ( بەرمەکی) یاخود ناوی کورد و بەرمەك بەیەکەوە بهێنێت.

٣) هەروەها (ابن المستوفي :م٦٣٠ك/١٢٣٢ز) کە مێژوو نووسێکی ناوداری هەولێرە، هاوچەرخی (ابن خلكان)ە، باسی دوو ئەندامی بنەماڵەی ( خەلەکان ) دەکات (عمر ابن خلكان ) و (حسين ابن خلكان ) هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، کە دەبنە مامی (ابن خلكان)ی مێژوو نووس. دەڵێت: خەڵکی گوندی ( خەلەکان )ن[1]. ئاماژەی بەوە نەکردووە کە ئەم بنەماڵەیە ڕەچەڵەکیان ( بەرمەکی ) بێت، کەچی پەیوەندییەکی باش هەبووە، لە نێوان بنەماڵەی (ابن مستوفي ) و ( ابن خەلەکان ). ( ابن المستوفي) ئاگادار بووە، بە هەموو زانیاریەکانی بنەماڵەی (ابن خلكان ). لە کتێبەکەیدا نەی وتووە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ ( بەرمەکی )ەکان، یان ئەوان خۆیان ( بەبەرمەکی ) دەزانن، ئەوەش دەری دەخات کە ( بەرمەکی ) نەبوون.

٤) ( ابن خلكان ) کاتێك لە ( ميسر ) بووە، دیدەنی شێخ (عبد العظيم المنذري) (م:٦٥٦ك/١٢٥٨ز) کرد، نووسەری کتێبی(التكمله لوفيات النقله )یە، بۆتە قوتابی لای ئەو. [2] ئەم نووسەرە ژیننامەی باوکی و هەردوو مامی (ابن خلكان)ی لە کتێبەکەیدا نووسیووە و باسی بنەچەی ئەو بینەماڵەی کردووە، بە (ابن خلكان الاربلي) کۆتای هێناوە، بەبێ ئەوەی بیانگەڕێنتەوە بۆ بەرمەکیەکان[3].

٥) (ابن الصابوني) (م: ٦٨٠ك/١٢٨١ز) لە کتێبەکەی، باسی یەکێك لە ئەندامانی بنەماڵەی (ابن خلكان)ی کردووە، کە ئامۆزای (ابن خلكان) بووە، پێناسەی ڕەچەڵەکی

---

([1]) تاريخ اربل، ج١، ص ص٢٨٣، ٣٣٢.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٨٣، ٣١٠؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ئەکادیمیای کوردی، (هەولێر: ٢٠١٣)،ل٢٨٥.

([3])تحقيق: بشار عواد، ط٢، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٨٤م) مج٢_٣، ص ص١٩١، ٢٥٧.

کردووه و گەڕاندویەتییەوە بۆ کورد، بەبێ ئەوەی ناوی ( بەرمەکی ) بێنێت:((شبلي بن جنيد بن إبراهيم بن أبي بكر بن خلكان الكردي الإربلي))[1].

٦) (ابو شامة)(م:٦٦٥ك/١٢٦٦ز) یەکێکە لە مێژوونووس و زاناکانی سەردەمی( ابن خلكان ) لە کتێبەکەی باسی ( ابن خلكان )ی کردووە و دەڵێت: لە کۆڕی وانە وتنەوەمدا (ابن خلكان ) دانیشتووە و گوێی لێمگرتووە، ڕەچەڵەکی (ابن خلكان)ی نەگەڕاندۆتەوە بۆ سەر بەرمەکیەکان[2].

٧) هەروەها (ابن شداد)(م:٦٨٤ك/١٢٨٥ز) مێژوو نووسێکی دیاری ئەوکات بووە، لە دوای (ابن خلكان) مردووە، کاتێك باسی وەرگرتنی پۆستی (قاضي الفضاة) دەکات لەلایەن (ابن خلكان)، نەی گەڕاندۆتەوە بۆ ( بەرمەکی )ەکان، بەم شێوەیە ناوو ڕەچەڵەکی بنەماڵەکەی باس کردووە:((شمس الدين ابو العباس احمد بن بهاء الدين ابي عبدالله محمد بن بن ابراهيم بن خلكان)) [3] .

ئەوەی تێبینی دەکرێ، ئەو مێژوو نووسانەی کە لە سەردەمی( ابن خلكان )دا ژیاون، وەپیش ئەو مردون، بنەچەی ماڵباتی (خەلەکانی )یەکانیان بە کوردی هەولێری داناوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بە ( بەرمەکی ) بکەن، یاخود بیان گەڕێننەوە بۆی.

٨) تەنانەت ( ابن خلكان ) خۆی دەڵێت: هەندێك لە هاوڕێیانم، پرسیاری ئەوەیان لێکردوم، کە خەڵکی (دمشق) جیتلەو بارەیەوە پێی دەڵێن: گوایە تۆ درۆ لە ڕەچەڵەکت دەکەیت ! ئەویش لەوڵامدا ڕەتی کردۆتەوە کە ڕەچەڵەکی ( بەرمەکی ) بێت و دەڵێت:((أما النسب والكذب فيه فاذا كان ولا بد منه فكنت أنتسب إلى العباس أو إلى علي بن أبي طالب أو إلَى أحد الصحابة وأما النسب إلَى قوم لم يبْق لهُم بقيَة وأصلهم فرس

(1) تكملة إكمال الإكمال في الأنساب والأسماء والألقاب، دار الكتب العلمية،بيروت، ص٨٣.

(2) الذيل على الروضتيين، ط٢، دار الجيل، (بيروت: ١٩٧٤)،ص ص٢١٥_٢١٧.

(3)تاريخ الملك الظاهر، اعتناء: احمد حطيط، فرانز شتايز، (ڤيسبادن: ١٩٨٣)،ص٢٣٦.

مجوس فَمَا فيه فائِدَة))[1]. لێرەدا خۆی وەلأمێکی مەنتیقیانە دەداتەوە، بۆ ئەوەی باوەڕی پێبکەن، کە ( بەرمەکی )نیە، ئەویش بەوەی کە لە قەومی ( بەرمەکی)ەکان کەس نەماوە تاوەکو خۆی بۆ بگەڕێنتەوە و بڵێت (بەرمەکیم) هەر خۆشی ( بەرمەکی )ەکان لە ڕەسەندا بە فارسی ئاگر پەرست دادەنێت، بە واتایەکی تر ئەو لە فارس نیە، بەڵکو لە نەتەوەیەکی ترە، تەنانەت ( ابن خلكان ) کاتێك لە کتێبەکەی باسی (جعفر و يحيى وفضل البرمكى) دەکات، ئاماژەی بە بنەچەی ئەو بنەماڵەیە کردووە، وتوویەتی (برمك)ی باپیرەیان ئاگر پەرست بووە، بەبێ ئەوەی بڵێت ئێمەش وەکو بنەماڵەی ( خەلەکان)ی دەگەڕێینەوە بۆ سەر بنەماڵەی بەرمەکی[2]، هەر وەکو چۆن کوڕەکەی لەسەر زاری باوکی ڕەچەڵەکی خۆیانی گەڕاندۆتەوە بۆ سەر (جعفر)ی بەرمەکی.

٩) (كمال الدين موسى)ی کوری ( ابن خلكان ) کاتێك دەڵێت: باوکم پێی توومە ڕەچەڵەکمان دەگەڕێتەوە بۆ کوردی ( زەرزاری ) وە باب و باپیرانمان دەگەڕێتەوە بۆ ( بەرمەکی )ەکان[3]، پێویستە لێکدانەوە بۆ ئەم دوو دەستەواژە دژ بەیەك و

---

([1]) وفيات الاعيان، ج١، ص٤٥ الكتبي، فوات الوفيات، تحقيق: إحسان عباس، دار صادر(بيروت: ١٩٧٣) ج١، ص١١٢؛ الصفدي،الوافي بالوفيات، تحقيق: أحمد الأرناؤوط وتركي مصطفى، دار إحياء التراث (بيروت: ٢٠٠٠م)،ج٧، ص٢٠٤.لێرەدا (ابن خلكان) بەپێی ئەو دەقە هەم خۆی بەبەرمەکی دانەناوە، لەهەمان کاتیشدا رایدەگەیێنێت بەرمەکیەکان فارسن، کورد نین، هەروەکو هەندێك لەمێژوونوسانی کورد وا گومان دەبەن، بەرمەکی کوردن دەڵێن ((بەرمەکیەکان لەبنەچەدا کوردن، گوایە ابن خلكان خۆی گەراندۆتەوە بۆ سەر رەچەلەکی بەرمەکیەکان)).(احمد محمود خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٢٤) و(علي الصويركي، الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد عبر التاريخ، دار العربية للموسوعات، (بيروت: ٢٠٠٨)،مج١، ص٣١١).

([2]) وفيات الاعيان، ج١، ٦، ص ص ٢١٩، ٣٤٢.

([3]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٩.

جیاوازە بکەین، چونکە ناکرێ کورد بیت و لە هەمانکاتیشدا بنەچەت بۆ بنەماڵەیەکی فارس ببەیت، ئایا لێرەدا (کمال الدین موسی) تاچەند ڕاستگۆ بووە، لە گواستنەوەی ووتەکانی باوکی لەم بارەیەوە؟.دەکرێ لەوە ڕاستگۆ بێت، کەوا باوکی پێی ڕاگەیاندووە لە کوردی زەرزارین، چونکە ( ابن خلکان ) هیچ گومانی تیانیە کوردە و دەگەڕێتەوە بۆ بنەماڵەی ( خەلەکان )ی دەوروبەری هەولێر، کە (ابن المستوفي) ئەمەی پشتڕاست کردووەتەوە. هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، خودی ( ابن خلکان )یش باسی (قاضي القضاة بدر الدین یوسف)ی[1]، کردووە، کە کورد بووە دەڵێت : ناوبراو چەندین جار پێی ڕاگەیاندووم، کە خەڵکی چیاکانی هەولێرم لە هۆزی زەرزاریی[2] .

کەواتە (ابن خلکان)یش خەڵکی دەوروبەری هەولێرە، نەك شاری ( بلخە) زەرزارییەکانیش هیچ پەیوەندییەکیان بە ناوچەی( بلخە )وە نییە. دەکرێ (کمال الدین موسی) کاتێك ناوی باب وباپیرانی باوکی دەهێنێتەوە لە (محمد بن إبراهیم بن أبی بکر بن خلکان)هەتا(ابن مالك) ڕاستی کردبێت، کە قسەی باوکی بێت، بە بەڵگەی مێژوو نووس (ابن الشعار) کە لە سەردەمی باوکی ژیاوە بنەچەیانی هەتا (مالك) باس کردووە[3]، بەڵام گەڕاندنەوە لە دوای (مالك) بۆ (بن جعفر بن یحیی بن خالد بن برمك البرمکي) گومانی ئەوەی هەیە خودی (کمال الدین موسی) زیادی کردبێت، وەکو

---

([1]) قاضي القضاة بدر الدین یوسف:ناوی بدر الدین یوسف بن حسن بن علي الکردي السنجاري، چەندین جار بۆتە قازی قوزات لە میسر، بەپیاوێکی باش ناوی هاتووە، لەساڵی (٦٦٣ك/١٢٦٤ك) لەقاهیرە کۆچی دوای دەکات.ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٦، ص٢٦٦؛ الیونیني، ذیل مرآة الزمان، ج٤، ص١٥٠؛العینی، عقد الجمان في تاریخ أهل الزمان، تحقیق: محمد محمد أمین، مرکز تحقیق التراث، (مصر: ١٤٠٧) ج١، ص٤١١؛ السیوطي، حسن المحاضرة في تاریخ مصر والقاهرة، تحقیق: محمد أبو الفضل إبراهیم، دار إحیاء الکتب العربیة (القاهرة: ١٩٦٧ م) ج٢، ص٣٩٠.

([2]) وفیات الاعیان، ج٦، ص٢٦٦.

([3]) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٥.

شانازییەك کە ئەوان دەگەڕێنەوە بۆ ( بەرمەکی ) ەکان، کە خێزانێکی ناوداربوونە و سەردەمانێك پۆستی بالأیان لە دەولەتی ( عەباسی ) وەرگرتبوو.

تەنانەت مێژووش بە شێوەیەکی باش باسی ( کمال الدین موسی ) ناکات، دەڵێن ئەو هۆکاری سەرەکی بووە، لە لابردنی (ابن خلکان)ی باوکی، لە پۆستی قازی قوزات:(وَلم یکن حسن السیرة ویقال أنه کَان السبب فِي عزل أبِیه لسوء سیرته ))و(( وکانت سیرته غیر مشکورة، وهو کان أکبر الأسباب فی عزل والده))[1] .

ئەگەر خودی( ابن خلکان)یش ڕەچەڵەکی گەڕاندبێتەوە بۆ ( بەرمەکی )ەکان، بەو مانایە نایەت کەوا ئەوان ( بەرمەکین) و کوردنین، بەڵکو بنەماڵەی (خلکان ) لەلایەن مێژوو نووسانی پێش (ابن خلکان) بە کورد دانراون[2]، دەکرێ ( ابن خلکان ) هەر وەکو شانازییەك خۆی گەڕانبێتەوە بۆ بەرمەکیەکان[3]. هەر چەندە ئەمەش دوورە لە ڕاستی، چونکە گەر وابا، خۆی لە کتێبەکەی یاخود لەلای هاوەلأنی بەبێ هیچ دوو دڵیەك ئامـاژەی پێدەکرجگە لەوەش خۆی و بنەماڵەکەی زۆر ناسراو بوونە، چ پێویستی بەوەیە شانازی بە کەسانی تر بکات، هەر خۆیان جێی شانازی بوونە. چ لە لایەن زانایان و دەسەلاتداران.

بەشێك لەو مێژوو نووسانەی کە لەدوای (ابن خلکان) هاتون، کاتێك لە بارەی ژیانی (ابن خلکان) دواون، ڕەچەلەکیان نەگەڕاندۆتەوە بۆ سەر بەرمەکیەکان[4]، جگە

---

([1])ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة في أعيان المائة الثامنة، تحقيق: محمد عبد العميد، ط٢، مجلس دائرة المعارف العثمانية، (صيدر اباد: ١٩٧٢ن)، ج٦، ص١٣٧؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٨، ص٢١٣.

([2]) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٠.

([3]) الخوانساری، روضات الجنات، ج١، ص٢٠.

([4]) ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٠١ ؛الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١٠؛ الصفدي،الوافي بالوفيات، ج١، ص١٦٤؛الاسنوي، طبقات الشافعية، ج١، ص٢٣٨؛السيوطي، حسن المحاضرة، ج١، ص٥٥٥؛بكر بن عبد الله، طبقات النسابين، دار الرشد، (الرياض: ١٩٨٧م)،ص١٣٠.

لەوە (عبد الرحمن بن جوهر الاشعري) كتێبەكەی (ابن خلكـان)ی پوخـت كردۆتـەوە، لـە پێشەكیەكەیدا ناوی (ابن خلكان)ی بەم شێوەیە (الامام العالم العلامة احمد بن محمد بـن ابـراهیم بـن خلكـان زادة الله فضـلا وكرامـة)هێنـاوە، بـەبێ ئـەوەی ئامـاژە یـاخود بیگەڕێنتەوە بۆ بەرمەكیەكان.[1]

ئەمەش بەلگەیەكی ترە، گەر ( بەرمـەكی ) بوایـە ئـەو سەرچـاوانەی دوای خـۆی ئاماژەیان پێدەكرتەنانەت لەم دواییانەدا نامەیەكی ماستەر لە ژێر نـاو نیشـانی (دور الاسـرة البرامكـة في التـاريخ الاسـلامی)كـراوە، تیایـدا توێـژەر ئامـاژەی بـە هەنـدێك بەلگەنامـەی تایبـەت لەسـەر ( بەرمـەكی )ەكـان كـردووە، دەیسـەلمێنێت ( بەرمـەكی )ەكان ڕەچەڵەكیان دەگەڕێتەوە بۆ پاشایانی پێشووی فارس[2].

---

(1) مختصـر وفيـات الاعيـان لابـن خلكـان، معهـد المخطوطـات في القـاهرة، تحـت رقـم(٧٠)،ص٦.بـۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە پاشكۆی ژمارە (٢).

(2) قويدر بشار، دور اسرة البرامكة في التاريخ الاسلامي، رسالة الماجستير غير منشورة مقدمـة الى معهد التاريخ في الجامعة الجزائر، ١٩٨٦، ص٤٧.

## دووەم: لەدایك بوون و پێگەیشتنی زانستی:

(ابن خلکان) ڕۆژی لە دایك بوونی خۆی لە کتێبەکەیدا تۆمارکردووە و لەلای (ابن الشعار)یش باسی کردووەو دەڵێت: (( لە دوای نوێژی عەسری ڕۆژی پێنج شەمەی یازدەی مانگی رەبیعی ئاخیری، ساڵی شەش سەدو هەشتی کۆچی (٦٠٨ك/٢٣سبتمبر ١٢١١ن)[1]، لە ناو قوتابخانەی موزەفەرییەی[2]، شاری (اربل) لەدایك بووەمە)) [3].

سەبارەت بە گەورەبون و پێگەیشتنی زانستی( ابن خلکان ) لە بنەماڵەیەکی ڕۆشنبیر و زانست پەروەربووە، کە بە فوقەها و پۆستەکانی ئاینەوە ناسراون[4]، ئەوەش کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر پێگەیشتنی کەسایەتی.( ابن خلکان ) دوو ساڵی تەواو نەکردبوو، باوکی کۆچی دوای کرد، بەڵام باوکی پێش مردنی سور بووە، لەسەر گەشەپێدانی لایەنی زانستی کوڕەکەی، هەر لە زارۆکییەوە هەڵی خوێندنی بۆ

---

(1) قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦؛وفيات الاعيان، ج٢، ص٣٤٤؛فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث عند ابن خلكان، دار العربية للكتاب، (ليبا: ١٩٩١)،ص١٣.

(2) قوتابخانەی موزەفەرییە: ناوی ئەم قوتابخانەیە دەگەڕێتەوە بۆ (مظفر الدين كوكبري)،کەئەودروستی کردووەو چاودێری کردووە، دروست کردنی ئەم قوتابخانەیە دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی (٦٠٤ ك /١٢٠٧ن)،(محمد بن ابي بكر بن خلكان) باوکی مێژوونوس ابن خلکان وانەی لەم قوتابخانەیە داوەتەوە هەر لەم قوتابخانەیە (ابن خلکان) لەدایك بووە، باوکی ابن خلکان بەردەوام بووە لەوانەوتنەوەدا تاوەکو مردنی لەساڵی (٦١٠ك/١٢١٣ن)،لەدوای ئەو (احمد بن موسى بن منعة الاربلي) دەرسی لەوقوتابخانەیە دایتەوە.ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦؛ الاسنوي؛طبقات الشافعية، ج١، ص٢٣٨؛زبير بلال، اربيل، مطبعة النعمان، (النجف: ١٩٧١)،ص ص١٨٢.٣.

(٣) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦؛ابن خلكان وفيات الاعيان، ج٢، ص٣٤٤؛البغدادي، هدية العارفين أسماء المؤلفين وآثار المصنفين، دار احياء التراث العربي، بيروت، ج١، ص٩٩.

(4) ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٧، ص٣٥٤.

ڕەخساندوە و لەسەر دەستی چەند زانایەکی ناوداری ئەوکات[1]، هەر لەو تەمەنە بچووکەدا، چەندین ئیجازەی لە لایەن چەند زانایەکی ئەوکاتەوە وەرگرتووە، بۆ نمونە لەلای (زينب بنت الشعری)[2]، خوێندویەتی و ئیجازەی وەرگرتووە، هەر وەکو خۆی ئاماژەی پێکردووە و دەڵێت:(( وأخذت عنهم رواية وإجازة، كتبتها في بعض شهور سنة عشر وستمائة))[3].

بەم شێوەیە مافی ڕیوایەت کردنی پێدرا، باوکی ( ابن خلكان ) هەوڵی زیاتری دا بۆ بە دەست هێنانی ئیجازە بۆ کوڕەکەی، داوای لە (رضي الدين النيسابوري)[4] کرد، ئیجازەیەك بدات بە کوڕەکەی، ئەویش لە خوراسان، ئیجازەیەکی بۆ دەنووسێت وبۆی

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٠٨؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، رسالة الماجستير غير منشورة مقدمة الى المجلس كلية الاداب، جامعة الموصل، (الموصل: ١٩٨٩)،ص٢١، زبير بلال، ابن خلكان، ص٢٩.

(2) أم المؤيد زينب بنت الشعري: ئەم ئافرەتە زانایە کچی(أبی القاسم عبد الرحمن بن الحسن بن أحمد الجرجانی)ه لەسالی (٥٢٤ك/١١٢٩ز)،لەنیسابور لەدایك بوە، لەسالی (٦١٠ك/١٢١٣ز) گەیشتە هەولێرو لە قوتابخانەی موزەفەریە مێوان بوو، بە (الشعري) بەناوبانگ بووە، لەسالی(٦١٥ك/١٢١٨ز).لەنیسابور کۆچی دوای کردووە. ياقوت الحموي،معجم الأدباء،تحقيق: إحسان عباس، دار الغرب الإسلامي، (بيروت: ١٩٩٣م)،ج٧، ص٣١٥٠؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٣٤٤؛ محسن محمد حسين، هەولێر لەسەردەمی ئەتابەگیاندا، و: عثمان علی، چ٢، نوسینگەی تەفسیر، (هەولێر: ٢٠١٣) ل٣٠٥.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٣٤٥.

(4) رضي الدين النيسابوري: ناوی (أبو الحسن المؤيد بن محمد بن علي الطوسي) ئەسلی نیسابورییە، لەسالی (٥٢٤ك/١١٢٩ز) لەدایك بووە، گوێ لە (صحيح مسلم) و(صحيح البخاری) و(المؤطا) گرتووە، لەخزمەت زۆر لەزانایانی نیسابور گوێ گرتووەو سەردانی زۆر ناوچەی کردووەو لەسالی(٦١٧ك/١٢٢٠ز) لەنیسابور کۆچی دوای کردووە. القزويني، آثار البلاد وأخبار العباد، دار صادر، بيروت، ص٤٧٤؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٤٥؛ القرشي، الجواهر المضية في طبقات الحنفية، مير محمد كتب خانه – كراتشي، ج٢، ص٣٧٠.

دەنێرێت :(( ولنا منه إجازة كتبها من خراسان باستدعاء الوالد رحمه الله تعالى في جمادى الآخرة سنةعشروستمائة))[1]. هەروەها ئیجازەی لە لایەن چەندان زانای دیکە وەرگرتووە[2].

لەوانەبوو ئەو منداڵە و براکانی کاتێ (شهاب الدین)ی باوکیان مرد، دەستبەداری زانستی ببن، بەڵام دۆستایەتی پتەوی ئەو زانایە لەگەڵ سوڵتان (مظفر الدین کوکبری)[3]، بووە مایەی هاندان و تێکۆشان لە پێناوی وە دەستهێنانی زانیاریدا، پاش مردنی باوکی (ابن خلکان) لەساڵی (٦١٠ك/١٢١٣ز)[4]، سوڵتان باڵی باوکایەتی بۆ کردنەوە و زۆر باش چاودێریکردن. هەر بۆیە (ابن خلکان) کە بە دوور و درێژی سەر گوزشتەی ( کوکبری ) نووسیوە. گوتوویەتی:((خوێنەر دەبێ ببورێ ئەگەر ژیننامەکە

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٤٥.

([2]) ئەو زانایانەش هەریەکە لە (المؤيد الطوسي) و(و(أبو روح)،و(ابن الصفا)،و(الحسين بن أحمد القشيري)،(وإسماعيل)،و(محمد بن علي بن عبد الله السيد الحسيني)،هەندێکی تری نیسابوری بوونە.لەم بارەوە بڕوانە هەریەکەلە. الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١٠؛ ابن تغري بردي، المنهل الصافي، ج٢، ص٩٣.

([3]) مظفر الدين كوكبری: (أبو سعيد كوكبوري بن أبي الحسن علي بن بكتكين) لەساڵی(٥٤٩ك/١١٥٤ز) لەدایك بووە، باوکی بە(کجك) ناسروە، لەدوای مردنی زين الدين يوسفى، برای لەساڵی (٥٨٦ك/١١٩٠ز)،شوێنی گرتەوەو بووە خاوەنی هەولێر، پاشان (الست ربيعة خاتون) خوشکی (صلاح الدين)ی دەخوازێت، لەزۆر جەنگدا لەگەل صلاح الدين ئەیوبی لەدژی سەلیبییەکان دەجەنگا، چەندین کاری خێرخوازی کردووەبۆ هەژاران و زانایان، لەساڵی (٦٣٠ك/١٢٣٢ز) کۆچی دوای کردووە. أبي شامة،عيون الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية، تحقيق: إبراهيم الزيبق، مؤسسة الرسالة(بيروت: ١٩٩٧م) ج٣، ص٢٤٦؛ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص ص١١٣_١١٥؛ اميد ابراهيم جوزەلی، الحياة العلمية في اربيل، بدرخان، (اربيل: ٢٠٠٨م) ص٥٤_٦١؛ئاجی عباس، لاپەرەیەکی زێرین لە تاریخی ئەربیل، گۆفاری گەلاوێژ، ژ(١_٢)،١٩٤٢ز، ل ل١١_١٢.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٠٨.

درێژه )واته ئەگەر لە باسکردنی کردەوە چاکەکانی ئەو پیاوەدا درێژداری کردبێت لەبەر ئەوەیە پاداشتی چاکەی ئەم میرە بەهیچ تەواو نابێت و سوپاسی چاکەکەران پێویستە و خوا هەرخۆی تۆڵەی چاکەی بۆ ببژێرێ، زۆر چاکەی لەسەر منە و مرۆڤ دەبێ وەفادار بێت وچاکەی لەبەر چاودابێت))[1].

(ابن خلكان) لە بارەی یەکێکی تر لەو مامۆستایانەی کە لە سەرەتاکانی ژیانییەوە لە هەولێر دەرسی پێ وتووە(أحمد بن موسى ابن منعة، م:٦٢٢ك/١٢٢٥ز)ی هەولێری یە، گوتوویەتی هیچ کەسێکی تری وەکو ئەو مامۆستایەی نەبینیووە، لە دەرسوێژیدا و کارێکی تەواوی لە دەروونی کردووە. پێ دەڵێ:((ولقد كان من محاسن الوجود، وما أذكره إلا وتصغر الدنيا في عيني))[2]، وادیارە گرنگترین مەڵبەندی ڕۆشنبیری، پاش قوتابخانەی موزەفەرییە، بۆ (ابن خلكان) کە تێدا بەشداری کردبێت، مەجلیسی (ابن المستوفی)بووە[3]، ئەو پیاوەی ماڵی خۆی کردبووە میوانخانەی ناودارانی سەردەمی خۆی، کە سەریان لە هەولێر دەدا، پێشوازی لێدەکردن و یارمەتی دەدان. یەکێك لەوانەی لە مەجلیسی ئەوبوون، جوگرافیازانی گەورە (یاقوت الحموی)بووە، لەساڵی(٦٢٦ك/١٢٢٨ز) مردووە، زیاتر لەجارێك سەری لە هەولێر داوە و باسی (ابن

---

[1] )وفيات الاعيان، ج٤، ص١٢٠؛زبير بلال، ابن خلكان، ص٣٠؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٧٨.

[2] ) وفيات الاعيان، ج١، ص١٠٨؛ عبد السلام السيدا، موسوعة علماء العرب، الأهلية للنشر والتوزيع، (عمان: ٢٠٠٥م) ١٦٧.

[3] ) ابن المستوفي: ناوی (أبو البركات المبارك بن أبي الفتح أحمد بن المبارك بن موهوب بن غنيمة بن غالب اللخمي، بە(ابن المستوفي الإربلي) ناسراوە، لەساڵی(٥٦٤ك/١١٦٩ز) لەهەولێر لەدایك بووە، ئەدیب ومێژوونوس و وەزیر بووکەسێکی پایەبەرزو بەرێز بووە، هەر زاناوناودارێك هاتبێتە هەولێر، سەردانی ئەویان کردووە، بێجگە لەکتێبەبەناوبانگەکەی (تاريخ اربل) خاوەنی چەندین کتێبی ترە، لەساڵی(٦٣٧ ك/ ١٢٣٩ز) مردووە.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص١٤٧؛خير الدين الزركلي، الأعلام، ج٥، ص٢٦٩.

المستوفي)كردووە، كەوا دەستێكی باڵای لە ئەدەبیات هەبووە و دۆستی ئەدیبیان بووە[1]. هەروەها (ابن الشعار)ی موسلیش لە(م:٦٥٤ك/١٢٥٦ز) لە كتێبەكەیدا ستایشی (ابن المستوفي)و مەجلیسەكەی كردووە[2].

هەر بۆیە (ابن خلكان) ماڵی (ابن المستوفي)كردۆتە سەرچاوەی زانستی خۆی و لەوێ گوێگربووە و سوودی لێبینیوە. گوێشی لە میوانانی مەجلیسەكەی گرتووە. لەوانەیە جێی خۆی بێ هەندێ ڕووداو تۆمار بكرێت، كە لە مەجلیسی چەند ناودارێكی سەردەمی خۆیدا، ئەو كاتەی لە هەولێر بووە، سەرەتای بایەخدانی بووە، بە زانست و ڕۆشنبیری گێراوەتەوە، بە نموونە لە نووسینی بەسەرهاتی شاعیری ناسراوی ئەو سەردەمە (محمد بن نصربن الحسين)ناسراو بە (ابن عنين الشاعر)(٥٤٩_٦٣٠ك)( ١١٥٤ _ ١٢٣٢ز )دا كە مەلیك (المعظم شرف الدين عيسى بن الملك العادل) مەلیكی( دیمەشق) ناردبوویە هەولێر ( ابن خلكان ) نووسیویەتی : ساڵی ( ٦٢٣ك/١٢٢٦ز)لە هەولێر دیتم، نامەبەری مەلیك (المعظم شرف الدين عيسى بن الملك العادل ) بوو..كەمێك لە هەولێر مایەوە پێش ئەوەی بەرەو ( هیندستان ) بكەوێتەرێ[3].

بەردەوام بووە لەسەر خوێندنی زانستەكانی ئاینی، تا وەكو ساڵی (٦٢١ك/١٢٢٤ز) گوێی لە (صحيح البخاري) لەلای (محمد بن هبه الله بن المكرم بن عبد الله الصوفي البغدادي)(م: ٦٢١ك/١٢٢٤ز)، گرتووە[4].

---

([1]) ياقوت الحموي، معجم البلدان، مادة، اربل، ج١، ص١٣٨.

([2]) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج٦، ص ص٣٥_٣٧.

([3]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص١٥؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی كورددا، ل ل٢٧٩ _٢٨١.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٢٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص٢٠١؛فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث، ص١٤.

**هەروەها لەساڵی (م:٦٢٣ك/١٢٢٦ن)، (ابن خلكان) لە قوتابخانەی ( موزەفەرييە ) لە مەجليسی (الشيخ جمال الدين بن السنينيرە)[1]، بەشداری كردووە و كە مەجليسێكی ئەدەبی بووە، ئەمەش كاريگەری هەبووە، لەسەر حەزی (ابن خلكان) بە ئاراستەی ئەدەبياتدا[2] .**

**هەروەها لە ساڵی (م:٦٢٥ك /١٢٢٧ن) ئەوكات لە تەمەنی( ١٧)ساڵيدابوو (الخلاف)[3]ی لەسەر دەستی (الشيخأثير الدين المفضل بن عمر بن المفضل الأبهري) (م:٦٦٣ك/١٢٦٤ ن)خوێندووە[4]، هەروەها باسی هاتنی( ابي الخطاب بن دحية)[5] ی**

---

(١) ابن السنينيرة: (عبد الرحمن بن محمد بن محمد بن عمر بن أبي القاسم، جمال الدين الواسطي،لەساڵی (٥٤٧ك/١١٥٢ن) لەدایك بووە،، شاعیرێكی بەناوبانگ بووە، زۆر ناوچەگەراوە، سەردانی هەولێری كردووەو كۆڕی ئەدەبی لەقوتابخانەی موزەفەرییە هەبووە، لەساڵی(٦٢٦ك /١٢٢٨ن) مردووە، ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص٢١٥؛الكتبي، فوات الوفيات، ج٢، ص٢٩٨.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص٢١٥؛ فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث، ص١٤.

(٣) الخلاف: زانستێكە چۆنێتی هێنانی بەڵگەشەرعییەكانی پێدەزانرێت، گومان بڕیشی دەكات، وەبەڵگە ناكۆكی سازە ناشیاوەكان، بەرێزكردنی بەڵگە یەكلایی كەرەوەكان. ئەویش ئەودەمەدەمكردنەیە(جدل) كەبەشێكە لەزانستی لۆژیك (مەنتیق)،ئەوەنەبێت كەئەم تایبەتكراوە بەمەبەستەكانی ئاینەوە.حاجي خليفة، كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، مكتبة المثنى، (بغداد: ١٩٤١)،ج١، ص٧٢١.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣١٢؛ صلاح الدين المنجد، أعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، مؤسسة التراث العربي، (بيروت: ١٩٥٩) ج١، ص١٢١.

(٥) الحافظ ابن دحية: (أبو الخطاب عمر بن الحسن بن علي بن محمد بن دحية)،لەساڵی(٥٤٤ك/١١٤٩ن) لەدایك بووە، كەسێكی ناودار بووە، شارەزا بووە لە نەحو زمانەوانی وشیعردا، زۆر ناوچە گەراوە لەساڵی (٦٠٤ك/١٢٠٧ن) هاتۆتە هەولێر، پەرۆشی سولتان موزەفەرەدینی بینیوە بۆ ئاهەنگی مەولود، بۆیە كتێبێكی لەژێر ناوی (كتاب التنوير فى مولد السراج المنير) پێشكەشی سولتانی كردووە، لەساڵی (٦٣٣ك/١٢٣٥ن) مردووە.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٩.

کردووه، بۆ بەشدار بوون لە ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر(خ) هاتووه( ابن خلکان ) دەڵێ:لە شەش مەجلیسدا لە هەولێر گوێی لە خوێندنەوەی (کتاب التنویر )بووە[1].

## سێیەم: خانەوادەی:

زۆر لە خانەوادەی کوردی، لە مێژووی ئیسلامیدا، لە بواری زانست و مەعریفەت دا بەناوبانگ بوونە. ڕۆڵیان بینیووە لە بنیادنانی شارستانیەتی ئیسلامیدا، هەروەکو دیارە بنەماڵەی (ابن خلکان)، یەکێکە لە ناودارترین بنەماڵەی هەولێر، کە لە سەردەمی سوڵتان (مظفرالدین کوکبری) زیاتر بەدیار کەوتوونە و بەناوبانگ بوون، بە زانستی شەرعناسی و فەرموودە، زۆر لە سەرچاوەکان باسی هەندێك لە ئەندامانی ماڵباتی (خەلەکان)یان کردووە و ڕۆڵیان بەرز نرخاندوون، لە خزمەت کردنیان بە زانستە ئیسلامیەکان، هەر بۆیە لێرەدا بە پێویست دەزانرێت زانیاری دەربارەی ئەو کە سایەتیانە لە خانەوادەکەیدا بخرێتە ڕوو، کە ڕۆڵیان هەبووە، لە کاروانی زانست ومەعریفەت وکاری دادوەری دا:

### أ_ باوکی :

ناوی(محمد بن إبراهیم بن أبی بکر بن خلکان)ە[2]، بە دوو نازناو (شهاب الدین)[3] و ((بهاء الدین) ناوی هاتووە[4]. لە دەوروبەری ساڵی(٥٥٧ك/١١٦٢ز) لە هەولێر لە دایك

---

([1])وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٩٩.

([2]) المنذری، التکملة لوفیات النقلة، مج٢، ص٢٨٤؛ ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج١، ص١؛السبکي، طبقات الشافعیة الکبری، ج٨، ص٤٤؛ الاسنوي، طبقات الشافعیة، ص٢٣٨؛ابن کثیر، طبقات الشافعیین،تحقیق:انور الباز، دار الوفاء، (المنصورة:١٩٩٣ز)، ص٧٧٨.

([3]) الاسنوی، طبقات الشافعیة، ص٢٣٨؛ ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٧، ص٦٥٠.

([4])ابن کثیر، طبقات الشافعیین، ص٧٧٨؛ المقریزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج٣، ص٨٦؛ بدر الدین العینی، عقد الجمان في تاریخ أهل الزمان، ج١، ص٣١١.

بووه، هەر لەم شارەشدا گەورەبووە، پاشان چووە بۆ شام ومیسر وحیجاز وعیراق، بە دوای فەرموودە و عەودالْ بووە، شەریعەتی لەسەر مەزهەبی شافیعی لە موسل تەواو کر ئینجا دووبارە بۆ خوێندنی زیاتر چووەوە بۆ بەغداو[1]، لەوێش لە قوتابخانەی (النظامیة)[2]، زانستی خوێندووە، هەر لەوێش بە(معید) دامەزراوە، لەلای شێخ (ابن فضلان)(م:٥٩٥ك/١١٩٩ز)و چەندین زانای تر دەرسی خوێندووە، دووبارە چووەتەوە بۆ موسل، چواردە سالْ لەوێ ماوەتەوە[3]، پەیوەندیی هاوڕێیەتی باشی هەبووە لەگەلْ چەندین زانای بەناوبانگ، لەوانە (ابن الاثیر) و (ابن شداد)[4].

هەر لە موسل هاوسەرگیری لەگەلْ کچێك دەکات بەناوی (امنة) باوکی ئەو کچە، شێخی تایفەی حەنەفی بووە لە موسل. نازناوی (شمس الدین)بووە[5]، پاشان گەڕاوەتەوە بۆ هەولێر، لێهاتوویی و ناوبانگی (بهاء الدین محمد ابن خلكان) لە

---

([1]) المنذری، التكملة لوفیات النقلة، مج٢، ص ص٢٨٤_٢٨٥؛ الاسنوی، طبقات الشافعیة، ص٢٣٨؛محسن محمد حسین، هەولێر لەسەردەمی ئەتابەگیاندا، ل٣٠٢.

([2]) المدرسة النظامیة: قوتابخانەی (النظامیة) لەلایەن (نظام الملك) وەزیری سەلجوقیەکان، لەسالی(٤٥٧ك/١٠٦٤ز) دەست کرا بەدروست کردنی، تاوەکولەسالی (٤٥٩ك /١٠٦٦ز) تەواو کرا، بۆ شافعیەکان بونیات نرابوو، یەکەم کەس کەوانەی تیا وتبێت (ابن الصباخ) و(الشیخ ابی اسحاق الشیرازی) بوونە، هەروەها ئیمامی(الغزالی) یش دەرسیی لەم قوتابخانەیە داوەتەوە، ئەم قوتابخانەیە بەهەزاران زانای شەرعناسی پێگەیان ابن العمراني، الإنباء في تاريخ الخلفاء، تحقيق: قاسم السامرائي، دار الأفاق العربية، (القاهرة: ٢٠٠١ م) ص٢٠٤؛ ابن الجوزي، المنتظم في تاريخ الأمم والملوك، تحقيق: محمد عبد القادر واخرون، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٢) ج١٦، ص ص٩١، ١٠٢؛ابن الأثير، الكامل في التاريخ، ج٨، ص ص٢٠٤، ٢١٢.

([3]) الاسنوی، طبقات الشافعیة، ص٢٣٨؛ابن كثیر، طبقات الشافعیین، ص٧٧٨؛ محسن محمد حسین، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٠.

([4]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٣، ٧، ص ص٩، ٣٤٩.

([5]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٤، ص٩؛ زبیر بلال، حیاة ابن خلكان، ص٢٦.

شارەكەی خۆیدا زیاتر برەوی سەند و لە فەتوادا پێگەی دیاربوو لەلای سەرداری هەولێر (مظفرالدین كوكبری)، پلەو پێگەی دیاری وەرگرت و لە قوتابخانەی (المظفریة)بە وانەبێژ دایمەزراند، ئیدی لەم قوتابخانەیەدا بەردەوام دەرسی دەگۆتەوە تا لە سالّی (٦١٠ك/١٢١٣ن)كۆچی دوای كرد[1].

ب_ براكانی:

بە پێی سەرچاوە مێژووییەكان( شهاب الدین محمد )ی باوكی (ابن خلكان)ی مێژوو نووس دیارە سێ كوری هەبوو، واتە ( ابن خلكان ) دوو برای هەبووە، كە لە سەرچاوە مێژووییەكان بەم شێوەیە ئاماژەیان پێكراوە:

١_ القاضي بهاء الدين ابن خلكان:

ناوی (محمد بن محمد بن إبراهیم بن أبی بكر بن خلكان)[2] بە (بهاء الدين) ناسراوە[3]، برا گەورەی قازی(شمس الدين بن خلكان)ە، لە سالّی(٦٠٣ك/١٢٠٦ن لە شاری هەولێر لە دایك بووە، هەر بەوێنەی ( احمد )ی برای گوێ بیستی پەرتووكی

(1) المنذری، التكملة لوفیات النقلة، مج٢، ص٢٨٥؛ الاسنوی، طبقات الشافعیة، ص٢٣٨؛ابن كثیر، طبقات الشافعیین، ص٧٧٨؛ زبیربلال، من التراث الثقافي الكردي(علماء ومدارس في اربیل)،مطبعة الزهراء الحدیثة، (موصل: ١٩٨٤ن) ص١٩؛ محسن محمد حسین، هەولێر لەسەردەمی ئەتابەگیەكاندا، ل٣٠٢.

(2)اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص٢٣٤؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١، ص١٦٤؛ الفاسي، ذيل التقييد في رواة السنن والأسانيد، تحقيق: كمال يوسف الحوت، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٠م) ج١، ص٢١٥؛محمد علي الصويركي، الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد في التاريخ، الدار العربية للموسوعات، (بيروت: ٢٠٠٨م)،مج٤، ص١٣٤.

(3)اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص٢٣٤؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١، ص١٦٤؛ الفاسي، ذيل التقييد في رواة السنن والأسانيد، ج١، ص٢١٥.

(صحيح البخاری)بووه، له زانا(ابن المكرم الصوفی)(م:٦٢١ك/١٢٢٤ن) و ئیجازەی زانستی لە گەورە زانایانی تریش وەرگرتووە. دوای ئەوەی شارەکەی جێهێشتوە و ڕوویکردۆتە شام، بە مەستی خوێندن و وەرگرتن و بە دەستهێنانی بڕوانامەی بەرزو سود وەرگرتن لە مامۆستا و شارەزایانی ئەم ولاتە، چەند قوتابیەك وانەیان لەلای خوێندە و لەمەوە گوێ بیستی فەرموودە بوون[1]. هەروەها واباس دەکرێ کە ئەو خاوەنی کتێبی (التاريخ الأكبر في طبقات العلماء وأخبارهم )بێت[2]. ماوەیەك كرا بە قازی (بعلبك) و بەردەوام بوو، لە کارەکەی تا لە ساڵی(٦٨٣ك/١٢٨٤ن)هەر لەو شارە کۆچی دوای کرد[3].

وەك سەرچاوەکان ئاماژەیان پێ کردوە، ئەم قازییە پیاوێکی کەم هاوتا بووە، بە تایبەتی لە بێ فیزی و دڵناسکی و ڕەوشت بەرزی و نەرم و نیانی دا، ڕێزی کە سانی تری گرتووە، کە کۆچی دوای کرد، قەرزاربووە و بۆیە کە سوکاری بۆ دانەوەی قەرزەکانی ناچار بوون کتێبەکانی بفرۆشن[4].! ناوی دوو کوڕی لە سەرچاوە مێژوویيەکان هاتووە، یەکێکیان قازی (عماد الدين محمد ابن القاضي بهاءالدين محمد ابن بهاء الدين محمد بن ابراهيم بن ابي بكر ابن خلكان)ە، برازای قازی (شمس الدين بن خلكان)ە قازی شارۆچکەیەك بووە لە شام، ڕەوشت بەرز و خاوەن ڕێزبووە، بەردەوام بووە لە قازیەتی تاوەکو لە ساڵی(٦٩٩ك/١٢٩٩ن)مردووە[5]. ئەوی تریان، قازی (ابو

---

([1]) الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١، ص١٦٤.

([2]) كارل بروكلمان، دائرة المعارف الاسلامية، مادة خلكان، ج١، ص٢٧٥؛محمد علي الصويركي، الموسوعة الكبرى لمشاهير الكرد في التاريخ، ص١٣٤.

([3])اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص٢٣٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١، ص١٦٥؛ الفاسي، ذيل التقييد في رواة السنن والأسانيد، ج١، ص٢١٥.

([4]) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص٢٣٤؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١، ص١٦٥؛ الفاسي، ذيل التقييد في رواة السنن والأسانيد، ج١، ص٢١٥.

([5]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٥، ص٩٣٥.

بکر بن محمد بن ابراهیم بن ابی بکر بن خلکان)ە، لە ساڵی(٦٤٠ك/١٢٤٢ن) لە دایك بووە، قازییەتی چەند ناوچەیەکی شامی پێ سپێردراوە، ناوبراو لە ساڵی (٧٢٥ك/١٣٢٥ن)کۆچی دوای کردووە[1].

٢_ضیاء الدین عیسی :

دیارە هیچ زانیاریەك لە سەرچاوەکان لە بارەی ئەم برایەی نیە، تەنها ئەوە نەبێت ( ابن خلکان) لە سەرگوزشتەی (الحاجری الأربلی)[2]دا، دەڵێت: لەنێوان (الحاجری) و(ضیاء الدین عیسی)برام هاورێیەتیەکی بەهێز هەبووە، براکەم ئەوکات واتا لە ساڵی(٦١٩ك/١٢٢٢ن)لە هەولێر بووە[3].

ج_ خێزانی:

هەرچەندە لە سەرچاوەکان زانیاری نادەن بەدەستەوە دەربارەی، تەنانەت خودی (ابن خلکان)یش ئاماژەی پێ نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت دەڵێت: کاتێك لە قاهیرە بوومە ژنم هێناوە، لە ساڵی (٦٥١ك/١٢٥٣ن) خوای گەورە کورێکی پێداوم، ناوم لێناوە (کمال الدین موسی)[4]، هەروەها هەر خودی (ابن خلکان) دەربارەی بنەماڵەکەی چەند زانیاریەکی ئاماژە پێکردووە، بۆمان دەگێرێتەوە کە(أبا بکر ابن خلکان )ی باپیری قوتابی (الشیخ أبیاسحاق الفیروزابادی الشیرازی م:٤٧٦ك/١٠٨٣ن) ناودارترین شەرع

---

([1]) الصفدي،أعيان العصر وأعوان النصر، تحقق: علي أبو زيد واخرون، دار الفكر المعاصر، (بيروت: ١٩٩٨م) ج١، ص٧٣٣؛ ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة، ج١، ص٥٤٤.

([2]) الحاجري الإربلي: ناوی(أبو يحيى وأبو الفضل عيسى بن سنجر بن بهرام بن جبريل بن خمارتكين بن طاشتكين الإربلي) شاعیر بووە، هاورێ ابن خلکان بو شیعری بۆ ووتتوە، لەساڵی (٦٣٢ك/١٢٢٦ن) کۆچی دوای کردووە.ابن خلکان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٥١_٥٤.

([3])وفيات الاعيان، ج٣، ص٥٢.

([4]) ابن خلکان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣١٧.

زانی سەردەمی خۆی بووە، لە بەغدا، کە لای ئەو لە قوتابخانەی (النظامية) شەرعی خوێندووە، (ابابکر) لە تەمەنی نەوت ساڵی دا، لە ساڵی ٥٢٥ک/١١٣١ن)مردووە[1].لەوانەیە (ابابکر بن خلکان) یەکەمین کەسی ئەم بنەماڵەیە بێ، کە بۆ خوێندن چووەتە بەغدا.

### د _ منداڵەکانی:

لە سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بە دوو کوڕی ( ابن خلکان ) کراوە، بەم شێوە باسیان کراوە:

#### ١_ کمال الدین موسی:

قازی (کمال الدین ابو الفتح موسی بن احمد بن محمد بن ابراهیم بن خلکان) کوڕی قازی (شمس الدین بن خلکان)ە، لە ساڵی (٦٥١ک/١٢٥٣ن) لە قاهیرە لەدایکبووە [2]، باوکی بە ناوی (کمال الدین موسی)ی[3]، زانای گەورە و بە ناو بانگی هەولێری کردووە،

---

(1)وفيات الاعيان، ج٤، ص ص٩_١٠.

(2) البرزالي، المقتفي، دراسة وتحقيق: يوسف ابراهيم الزاملي، رسالة مقدمة للنيل درجة الدكتورا، جامعة ام القرى، (سعوديا: ١٩٩٥م) ج١، ص٢١٩؛ ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة، ج٦، ص١٣٧؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٨، ص٢١٣" فرهاد حاجي عبوش، الكرد في كتاب المقتفي على كتاب الروضتين للبرزالي، مجلة زانكويا دهوك، مجلة زانكويا دهوك، ( دهوك_٢٠١٢م) العدد(١)، المجلا(١٥)، ص ص١٣٩_١٥١.

(3) كمال الدين موسى: أبو الفتح موسى بن أبي الفضل يونس بن محمد بن منعة بن مالك بن محمد، نازناوی(کمال الدين) بوو، لەساڵی (٥٥١ک/١١٥٦ن) لەموسڵ لەدایك بووە، شەرعناسی شافیعی بووە، (٢٤) هونەری زانیوە، لە لە زۆربەی زانستەکان شارەزابووە و بەتایبەتی زانستی بیرکاری، پزیشکی ومەنتق وخیلاف ومێژووی وهتدهەروەها ئەوەندە شارەزابووە لە تەورات وئینجیل بەرادەیەك (اهل الذمة) دەهاتنە لای بۆئەوەی تەفسیری تەورات وئینجیلیان

کە ( ابن خلکان ) تا بلێی ڕێزی لێ دەگرت و سەرسام بووە بە زانین و ڕەوشت و زیرەکی ئەم پیاوە. بۆیە ئەم ناوەی لێ ناوە[1] .

تەنها (البرزالی)(م:٧٣٩ك/١٣٣٨ز) کە هاوچەرخی بووە، وەك قازی ناوی هێناوە و سەرچاوەکانی تر بە قازی ناویان نەبردووە، عەودالّی خوێندنی زانستی فەرموودە بووە، ئیجازەی زانستی لە گەورە زانایانی ئەم زانستە وەرگرتووە، گوێ بیستی فەرموودە بووە لە میسرو شام، (البرزالی) ئاماژەی بەوە کردوە، کە (کمال الدین) مامۆستای بووە و لیێەوە گوێ بیستی فەرموودە بووە، لە شاری (بعلبك)، ستایشی کردوە کە کەسێکە ژیرو دانابووە و [2]چاودێری هەندێك دیوانەکانی کردووە[3]، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هەریەکە لە (ابن حجر العسقلانی) و(المقریزی) ئاماژە بەوە دەکەن، کە ناوبراو ناوبانگێکی خراپی هەبووە و هۆکارێك بووە بۆ لابردنی باوکی لە پۆستی قازیەتی[4]. لە سالّی(٧٠٣ك/١٣٠٣ز)کۆچی دوای کردووە، لە تەنیشت باوکی لە قاسیون، نێژرا[5].

## ٢_ شرف الدین بن خلکان:

کوڕی قازی(شمس الدین احمد بن محمد بن ابراهیم بن ابی بکر بن خلکان)ە، تەنها

---

بۆبکە.لەسالی(٦٢٩ك/١٢٣١ز) کۆچی دوای کردووە.ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٥، ص ص٣١١_ ٣١٢، ٣١٧.

(١) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٥، ص٣١٧؛موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٣٠٧.

(٢) المقتفي، ج١، ص٢١٩.

(٣) البرزالي، المقتفي، ج١، ص٢١٩؛ابن حجر العسقلاني، الدرر الكامنة، ج٦، ص١٣٧.

(٤)الدرر الكامنة، ج٦، ص١٣٧؛النجوم الزاهرة، ج٨، ص٢١٣.

(٥) البرزالي، المقتفي، ج١، ص٢١٩؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٨، ص٢١٣، بەلام (ابن حجر العسقلاني)،دەلێت سالی(٧١٧ك/١٣١٧ز) مردووە، (الدرر الكامنة، ج٦، ص١٣٧).

(البرزالی) ئاماژەی بەم کە سایەتییە کردووە، کە هاوچەرخی بووە، وادیارە لە نزیکەوە ئاگاداری چالاکیە زانستەکانی بووە و زانیاری وردی لەسەر تۆمارکردووە، کە مێژوو نووسانی تر هەر باسیان نەکردووە، (شرف الدین) لە شەوی یەك شەممەی (١٦)ی (جمادی الاولی)ی ساڵی(٦٥٧ك/١٢٥٨ز) لە قاهیرە

لە دایك بووە، ئیجازەی زانستی لە ژمارەیەك زاناو مامۆستا وەرگرتووە، لە شەوی سێ شەممەی (٤)ی (رجب)ی ساڵی (٧١١ك/١٣١١ز) كۆچی دوای كردوە و لە بناری چیای (قاسیون) لای ئارامگەی باوكی نێژرا[1].سەرەڕای هەموو ئەمانە لە سەرچاوە مێژوویيەكان ئاماژە بە چەندین ئەندامانی بنەماڵەی (بن خلكان)كراوە، لەوانەش (عمربن ابراهیم بن ابی بكر بن خلكان)(م:٦٠٩ك/١٢١٢ز) و(حسین بن ابراهیم بن ابی بكر بن خلكان)(م:٦٢٢ك/١٢٢٥ز) كە هەردووكیان دەبنە مامی (شمس الدین ابن خلكان)، هەردووكیان لە فەقیهە ناسراوەكانی شاری هەولێر بوون. بایەخێكی زۆریان بە زانستەكانی فەرمووده داوه[2]،

هەروەها (جنید بن عیسی بن ابراهیم بن ابی بكر بن خلكان)(م:٦٦٥ك/١٢٦٦ز)یەكێكی تری ئەندامی ماڵباتی خەلەكانییە، لە پێناو زیاتر فێربوونی زانستە ئیسلامیەكان، ڕووی كردووەتە ولاتی شام ومیسر. لەوێدا گوێ بیستی

---

(1) البرزالي، الوفيات، وعلق عليه: ابو يحيى عبدالله الكندري، غراس للنشر والتوزيع، (كويت: ٢٠٠٥م) ص١٥١.

(2) ابن المستوفي، تاريخ اربل، ج١، ص ص٢٨٦، ٣٣٢؛ المنذري، التكملة لوفيات النقلة، مج٢_٣، ص ص١٩١، ٢٥٧؛ الاسنوي، طبقات الشافعية، ج١، ص ص٢٣٧، ٢٣٨ ؛زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص ص٢٤، ٢٥؛محمد علي الصويركي، معجم أعلام الكرد، بنكەی ژین، (سليماني: ٢٠٠٦م)،ص٢٢٥.

فەرمووده بووه[1]، هەروەها قازی(شبلی بن جنید بن ابراهیم بن ابی بکر بن خلکان)(م:٦٥٢ك/١٢٥٥ز) ڕۆڵەیەکی تری ئەم بنەماڵەیە، ڕوویکردە قاهیرە و پاشان دەبێتە قازی لە شارۆچکەیەکی میسری[2]،

بەم شێوەیە خەلەکانییەکان لە بواری دەرس گووتنەوە و دادوەری و ژین نامە نووسی و شەرعناسی دا بالأدەست بوون، سەرەڕای ئەو ڕۆڵە گرنگەی ڕۆڵەکانی ئەم بنەماڵەیە گێراویانە، هێشتا(شمس الدین احمد) لە هەموو ئەوانەی بە ( خەلەکان )ی ناسراون گرنگترە و وای لێ هاتووە، ئەم ناوە تایبەت بێ، بەخۆی و سەرپاکی ئەوانەی بە کاروباری مێژوو و ژیننامەوە خەریکن، جگە لە ( ابن خلكان ) کەسێکی دی بە ناوی (ابن خلكان)ەوە ناناسن[3].

## چوارەم: مردنی:

سەبارەت بە مردنی (ابن خلكان)، (کمال الدین )ی کوڕی بەرواری مردنی باوکی زۆر بە وردی، بۆمان دەگێڕێتەوە، دەڵێت باوکم، لە کاتی بانگی عەسری ڕۆژی شەممەی (٢٦)ی مانگی (رجب)ی ساڵی (٦٨١ك/١٢٨٢ز) لە قوتابخانەی (النجيبية)، لە (دیمەشق)

---

([1]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٥، ص١١١٢؛ علي عادل حسين، اربل في الفترة(٦٣٠ك_٨٧٤ك/١٢٣٣ز_١٤٦٩ز)،اطروحة دكتوراه غير المنشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ٢٠٠٦ز)،ص٢٩٨.

([2]) ابن الصابوني، تكملة إكمال الإكمال في الأنساب والأسماء والألقاب، ص٨٣؛ابن ناصر الدين، توضيح المشتبه في ضبط أسماء الرواة وأنسابهم وألقابهم وكناهم، تحقيق: محمد نعيم العرقسوسي، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٩٣م)، ج٥، ص٢٨٣.

([3]) موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل ل٣٠٧_ ٣٠٨.

كۆچى دواى كرد[١]، ئەو كات تەمەنى حەفتاو سێ سال بوو[٢]، لە ڕۆژى يەك شەممەى (٢٧) هەمان مانگ، لە كاتژمێر دوو، لە مزگەوتى (ديمەشق) نوێژى بە كۆمەڵى لەسەر كرا[٣]. پاشان تەرمەكەى لە بنارى چياى (قاسيون) لە (ديمەشق) نێژرا[٤].

سەرەتاى نەخۆشيەكەشى، لە ڕۆژى سێ شەممەى (٢٢)ى مانگى (رجب)بوو[٥]. (اليونيني م:٧٢٦ك/١٣٢٦ز)ميژوو نووس خودى خۆى، لە كاتى سەرەمەرگى (ابن خلكان) ئامادەببوو، بەم شێوە باسى چۆنيەتى مردنى دەكات:((وآخر ما ختم له به أنه يوم مات توضأ بنفسه لصلاة العصر، وقال: هللوا معي، فهللوا، وخرجت روحه مع آخر التهليلات، فكان آخر كلامه: لا إله إلا الله))[٦].

بە مردنى (ابن خلكان) خەڵك لە هەموو لايەكەوە لە شارى (ديمەشق) غەمباربوون، بە تايبەتى زانايان و ڕۆشنبيران، هەر بۆيە ئامـاژە بـەوە دەكرێ هەرچى كـە سـايەتى

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٩؛الذهبي، العبر في خبر، ج٣، ص٣٤٧؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٥٢؛ المقريزي، المقفي الكبير، ج١، ص٦١٧؛ابن تغري بردي، المنهل الصافي، ج٢، ص٩٢؛ تريفة احمد البرزنجي، اسهامات العلماء الاكراد في بناء الحضارة الاسلامية، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠١٠م) ص١١٢.

([٢]) ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٥٢؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٧، ص٢٥٤.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٩، بقلم ابنه موسى ؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٥٢

([٤]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٩، بقلم ابنه موسى ؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٥٢؛ ابن تغري بردي، المنهل الصافي، ج٢، ص٩٢.

([٥]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٩.

([٦])ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص٢٣٣.

ناوداره ئامادەی مەراسیمی ناشتنی تەرمەکەی بوون[1]، (الاسنوي) لە دوای مردنی هۆنراوەیەکی بۆ وتووە:

ما زلت تلهج بالأموات تكتبها ... حتى رأيتك في الأموات مكتوبا[2].

(هەمیشە دەم ودوی مردوان بووی یاداشتت دەکردن...تاوەکو بینیم خۆت لە نێو مردواندا یاداشت کراوی)

---

([1]) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص٢٣٣.

([2]) طبقات الشافعية، ج١، ص٢٣٩.

**تەوەرەی دووەم:گەشتەکانی بۆ شام ومیسر:**

(ابن خلكان) دوای ئەوەی هەرچی پێویست بوو، بۆ پێگەیاندنی خۆی، لە شاری هەولێر ئەنجامی دا. بە پێویستی زانی گەشتی زانستی بکات بۆ مەڵبەندە زانستییەکانی تری جیهانی ئیسلامی، بۆیە لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٨ز)دا بڕیاریدا بۆ خوێندن هەولێر بە جێبهێڵێ، ئەوکات لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو[١]، خۆی و براکەی بۆی دەرچوون، لەوانەیە بە خەیاڵیدا نەهاتبێ، کە ئیدی جارێکی دی هەولێر نابینێتەوە، جووتە برا، لەو گەشتەدا پشتیان بەدوو شت ئەستور بوو، یەکەمیان: ئەو نامانەی ڕاسپاردەی فەرمانڕەوای هەولێر(مظفرالدين كوكبرى) و دووەمیان: ئەو دۆستە زۆرانەی باوکیان کە لەو شارانەی کە بۆی دەچن هەبون[٢] . کە گەیشتنە موسل ( ابن خلكان ) لە کۆڕی وانەی (كمال الدين موسى بن يونس بن منعة)، ئامادە بووە، کە دۆستایەتی لەگەڵ باوکی زۆر پتەو بووە، چەند جارێك لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی( ٦٢٦ك/١٢٢٨ز) چووەتە خزمەتی، سەرەڕای ئەوەی زۆر سەرسام بوو، بەو زانایە، بەڵام لەبەر نەمانەوەی لەوێ و زوو گەشت کردنی بۆ شام، ناچار بووە، لای نەمێنێتەوە[٣]،

---

([١]) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦؛ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص١٥٠؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٤؛ عبدالسلام محمد هارون، معجم مقيدات ابن خلكان، مكتبة الخانجي، (القاهرة: ١٩٨٧ز) ص٩.

([٢]) زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٤٠؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨١.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣١١؛المقريزي، المقفى الكبير، ج١، ص٦١٥؛ عبد المنعم عبدالحميدسلطان، التاريخ والحضارة الاسلامية، المكتب الجامعي الحديث، (الاسكندرية: ٢٠١٠م) ص٨٩.

بەڵام وەکو وەفایەك بەرامبەر بەم زانایە، بەڵێن بە خۆی دەدات گەر ژنبهێنێت و دواتریش کوڕێکی لێ ببێت، ناوی لێدەنێت (موسی) وەکو وەفا و بەهایەکە بۆ ئەو مامۆستایە بەرزەیە کەپێگەیەکی گەورەی لەناو دەروونی ئەودا هەبوو[1].

ئەگەر چی(ابن خلکان) زۆر لە موسل نەمایەوە، بەڵام سودمەندبوو، لەو تەمەنە سەرەتای ژیانیدا هەرچی سودێکی زانستی تێدابوو بێت و ئەوەی لە زانایانی سەردەمەکە بیستی تۆماری کردووە[2]. پاشان بەرەو حەلەب چوو، لەرێگادا لە ساڵی (٦٢٦ك/١٢٢٨ن) دا بەشاری (حەران)[3]، دا تێپەری[4]، لە ڕۆژی سێشەممەی مانگی (ذي القعدة)یسالی( ٦٢٦ك/١٢٢٨ز گەیشتە شاری(حەلەب) (ابن خلکان ) بەم شارە سەرسام بووە، بە:(( بە دایکە شاری کژی لە زانا وبەکاران ناوی بردووە))[5].

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣١٧؛ احمد خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٥٧.

(2) زبير بلال اسماعيل، حياة ابن خلكان، ص٤١؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨١.

(3) حران، شارێکی بەناوبانگە لە هەرێمی جەزیرەیلە(ديار مضر)،دەکەوێتە سەر رێگای موسل وشام و رۆم، سابیئەی زۆر تیایە، مؤلف مجهول،حدود العالم من المشرق إلى المغرب، محقق ومترج: السيد يوسف الهادي، الدار الثقافية للنشر، (القاهرة: ١٤٢٣)،ص١٦٣؛الادريسي، نزهة المشتاق في اختراق الآفاق، عالم الكتب، (بيروت: ١٤٠٩) ج٢، ص٦٦٤ ؛ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج٢، ص٢٣٥.

(4) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٨١؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٤.

(5)وفيات الاعيان، ج٧، ص٤٨.

دەتوانین بڵێین گرنگترین ماوەی ژیانی (ابن خلكان) لێرەوە دەست پێ دەكات، كە شاری(حەلەب ) لە سایەی قازی و مێژوو نووس (ابن شداد)[١]دا، جموجۆڵێكی گەورەی بۆ خوێندنی زانستی تێكەوتبوو، پاش ئەوەی لە ساڵی (٥٩١ك/١١٩٥ز )بوو بە قازی و ڕاوێژكاری مەلیك (الملك الظاهربن صلاح الدين)، ئینجا زۆر قوتابخانەی دامەزراند و پارە و سامانی بۆ ئەوقاف تەرخان كرد، خانوویەكی بۆ فەرمووده دروستكرد وشارەكە بوو، بە ڕووگەی شەرعزان و فەقێو مەلایان، لە زۆر لاوە بۆی دەهاتن، شوێن و خەرجییان بۆ دابینكرابوو [٢].

خۆشبەختی (ابن خلكان) و براكەی لەوە دابوو، كە (ابن شداد) دۆستی باوكیان بوو( كاتێك هەردووكیان پێكەوە لە موسل خوێنبوویان) جگە لەوەی نامەی ڕاسپاردەی سوڵتان (مظفر الدين كوكبری)یان، بۆ هێنا بوو، كە تێیدا نووسرا بوو: خۆت دەزانی بۆ ئەو دوو كوڕە دەبێ چی بكرێ، ئەمانە برازای منن و برازای تۆن، بۆیە پێویست ناكا چ ڕاسپاردەیەك دووپات بكەمەوە[٣].

---

(١) ابن شداد: ناوی (أبو المحاسن يوسف بن رافع بن تميم بن عتبة الأسدي)،بە (ابن شداد) ناسراوە، لەساڵی (٥٣٩ك/١١٤٤ز) لەموسل لەدایك بووە، لەمنالیەوە قورئانی لەبەركردووە، زانستەكانی حەدیس وریوایەت وشعروهتد خوێندووە، پاشان دەبێتە مامۆستا لە قوتابخانەی (النظامیـة)،پەیوەندیەكی بەهێزی لەگەل سولتان صلاح الدینی هەبووە، لەساڵی (٦٣٢ك/١٢٣٤ز) مردووە. ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٨٤؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢٩٢.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٨٩؛ زبير بلال، حياة ابن خاكان، ص ص٤٣_٤٤؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی كوردد، ل٢٨٢.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٩٠؛ الذهبي، تاريخ الإسلام، ج١٤، ص٩٥؛ صلاح الدين المنجد، أعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، ص ص١٢٥_١٢٦.

ئەویش لەبەر خاتری دۆستایەتی باوکیان و پایەی سەرداری هەولێر، زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردن و لە قوتابخانەکەی خۆی دایمەزراندن، بۆ هەر یەکێکیش مووچەیەکی گەورەی وای بڕییەوە کە قوتابیە تەمەن گەورەکان وەریان دەگرت، هەرچەند ئەوان کەم تەمەنیش بوون [1].لەو کاتە (ابن شداد) لەبەر پیری وازی لە دەرسگوتنە هێنا، بۆیە لە جیاتی خۆی چوار وانە بێژ(معید)ی دانابوو، خۆیشی لە ماڵەوە کۆڕی زانستی سازدەدا. پیاوێکی قسەڕەوان بوو، مەجلیسیسوود بەخش بوو، ئەگەر چی (ابن خلکان) لەبەر جیاوازی تەمەن لای نەخوێند، بەڵام زۆر سوودی لە کۆڕە پڕ لە زانیارییەکانی ئەو وەرگرت. لە وێشەوە زۆر لە پیاوان و زانست و ئەدەبیات و مێژووی ناسی[2](ابن خلکان) زۆر کاریگەر بووە، بە (ابن شداد) بۆیە لە بارەیەوە دەلێت:((وکان شیخنا وأخذنا عنه کثیراً وحصل الانتفاع بصحبته)) [3] .

هەروەها لە ( حەلەب ) بە (ابن الاثیر) [4] ی مێژوونوسیش گەیشت، هەر چەندە لە چاو( ابن شداد) کەمتری دەبیینی، ناوەناوە دەچووە لای. (ابن الاثیر)یش لەبەر ئەو

---

(1) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٧، ص٩٠؛ الذهبی، تاریخ الإسلام، ج١٤، ص٤٩٥؛ زبیر بلال، حیاة ابن خلکان، ص٤٤؛محسن محمد حسین، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٣.

(2) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٧، ص٩٠؛ زبیر بلال، حیاة ابن خلکان، ص٤٤؛محسن محمد حسین، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٣.

(3)وفیات الاعیان، ج٧، ص٨٨؛ صلاح الدین المنجد، أعلام التاریخ والجغرافیا عند العرب، ص١٢٤.

(4) عز الدین ابن الأثیر الجزري: ناوی أبو الحسن علي بن أبي الکرم محمد الشیباني، لەسالی (٥٥٥ك/١١٦٠ز) لە جەزیرە لەدایك بوە، شارەزای زۆر بووە لەحەدیس وئەنساب وتاریخ، لەسالی (٦٢٦ك/١٢٢٨ز) هاتۆتە حەلەب بە میوانی لەمالی (الطواشي شهاب الدین طغریل الخادم أتابك الملك العزیز ابن الملك الظاهر، سەرداری حلب، دەبێت، خاوەنی زۆر کتێبە وەکو (الکامل في التاریخ، أسد الغابة، هتد، لەسالی (٦٣٠ك _١٢٣٢ز) لەموصل مردووە.ابن الاثیر، التاریخ الباهر في الدولة الاتابکیة، تحقیق: عبد القادر احمد، دار الکتب الحدیثة، القاهرة، ص٤٧؛ ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٣٤٨.

ئاشنايەتييەی کە پێشتر لەگەڵ باوکی هەیبوو، چاودێری (ابن خلکان)ی دەکرد و لەگەڵی کۆدەبۆوە، زۆر ستايشی فەزل و ڕەوشت وسادەیی (ابن الاثیر)ی کردووە[1]. سەرەڕای خوێندنی لای ئەو دوو زانا گەورەیە، پەیوەندی بە زانایانی تریش دەکرد، بۆ زیاتر شارەزابوون لە فقهی شافعی، خۆی و براکەی هەندێك دەرسیان لای هاوشار و هاوڕێی باوکیان شێخ (جمال الدين أبي بكر الماهاني م:٦٢٧ك/١٢٢٩ن)هەولێری خوێند، بەڵام ئەو زانایە لە ساڵی (٦٢٧ك/١٢٢٩ن) کۆچی دوای کردووە[2]، لە دوای مردنی ئەو، چۆتە لای (الشيخ نجم الدين ابن الخباز الموصلي)[3] کتێبی (الوجين)ی ئیمامی (الغزالیم:٥٠٥ك/١١١١ن)لای ئەو خوێندووە[4]،

پاشان هەوڵی فێربوونی زانستی زمانەوانی و نەحوی دا. بۆیە هەر لە کۆتایی ساڵی (٦٢٧ك/١٢٢٩ز )چۆتە لای ( موفق الدين ابن يعيش النحوی)(م:٦٤٣ك/١٢٤٥ن) کە بە(ابن الصائغ)ناسراوە، لە دوای نوێژی عەسر لە مزگەوتی حەلەب، چەند دەرسێکی نەحوو فەرموودەی لای خوێندووەودەلێت: (( زۆربەی کتێبیی (اللمع)ی (ابن جني

---

[1] ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٣٤٩؛ صلاح الدين المنجد، أعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، ص١٢٤؛محمد أمين زكی بگ، مشاهير الكردوكردستان، ج١، ص٧٣.

[2] ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٩٠؛خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٥؛زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٤٤؛فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث، ص١٥.

[3] الشيخ نجم الدين: ناوی(محمد بن أبي بكر بن علي)،ناسراوە بووە بە(ابن الخباز الموصلي) لە ساڵی (٥٥٧ك/١١٦١ن) لەدایك بووە، یەکێکە لەزانا گەورەکان، لە حەلەب لەساڵی(٦٣١ك/١٢٣٣ن) مردووە.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٩٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٨.

[4] ابن الشعار، قلائد الجمان، مج١، ص٣٤٦؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص٩٠_٩١؛خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان، ص٢٦.

م:٣٩٢ك/١٠٠١ن لای ئەو خوێندوە، بەڵام لەبەر چەند هۆکارێك نەمتوانی تەواوی بکەم، لە هەمان کاتیشدا گوێم لەو کەسانە دەگرت کە لەوێ موحازەرەیان دەداوە)) [1].

یەکێکی تر لە مامۆستاکانی (ابن خلکان)ی لە مزگەوتی حەلەب (عبداللطیف موفق الدین البغدادی)(م:٦٢٩ك/١٢٣١ن)بووە، لای ئەو گوێی لە حەدیس گرتووە و عەرەبیشی خوێندووە[2] .

(ابن خلکان) تاوەکو ساڵی( ٦٣٢ك/١٢٣٤ز ) لە حەلەب مایەوە، دوای مردنی (ابن شداد)ی مامۆستای لەوساڵەدا، (ابن الخبان)ی شێخیشی لەهەمان ساڵدا کۆچی دوای کرد، (ابن الاثیر)یش پێش تر ساڵی (٦٢٨ك/١٢٣٠ن)حەلەبی بەجێهێشت، هەموو ئەمانە کاریگەری هەبوو لەسەر ڕۆیشتنی لە (حەلەب) بۆ (دیمەشق) بە مەبەستی زیاتر فراوان کردنی بازنەی زانیارییەکانی[3]. لە مانگی شەوالی ساڵی (٦٣٢ك/١٢٣٥ن) گەشتی کرد بۆ دیمەشق[4] .

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٤٨؛ الاسنوى، طبقات الشافعية، ج١، ص٢٣٩.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٦، ص٧٦؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٥؛ فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث الادبيى، ص١٤.بۆ زانیاری لەسەر (عبدالطیف موفق الدین البغدادی) بڕوانە (ابن أبي أصيبعة/ عيون الأنباء في طبقات الأطباء، تحقيق: نزار رضا، دار مكتبة الحياة، بيروت، ص٦٧٦)،(ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٦، ص٧٦).

([3]) خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٦؛ صلاح الدين المنجد، أعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، ص١٢٥؛ زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٤٨.

([4]) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦؛ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤؛زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٤٨؛فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث، ص١٥؛ محسن محمد حسين، قلائد الجمان مصدرا لدراسة جوانب من تاريخ اربيل والكرد، مطبعة الحاج هاشم، (اربيل: ٢٠١٢م)،ص٨٥.

گومانی تێدانیە شاری (دیمەشق ) ئەوكات ئاسۆی فراوانتر بوو لە (حەلەب)، ناوەندی بوژانەوەی زانستی بوو، مەلیكەكانی ئەیوبیی زۆر پالپشتی زانست و زاناكانیان دەكرد، بەسەدان قوتابخانە و هەزاران قوتابی تیابوو، زاناكان لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواوە ڕوویان تێدەكرد، زۆر ڕێزیان لێ دەگیرا و هاوكاری دەكران[1] (ابن خلكان)یش لە (دیمەشق) ساڵێكی تەواو (٦٣٣ك/١٢٣٦ز) مایەوە، لای شێخ (تقی الدین ابن الصلاح) شەهرەزوری خوێندی، كە یەكێك بوو لەزانا گەورەكانی تەفسیر وحەدیس و شەرعناسی (فقه)ی ئەو سەردەمە، بە یەكجار لە چەند قوتابخانەیەك دەرسی دەگوتەوە[2].

لەو ماوەیەدا دەرفەتی بۆ ڕێككەوت بە مەلیك (الكامل )و مەلیك (الاشرف )بگات، ئەم دوو مەلیكە بەیەكەوە لە مەیدانی (الاخضر)ی گەورە دا، یاری (گۆ) و (گۆچان)، یان (پۆلۆ)یان دەكرد[3]، شیاوی باسە كە (ابن خلكان ) هەڵبەستێكی بەسەر (الكامل) گوتووە و تیایدا مەدحوو سەنای كردوە.[4]هەروەها (ابن خلكان) لە (دیمەشق) چاوی بە چەندین زانا و قوتابی كەوتووە و هاوڕێیەتی لە گەڵیان دروستكردووە، بۆ نموونە هەر لەوێ لە ساڵی( ٦٣٣ك/١٢٣٥ز) چاوی كەوت بە (أبو المحاسن الشواء)[5] ی شاعیر، كە زۆر شارەزابووە لە زانستی (العروض والقوافي)[6].

---

([1]) صلاح الدين المنجد، أعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، ص١٢٦.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان،،ج٣، ص٢٤٤؛ الاسنوی، طبقات الشافعية، ج١، ص٢٢٩؛ المقريزی، المقفى الكبير، ج١، ص٦١٥؛ عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، عنى بنشره: محمد علی القره داغي، دار الحرية للطباعة(بغداد: ١٩٨٣م)،ص ص٤٥_٤٦.

([3]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٣؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی كورددا، ل٢٨٥.

([4]) لەم بارەیەوە بڕوانە:ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص ص٣٤٦_٣٤٧؛زبير بلال اسماعيل، حياة ابن خلكان، ٤٩.

([5]) أبو المحاسن الشواء: ناوی(یوسف بن إسماعيل بن علي بن أحمد بن الحسين بن إبراهيم) كەبە(بالشواء) ناسراوە، ئەدیبێكی گەورە بووە، دیوانی شعری هەیە، لەساڵی(٥٦٢ك/١١٦٦ز)

دوای یەك ساڵی تەواو مانەوەی لە (دیمەشق) لە کۆتای ساڵی (٦٣٣ك/١٢٣٧ن) گەڕایەوە بۆ (حەلەب ) دووبارە چاوی بە (ابو المحاسن الشواء)ی شاعیر، کەو تووتەوە و لە نێوانیان گفتوگۆی شیعری هەبووە، ئەم پەیوەندیە بە هێزەی نێوانیان، وای لە (ابن خلكان) کردووە، بە هاوڕێی نزیکە کانی خۆی دابنێت[٢] . هەروەها هەر لە ( حەلەب ) چاوی بە هاوڕێی خوێندنی (عون الدين بن العجمي الحلبي)( م:٦٥٦/١٢٥٨ن) کەوتووە[٣]، هەروەها چاوی بە (ابن الشعار)ی هاوڕێی کەوتووە، کە پێشتر لە هەولێر یەکتریان ناسیبوو، ساڵی( ٦٣٤ك/١٢٣٧ن)شیعری بۆ ووتوە[٤].هەر لەحلب (شيطان الشام) [٥]ی شاعیری ناسیووە، جلی کوردی پۆشیوە، [٦].دیارە کورد بووە.

---

لە دایك بووە، زۆر هاوڕێ (ابن خلكان) ی بووە، ئەم هاوڕێیەتیە بەردەوام بووە، تاوەکو مردنی (الشواء) لەساڵی (٦٣٥ك/١٢٣٧ن) لەحەلەب تەرمەکەی نێژرا.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٣١.

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٣١؛ زبير بلال اسماعيل، حياة ابن خلكان، ص ص٤٨_٤٩؛ فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث، ص ص١٥_١٦.

([٢]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٣٢؛خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٧.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٦، ص٢٥١؛ فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث، ص١٦.

([٤]) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٦؛ زبير بلال اسماعيل، حياة ابن خلكان، ص٥٠.

([٥]) شيطان الشام: ناوی (الشمس أبو العز يوسف بن النفيس الإربلي) بە (شيطان الشام) ناسراوە، لە ساڵی(٥٨٦ك /١١٩٠ن) لەهەولێر لەدایك بووە، شاعیر بووە، زۆر شوێن گەڕاوە، جلی کوردی پۆشیوە، یەکێك بووە لەهاوڕێیەکانی (ابن خلكان) ی لەساڵی(٦٣٨ك/١٢٤٠ن) مردووە.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ٧، ص ص١٥١، ٣٤٠؛ابن حجر العسقلاني، نزهة الألباب في الألقاب، تحقيق: عبد العزيز محمد السديري، مكتبة الرشد،(الرياض: ١٩٨٩م) ج١، ص٤١٣؛ سامي بن خماس الصقار، امارة اربل في العصر العباسي، دار الشواف، (الرياض: ١٩٩٢ن) ص١١٣.

([٦]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص١٥١؛ زبير بلال اسماعيل، حياة ابن خلكان، ص٥١.

بـەم شـێوەیە (ابـن خلكـان) لـە (حەلـەب ) ئاگـاداری زۆر لـە كاروبـارو ڕێووشوێنەكانی بووە، لەوێ بوو، كاتێك كە (الملك العزیز بـن الملـك الظـاهر) لـە سـاڵی ( ٦٣٤ك /١٢٣٧ز )مرد، بە هەڵبەستێكی بەسۆز شیوەنی بۆ نووسی، هەروەكو دەڵێت:

هوى من نظام الماك واسطة العقد ولم يك من صرف المنية من بد[1] .

(لە سیستمی دەسەڵاتبەرزبوویەوە بەهۆی ئەو گرێبەست و پەیمانەوەوە...هیچ ڕێگرێك نیە مردن وەلانێ).

دیارە لەو ماوەیەدا، هاتوو چۆی كردووە، لـە نێـوان (حەلـەب ) و ( دیمەشـق ) هـەر بۆیە لە كـاتی مردنـی (الملـك الكامـل الایـوبی) لـە سـاڵی( ٦٣٥ك/١٢٣٧ز) لـە دیمەشـق ئامادە بووە[2]، دواتر پاش دە ساڵ مانەوەی لە شام چووە بۆ وڵاتی میسر[3] .

چەند هۆكارێك ڕۆڵی هەبووە، لە گەشت كردنی بۆ میسر، لەوانە: بێ هیوا بـوونی لـە گەڕانـەوە بـۆ هـەولێر، بـە هـۆی هێرشـی (مەغۆلـەكان)[4]ەوە بـۆ هـەولێر لـە سـاڵی

---

([1]) ابن الشعار، قلائد الجمان، ج١، ص٣٤٨؛ زبیر بلال اسماعیل، حیاة ابن خلكـان، ص٥٢؛ محسـن محمد حسین، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی كورددا، ل٢٨٤.

([2]) ابن خلكـان، وفیـات الاعیـان، ج٥، ص٩٢؛ خلیـل ابـراهیم جاسـم، منـهج ابـن خلكـان في وفیـات الاعیان، ص٢٧.

([3]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٥، ص٣١٧؛فخرالدین محمد یوسف، منهج البحث، ص١٦.

([4]) مەغۆل: نەتەوەیـەك بـوون هاوسـنوری خەوارزمییـەكان بـوون لەناوچـەكانی ڕۆژهـەڵاتی ئیسـلامیدا لەماوەیەكی زۆر كەم دا توانیان بەسەركردایەتی جنگیزخان، زۆرناوچە داگیربكەن، پاشـان بـەرەو جیهانی ئیسلامی هاتن و، توانیان بەسەركردایەتی هۆلاكوشـاری بەغـدا لـە سـالی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز) داگیربكەن، كوشتاریەكی بێ ئەندازەیان ئەنجام دا، لەداگیركردن بەردەوام بوون تاوەكو لە جـەنگی یەك لاكەرەوەی عین جالوت لەفەلەستین توشی شكسـتی گـەورە بـوون بەرامبـەر بەمەمالیكـەكان. ابوشـامة، الـذیل علـى الروضـتین، ص ص١٩٨، ٢٠٧_٢٠٩؛الـدواداری، كنـز الـدرر،ج٨، ص ص٣٤_٦٠؛ابو الحسن الندوی، غارة التتار على العالم الاسلامی وظهور معجزة الاسلام، ط٢، المختـار الاسلامی، (القاهرة: ١٩٧٣)،ص ص١٨_٢٧؛شیرین بیانی، دین ودولت در ایـران عهـد مغـول، مركـز

(٦٣٤ک/١٢٣٧ن) به هۆی ئەم ڕوداوەوه هەولێر وێرانکراو پیاوه مەزنەکانی تێدا نەما، وەکو (ابن المستوفی) کە لەو ساڵەدا لە هەولێر باریکرد و تامردن لە ساڵی (٦٣٧ک/١٢٤٠ن)دا له موسل مایەوه. هەروەها بەر لەوەش مردنی (مظفر الدين كوكبری) لە ساڵی(٦٣٠ک/١٢٣٢ن) هۆکارێکی تری نەگەڕانەوەی بوو، بۆ شارەکەی خۆی[1]. لەهەمان کاتیشدا بارودۆخی سیاسی شام له ژێر هەڕەشەی مەغۆل دا بوو.( ابن خلكان ) میسری هەلبژارد، چونکه مەیدانێکی تازه بوو، بۆ پەرەپێدانی زانیاری وسوود وەرگرتن له پیاوان و دەزگا زانستیەکانی[2] .

لێرەدا زانیاری جیاواز هەیه، لەسەر کاتی ڕۆیشتنی بۆ میسر، لە سەر گوزشتەی (ابن شداد)دا دەڵێت: له ڕێکەوتی ٢٣ مانگی جمادی ئاخیری ساڵی (٦٣٥ک/١٢٣٨ن)، حەلەبم بەجێهێشت بەره و ولاتی میسر بەرێکەوتم[3]، بەلام لە سەرگوزشتەی (كمال الدين ابن يونس ) دەڵێت: له ساڵی (٦٣٦ک/١٢٣٨ن) گەشتم کرد بۆ ولاتی میسر [4]، هەروەها له سەرگوزشتەی (محمد بن يزيد المبرد)دا، دەڵێت: لە چەند مانگێکی ساڵی (٦٣٦ک/١٢٣٨ن)، لە شاری ئەسکەندەرییه بووم، تیایدا پێنج مانگ مامەوه [5] .

---

نشر دانشطاهی، ض ٤، (تهران: ١٣٨٩) جلد١، ص ص٣٥٤، ٣٥٥؛ جرجي زيدان، تاريخ التمدن الاسلامي،علق عليه: حسين مؤنس ، دار هلال، ١٩٧٣، ج٤، ص ص٢٣٩_٢٤٤.

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص ص١٥١، ١٢٠؛زبير بلال، من مشاهير الكرد (المؤرخ ابن خلكان)،مجلة كاروان، ١٩٨٣، عدد: ٤، ص٩٧؛ محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٥.

([2])محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٥؛زبير بلال، من مشاهير الكرد (المؤرخ ابن خلكان)،مجلة كاروان، عدد: ٤، ص٩٧.

([3]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٠٠؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٧؛صلاح الدين المنجد، أعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، ص١٢٦.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣١٧.

([5]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٣١٨.

لەوانەیـە ماوەیـەکی کـەم لـە ڕۆژهـەلاتی شـام گـەرابێت و [1]، لەسـەرەتای سـاڵی (٦٣٦ك/١٢٣٨ن) گەیشتبێتە قاهیرە، دوای چەند مانگێکی کەم لە مانەوەی لە قـاهیرە، گەشتی بۆ ئەسکەندەرییە کردووە و پێنج مـانگ لـەوێ بـووە، پاشـان گەراوەتـەوە بۆ قاهیرە[2].

کەواتـە دەکـرێ بڵـێین لـە کۆتـای سـاڵی(٦٣٥ك/١٢٣٧ن) گەشـتی بـەرە و میسـر کردووە، بەلام لە ساڵی (٦٣٦ك/١٢٣٨ن) گەیشتۆتە ئەوێ و لە شارەکانی ئەسکەندەریە و قاهیرە ماوەتەوە. لە قاهیرە هەوڵی داوە بە خزمەت زاناو ڕۆشـنبیریبەکان بگـات، لـە گشـت بوارەکانـدا، وەك قوتـابی سـەیری خـۆی دەکـرد، دیـدەنی شـێخ (عبـد العظـیم المنذري)(م:٦٥٦ك/١٢٥٨ن)کرد، کە نووسەری کتێبی(التكملة لوفيـات النقلـة )یـە، بۆتـە قوتـابی لای ئـەو[3]، هـەروەها لـە میسـر (ابـن خلكـان) شەرعناسـی مـالكی (ابـن الحاجب)(م:٦٤٦ك/ ١٢٤٨ن)ناسیوە، کـە زانایـەکی کـورد بـووە، لـە بـواری زمانەوانیـدا سودی لێبینیوە[4].

---

([1]) زبير بلال حياة ابن خلكان، ص٥٥.

([2])خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٢٧؛كارل بروكلمان، مـادة: خلكـان، دائرة المعارف الاسلامية، ص٢٧٥.

([3]) ابـن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٣، ص٨٣؛زبـير بـلال، مـن مشـاهير الكـرد (المـؤرخ ابـن خلكـان)،ص٩٧.هـەروەها (ابـن خلكـان) لەگـەل قوتابیـەکانی((ابـن فـيرة الشـاطبي)،(م: ٥٩٠ك/١١٩٣ن) کۆبۆوە، کە سەرچاوەی زانیاری گرنگ بوولەسەر شێخەکەیان بۆی، جگە لەوەی زۆر لە هاوڕێیەکانی (عبدالله ابـن بـري) (م: ٥٨٢ك/١١٨٦ن)،بینیـوە، کـە ئیمـامێکی بـەناوبانگ بـووە لەنـەحوو زمانـەوانی وریوایـەت، ریوایـەت وئیجـازەی لـەوانیش وەرگـرت هـەروەها بـە هاوڕێیەکانی (ابي طاهر الخشوعي) (م: ٥٩٨ك/١٢٠١ن) گەیشتوە ئیجازەیان پێداوە جگە لەوەی ئیجازەی لەلای کورەکەی (الخشوعي) وەرگرتتووە.ابن خلكان، وفيات الاعيـان،،ج١، ٣، ٤، ص ص٧٢، ١٩٠، ٢٧٠؛ فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث، ص١٦.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٥٠؛زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٥٧.

بە هۆی ئەو هاورێیەتی و پەیوەندیانەوە، کە (ابن خلکان) لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئەدیبەکانی میسر هەیبوو، کاریگەری بە هێزی هەبوو، لەسەر پێگەیشتنی لە بواری ئەدەبیدا.هەر لە ساڵی(٦٣٧ك/١٢٣٩ن) چاوی کەوت بە (بهاء الدین زهیر)(م:٦٥٦ك/١٢٥٨ن) شاعیری گەورەی میسری و کاربەدەستیش بووە لەلای (الملك الصالح ابی الفتح ایوب)، زۆر کاریگەر بووە، بە شیعرەکانی، ئەویش ئیجازەی ڕیوایەتی دیوانەکەی پێدا [1]هەروەها پەیوەندی هاوڕییەتی بەست لەگەڵ (ابن مطروح)ی شاعیر، (م:٦٤٩ك/١٢٥١ن) یەکێك بووە، لەو کاربەدەستانەی لە خزمەتی هەردوو مەلیك (الکامل) و مەلیك (الصالح) کاری کردووە، لە داهاتوودا سوودی لەم پەیوەندییە سیاسیانە بینیوە[2].

ئەو هەموو پەیوەندیانە هەڵێکی باش بوو، بۆ ناساندنی (ابن خلکان) لە نێو دەستەبژێرو چینی ڕۆشنبیرانی میسر، جگە لەوەش ئەو هەموو زانیاری و زانستەی کە پێشتر بەدەستی هێنابوو، بووە هۆی بەدەرکەوتنی لە کۆمەڵگەی ئەوکاتی میسر و دواتر وەرگرتنی چەند پۆستێکی گرنگی ئیداری..

---

([1]) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٢، ص ص٣٣٢، ٣٣٨؛ فخرالدین محمد یوسف، منهج البحث، ص١٦؛محسن محمد حسین، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٥.

([2]) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٦، ص٢٥٨، ٢٦٠؛خلیل ابراهیم جاسم، منهج ابن خلکان في وفیات الاعیان، ص٢٩.هەروەها (ابن خلکان) بەردەوام بوو لەسەر پەیوەندییە ئەدەبیەکانی لەگەل (ابن الیخیمی) (م: ٦٨٥ك/١٢٨٦ن) و(وابا الحسین الجزار) (م: ٦٧٩ك/١٢٨٠ن).ابن خلکان، وفیات الاعیان،، ج١، ص١٩٨، ٣٠٩. فخرالدین محمد یوسف، منهج البحث، ص١٦.

## تەوەرەی سێیەم: پۆستە کارگێڕی و زانستیەکان:

چەند هۆکارو فاکتەرێکی گرنگ هەبوو، بۆ وەرگرتنی پۆستی ئیداری لە میسر لەلایەن (ابن خلکان)ەوە، ئەمەش بە هۆی لێهاتویی زانست و کە سایەتی و زیرەکی خۆی، جگە لەو پەیوەندیە هاوڕێیەتییەی لەگەڵ دوو لە کاربەدەستانی دەولەت، هەیبووە، کە پێشتر ئاماژەمان پێکردووە، ئەوانیش (البهاء زهیر:٦٥٦ك/١٢٥٨ز) و(ابن مطروح:٦٤٩ك/١٢٥١ز) بوون[١]، هەروەها ڕەچەڵەکی (زەرزاری) هۆکارێکی ترە بووە، بۆ دروست بوونی پەیوەندی و دانیشتن لەگەڵ ( قازی قوزاتی) میسر (بدر الدین سنجار)ی کە هاوهۆزی کۆی دەکردنەوە و هەردووکیان لە هۆزی( زەر زاری ) بوون، هەموو ئەمانە بونە هۆی ئەوەی (بدرالدین سنجار)ی پۆستی جێگری( قازی قوزات) بەو بسپێردرێت[٢].

بەم جۆرە (ابن خلکان) بەردەوام بوو، وەك نوێنەرێ قازی (بدرالدین سنجار)ی، بەسەر شاری قاهیرە و هەرچەندە سەرچاوەکان، مێژووەکەیان دیاری نەکردووە[٣]، بەڵام خودی (ابن خلکان) لە ساڵی (٦٤٥ك/١٢٤٧ز) ئاماژەی بەوە کردوە، کە لە (مجلس

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ٦، ص ص٣٣٢، ٢٦٠؛ بەهارعباس جبرائیل، کوردە زرزارییەکان، ل٩٢؛فخرالدين محمد يوسف، منهج البحث ، ص١٧؛ زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٦٢؛ عبدالسلام محمد هارون، معجم مقيدات ابن خلكان، ص٩.

(٢) ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، تحقيق: علي محمد عمر، مكتبة الخانجي، (القاهرة: ١٩٩٨م)،ص ص٢١٠، ٤٧٥ ؛ بەهارعباس جبرائیل، کوردە زرزارییەکان، ل٩٢؛ احمد الخليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٥٨؛ زبير بلال، من مشاهير الكرد (المؤرخ ابن خلكان)،ص٩٧.

(٣) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص١٢٤؛ الاسنوي، طبقات الشافعية، ج١، ص٢٣٩؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٨٩٩؛ المقريزي، المقفى الكبير، ج١، ص٦١٦؛ كارل بركلمان، مادة خلكان، دائرة المعارف الاسلامية، ص٢٧٥؛ عبدالسلام السيد، موسوعة علماء العرب، ص١٦٩.

الحكم) لە قاهیرە خەریکی بەڕێوەبردنی کاری خەلك بووە[1]. دوای شارەزاییەکی باش لە بارەی دادوەری، کرا بە قازی(المحلة)[2]، لەم پۆستە مایەوە تا ساڵی(٦٥٩ك/١٢٦٠ن)[3]، پاش ئەوەی مەمالیکەکان لە شەری ( عین جالوت ) دا لە فەلەستین لە ساڵی (٦٥٨ك/١٢٦٠ن) بەسەر (مەغۆلەکان )دا، زاڵ بوون، پاشان (ملك مظفر قطز)کە قارەمانی ئەم شەرە بوو، کوژرا، ئینجا مەلیك(الظاهر بیبرس) بۆ فەرمانرەوای میسر و شام جێگەی گرتەوە، هەر کە(بیبرس)جڵەوی کاروباری گرتە دەست[4]،

بەم شێوەیە (ابن خلكان) پێی نایە قۆناغێکی تازە، ئەوە بوو ( بیبرس) ئەوی هەڵبژارد بۆ پایەی قازی قوزات (قاضي القضاة) لە ولاتی شام[5]، ئەوکات قازی شام (نجم الدین ابن السنی)بوو، خەلك باسی بەد کرداری وخراپی ئەویان دەکرد، بۆیە لەلایەن (بیبرس) لە کارخرا، پاشان پرس و راوێژی بە میر(جمال الدین أیدغدي العزیزي)ی کرد، کەکێ لە شوێنی ئەو دانێت، ئەویش ئاماژەی بۆ (ابن خلكان)کرد، بۆ

---

([1]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٢، ص٩٩؛هەروەها لەسەرگوزشتەی (ابن الحاجب الكردي)،لەبارەی ئەو دەلێت: ((وجاءني مراراً بسبب أداء شهادات) )،ئەمەش بەلگەیە کەوا (ابن الحاجب) ئەدای شەهاداتی لەبەرامبەری کردووەکەئەو جێگری قازی بووە، کەواتە پێش سالی(٦٤٦ك /١٢٤٨ن) ئەم پۆستەی پێدراوە، جونکە لەم سالەدا ابن الحاجبدەمرێت.وفیات الاعیان، ج٣، ص٢٥٠؛ عبدالسلام السید، موسوعة علماء العرب، ص١٦٩.

([2]) المحلة: شارێکە لە ولاتی میسر، پێ دەوتریت(محلە دقلا) دەکەوێتە نێوان هەردوو شاری قاهیرەو دمیات، چەند شوێنێکی تریش هەیە لەولاتی میسر بەم ناوە، یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٦٣.

([3]) الاسنوی، طبقات الشافعیة، ج١، ص٢٣٩؛المقریزی، المقفی الكبیر، ج١، ص٦١٦؛زبیر بلال، من مشاهیر الكرد(المؤرخ ابن خلكان)،ص٩٧.

([4]) ابو شامة، الذیل علی الروضتین، ص ص٢٠٧، ٢٠٩، ٢١١؛الكتبي،فوات الوفیات،، ج١، ص٢٣٥؛خیر الدین الزركلي، الاعلام، ج٢، ص٧٩.

([5])ابو شامة، الذیل علی الروضتین،ص ٢١٤؛أبو الفداء،المختصر في أخبار البشر، ج٣،ص٢١٣.

شوێن گرەوەی ئەو[1]. فەرماندرا( ابن خلكان) لەگەڵ كاروانی (ملك بيبرس) بۆ شام بەرێ بكەوێ [2]، ئەویش كاغەز و گەلاڵەی كتێبەكەی، كە لە میسرەوە دەستی بە كۆكردنەوەی زانیارییەكانی كردبوو، پێچایەوە و لەگەڵ كاروانی شاهانە كەوتە ڕێ، بەم جۆر وەسفی دەكا:((الركاب العالي المولوي السلطاني المجاهدي)) لە شەوالی (٦٥٩ك/١٢٦١ز)لە قاهیرە دەرچوون و پاش مانگێك گەیشتنە دیمەشق [3]، پاش ئەوەی لە ڕۆژی پێنج شەمەی هەشتی مانگی (ذي الحجة)ی هەمان ساڵ، دامەزرا و كاروباری گرتە دەست[4].

بوو بە حوكمڕان و لێپرسراوی هەموو وڵاتی شام لە (عەریش)ەوە هەتا (سلمییە)ی پێسپێردرا، لەگەڵ سەیركردنی كاروباری ئەوقافی مزگەوت و بیمارستان و قوتابخانەكان و ئەو دەزگایانەی كە لەلایەن قازی پێشووەوە بەڕێوەدەبردران، هەروەها وانەووتنەوەی حەوت قوتابخانەشی خرایە سەرشان.( ابوشامة )ی مێژوو نووس یەكێك بو، لەوانەی لە ئاهەنگی سپاردنی ئەم ئەركانە بە ( ابن خلكان ) ئامادە بوو[5]،

---

(1) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص١٢٤؛زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٦٧.

(2) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص١٢٤؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٢١٣.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٥٨.

(4) ابو شامة، الذيل على الروضتين، ص ص٢١٤_٢١٥؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٥٨.

(5) ابو شامة، الذيل على الروضتين، ص ص٢١٤_٢١٥؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٦٩١.سەبارەت بەو قوتابخانانە ی كە ئەركی سەرپەرشتی كردنیان خرابووە ئەستۆی (ابن خلكان) ی ئەمانە بوون(العذراوية)،(العادلية)،(الناصرية)،(الفلكية) (الركنية)،(الاقبالية)،(البهنسية).ابو شامة، الذيل على الروضتين، ص٢١٥.بۆ زانیاری لەسەر ئەم قوتابخانانە بڕوانە (النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١ص ص ٢٠٩، ٢٧١، ٣٢٧، ١٤٨، ١١٨، ١٦٢.

بەم شێوەیە دەستی بە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی کرد، هات چەند جێگرێکی خۆی لەولآت دانا، لەوانە (علی بن محمود الشهرزوری)(م:٦٧٥ك/١٢٧٦ز) بوو[1]، هەروەها دوو دەرس وێژ(معيد)ی لە قوتابخانەکان داناو خۆی بە حوکمەکان دەچووە و دادوەری لە مەسەلە دادوەرییەکان دەکرد[2].بەهۆی ئەم پۆستە تازەیەوە، هەلی باشی بۆ ڕەخسا، چاوی بە زاناو گەورە پیاوان بکەوێ، کە بۆ ئاشنایەتی و دۆستایەتی ناوە ناوە سەردانی دەکردن (العز الاربلی)[3] یەکێك لەوانە بوو، چووە سەردانیان[4]

دیارە زەحمەت بوو (ابن خلکان) بتوانێ لەو هەموو قوتابخانانە دەرس بلێتەوە، بۆیە چەند کەسێکی زانای باوەڕ پێکراوی هێناو ئەم ئەرکەی پێسپاردن، یەکێك لەوان (ابو شامة)ی مێژوو نووس بوو، کە هاوڕێتییەکی پتەوی لەگەلی هەبوو، تەنانەت (ابن خلکان) ئامادەی یەکەم وانەی (ابو شامة) بووە[5](ابن خلکان) بەتەنیا کارەکانی خۆی

---

([1]) النعیمي، الدارس في تاریخ المدارس، ج١، ص٣٣٦؛زبیر بلال، حیاة ابن خلکان، ص٦٨.

([2]) زبیر بلال، حیاة ابن خلکان، ص٦٩.

([3]) العز الاربلي: ناوی(حسن بن محمد بن أحمد بن نجا الإربلي) نازناوی(عزالدین الضریر) بوولەسالی (٥٨٦ك/١١٩٥ز) لە نصیبین لەدایك بووە، شاعیروفەیلەسوف بووە، کاتێك ابن خلکان چۆتە لای، خۆشحال نەبووە پشت گوێ خستووە، لەسالی (٦٦٠ك/١٢٦٢) لەدیمەشق مردووە. الصفدي، نکث الهمیان في نکت العمیان، علق علیه ووضع حواشیه: مصطفی عبد القادر عطا، دار الکتب العلمیة، (بیروت:٢٠٠٧) ص ص١١٨_١١٩.

([4]) الصفدي، نکث الهمیان في نکت العمیان، ص١١٩.

([5]) ابو شامة، الذیل علی الروضتین، ص٢١٦.الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٨، ص٦٩؛محسن محمد حسین، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٨.تەنانەت هەندی سەرچاوە ئاماژە بەوە دەکەن کەوا (ابو شامة) و(بدرالدین المراغي) کەبە(الطویل) ناسراوە، ئەم دووانە وەکومعید لای دەست بەکاربوونە،، هەردووکیان بەقوتابی (ابن خلکان) یان داناوە.عبدالسلام محمد، معجم مقیدات ابن خلکان، ص٤١٠؛ زبیر بلال، من مشاهیر الکرد(المؤرخ ابن خلکان)،ص٩٧.

ڕادەپەڕاند، تا ساڵی(٦٦٤ك/١٢٦٥ز). هەر وەكو( ابن كثير)ی مێـژوو نـووس لـە بـارەی ئەو دەڵێت:(( ئەو یەكەم كەسێك بوو لەسەردەمی خۆی دا، كـە قـازیقوزاتی لـە هـەموو ڕێڕەوەكانـدا نـوێكردەوە، بۆیـە سـەر قـاڵی حوكمداڕشـتن بـوون لـە دوای ئـەوەی كـە جێگرییان بۆ ئەو دەكرد))[1]. پاشان بە فەرمانی سـوڵتانی مـەملوكی لـەو سـاڵەدا سـێ كەسی تر خرایە پاڵ وەك (قاضی القضاة)بۆ هەرسێ ئایینزاكەی تری (حەنەفی و مالكی وحەنبەلی) بەم جۆرە (ابن خلكان) وەك قازی قازییانی(شافعی) مایەوە و سێ كەسەكەی تریش سەربەست بوون، لە دانانی نوێنەرەكانیان، كە پێشتر نوێنەری ناوبراو بوون[2].

لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، كە (ابن خلكان) هەر لە سـاڵی (٦٥٩ك/١٢٦٠ز)وە تـا ساڵی (٦٦٤ك/١٢٦٥ز) بە تەنها كارەكانی(قاضی القضاة)ی بەڕێوەدەبرد، لەسـەردەمی ئەوداو بۆ یەكەم جارو لە هەمان سـاڵدا (قاضـی القضـاة) لـە ئایینزاكـانی تـر، دانـرا، لـە وڵاتی شام، ساڵی پێشتریش لە میسردا دانرابوو. بەم جۆرە (ابن خلكان )بەردەوام بـوو، لە كارەكەی بۆ ماوەی دەساڵ، تا ساڵی(٦٦٩ك/١٢٧٠ز) لەم پۆستە لابرا[3].

لەو ساڵەدا گەڕایەوە بۆ قاهیرە و لەوێ بـەدوای بـژێوی دەگـەڕا، لـەو ماوەیـەدا لـە گوزەراندن تووشی دەست كورتی بوو، هەر چەندە (الامیر بدرالدین الخازندار) پارەیەكی زۆرو بڕێك گەنمی پێبەخشیوە، بەڵام ئەو ڕەتی كردۆتەوە، لەگەڵ ئەوەش هـەر لەسـەر

---

[1] البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٥٢.

[2] الكتبي،فوات الوفيات، ج١، ص١١٠؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٢٨٦؛زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٧٣.

[3] ابن شداد، تاريخ الملك الظاهر،ص ٢٣٦؛الكتبي،فوات الوفيات، ج١، ص١١٠؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٢٨٦؛ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، تحقيق: الحافظ عبد العليم خان، عالم الكتب(بيروت:١٤٠٧هـ) ج٢، ص١٦٧؛بەهارعباس جبرائيل، كوردە زرزارییەكان، ل٩٢.

تەواو کردنی کتێبەکەی خۆی وخوێندنەوەی کتێبی تازەو وەرگرتنی زانیاری بە سوود بەردەوام بوو[١].

حەوت ساڵی لەوێدا بە سەربرد، پاشان لە ساڵی (٦٧٧ك/١٢٧٨ن) بە فەرمانی سوڵتانی مەملوکی دووبارە گەرایەوە، بۆ پۆستی پێشوو وەك(قاضي القضاة)ی شافیعی ولاتی شام[٢].

لەکاتی گەڕانەوەشی زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ کرا، لەلایەن گەورە میران وسەرجەمی خەلك[٣]. شاعیرەکانیش چەندین هۆنراوەیان هۆنیەوە لە خۆشی گەڕانەوەی، لەوانە (سعدالدين بن مروان الفارقي )(م:٦٩١ك/١٢٩٢ن)دەلێت:

أذَقْتَ الشَّامَ سَبْعَ سِنِينَ جَدْبًاغَدَاةَ هَجَرْتَهُ هَجْرًا جَمِيلًا

فَلَمَّا زُرْتَهُ مِنْ أرْضِ مِصْرَمَدَدْتَ عَلَيْهِ مِنْ كَفَّيْكَ نِيلًا[٤].

(حەوت ساڵە قاتیت بە شام چێشت

دوای کۆچە جوانەکەت لەوێ

وەختێك لەسەر زەمینی میسرەوە سەردانیت کرد

بەدەستەکانت کۆمەکی نیلت بۆ هێنا)

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٦٠٥؛ابن تغرى بردي، المنهل الصافي، ج٢، ص٩٣؛زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٧٧؛محسن محمد حسين، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٨٩.

(٢) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص٢٢٣؛ابن طولون، قضاة دمشق، تحقيق: صلاح الدين المنجد، (دمشق: ١٩٥٦)،ص٧٦؛بەهارعباس جبرائيل، کوردە زرزارییەکان رۆلی رامیاری وشارستانییان، ل٩٢.

(٣) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٥، ص٢٠٨.

(٤) الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص٢٠٢؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٢٧؛الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١١.

هەروەها (الشیخ رشید الدین الفارق)(٦٨٩ك/١٢٩٠ن) وتوویەتی:

أنْت فِي الشَّام مثل يُوسُف فِي مصر وَعِنْدِي أن الْكِرَام جناس

وَلكُل سبعٌ شدادٌ وَبعد السَّبع عامٌ يغاث فِيهِ النَّاس[1].

(تۆ لە شام وەك يوسف وايت كە لە میسر بوو..وە لەلای من پیاوباشان لەیەك نەژاد و رەگەزن

وە بۆ گەلی هەر دوولا (شام و میصری كۆن) حەوت ساڵ نارەحەتی هەیە

وە دوای ئەوحەوت ساڵە ساڵێك دێت خەڵكی هەردوولا فریاد یان بۆدێت)

لە كۆتایی ساڵی (٦٧٨ك/١٢٧٩ن) میر (سنقر الاشقر) [2]دەستی گرت، بەسەر شاری دیمەشق و لە سوڵتان (المنصور قلاون) (٦٧٨_٦٨٩ك/ ١٢٧٩_١٢٩٠ن) هەڵگەڕایەوە، كە لەدوای مردنی سوڵتان( ظاهر بیبرس)(م: ٦٧٦ك/١٢٧٧ن)ی باوكی هاتبووە سەر دەسەلات، تەنانەت ئەوسوڵتانە بۆ جاری دووەم (ابن خلكان)ی گەڕاندەوە بۆ پۆستەكەی خۆی. بەم جۆرە (الاشقر) خۆی بە سوڵتان ڕاگەیاندوو، نازناوی (الملك الكامل)ی لەخۆ نا[3]، بۆ جێگیركردنی دەسەلاتی و بە دەستهێنانی شەرعیەت هەولیدا، پشتگیری فەقیهەكان و قازی و كاربەدەست و كە سایەتیە دیارەكانی دەستەبەر بكا، بۆ

---

(1) الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص٢٠٢.

(2)سنقر الاشقر:(الملكالكامل شمس الدين الصالحي)، یەكێك بوو لەگەورە میرانی میسروشام لەسەردەمی سولتان(الظاهر بیبرس)وسەردەمی كورەكەی(المنصور قلاون)، چەند پۆستێمی وەرگرتووە دواجار دەبێتە جێگری سولتان، لەسالی(٦٩١ك/١٢٩١ن))لەلایەن مەلیك (الاشرف صلاح الدین) دەخنكێنرێت. الیونیني، ذیل مرآة الزمان، ج٤، ص٧؛الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٥، ص٢٩٧؛الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٥، ص٧٢٨.

(3) أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٤، ص ص١٠_١٣؛ابن كثير ، طبقات الشافعيين، ص٩١٩.

ئەم مەبەستەش بانگهێشتی کردن، لەوانەش (قازی قازییان (ابن خلکان) پشتگیری لیّ کردو فتوای بۆدا[١]، ئەویش سەرەڕای شاری دیمەشق، کاروبارە دادوەرییەکانی شاری(حلب)ی خستە ژێر سەرپەرشتی (ابن خلكان)[٢].

بەلاّم دەسەلاتی (الاشقر) زۆری نەخایاندو هەر لە هەمان ساڵدا(المنصور قلاون ) سوپایەکی ناردە سەر دیمەشق و توانی سوپاکەی (الاشقر) بشکێنیّ و دەستی بەسەر شارەکە دابگرێت[٣]، دوای ئەوە (ابن خلكان) لابراو لە بەندیخانە زیندانی کرا [٤]. تەنانەت ئاماژە بەوە دەکریّ سەرەتا سوڵتان ویستوویەتی ( ابن خلكان ) لە سێدارە بدات، چونکە فتوای حەلاّل کردنی خوێنی سوڵتان وسوپای میسری لای (الاشقر)ی دابوو[٥] . هەر لەو ساڵە دا، سوڵتانی مەملوکی لێبوردنێکی گشتی دەرکرد و فەرمانیدا هەموو ئەو کەسانە بگەڕێنەوە سەرکارەکانیان، لەوانەش (ابن خلكان) ئازاد کراو جارێکی تر پۆستەکەی وەرگرتەوە[٦]. (ابن خلكان) هەر لەسەردەمی ئەیوبییەوە لە بواری دادوەری کاری کردووە، شایانی باسە وەك دڵنەوایی و ڕێزلێنانێك دیاری

---

([١])ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٩١٩؛المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج٢، ص١٣٢.

([٢]) العينى، عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، ج٢، ص٢٤١.

([٣]) اليونينى، ذيل مرآة الزمان، ج٣، ص٢٣٥؛الذهبي، العبر، ج٣، ص٣٤٠.

([٤]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٥، ص٢١٣؛ابن كثير، البدايةوالنهاية، ج١٣، ص٣٤٠؛العينى، عقد الجمان، ج٢، ص ص٢٤٤_٢٤٥.

([٥]) النويري، نهاية الأرب في فنون الأدب، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٤ م) ج٣١، ص٤٤٣؛المقريزي، السلوك، ج٢، ص١٣٢؛ المقفى الكبير، ج١، ص٦١٦.

([٦]) الذهبى، تاريخ الاسلام، ج١٥، ص٢١٣؛ابن كثير، البدايةوالنهاية، ج١٣، ص٣٤٠؛ المقريزي، السلوك، ج٢، ص١٣٢.

ڕێزلێنـانی لـه سـوڵتانەوه پێگەیشت، کـه بریتـی بـوو لـه پۆشـاکێك، ئینجـا کەوتـەوه کارکردن[1] .

وادیاره ئـەم پەیوەندییـه توندوتۆڵـەی لـه نێـوان (ابـن خلكـان) و(سـنقر الاشـقر)دا هەبووه، وای لە دەسەلاتدارانی مەملوکی کردووه، کە ئەم هەڵوێسـته وەرگـرن وبەنـدی بکەن، بەڵام دووباره گێڕانەوەی بۆ پۆستەکەی ئەوەمان نیشـاندەدات، کـه ئـەم قازییـه پایه و جێگایەکی بەرزی هەبووه لای سەردارانی ئەم دەولەته[2]، بەڵام ئەم جارەیان زۆر لـه پۆسـتەکەی نـەماوه بـەردەوام بـوو لـه کـارکردن، تـا کۆتـایی مـانگی موحـەرەمی ساڵی(٦٨٠ك/١٢٨١ن) بۆ جاری سێیەم، له پۆستەکەی دوور خرایەوه[3]،

هــەر چــەنده (ابــن حجرالعســقلاني)(م:١٤٤٨/٨٥٢ن) پێــی وایــه هۆکــاری دوورخستنەوەی بەهۆی (کمال الدین)ی کوڕی بوو، هەر وەکو لـه بـارەی ئـەم کەسـەوه دەڵێت:((أنه كان السبب في عزل أبيه لسوء سيرته)).بەڵام ئەمە ناکرێ تەنها هۆکار بێ، بۆ لابردنی، بەڵکوخودی سوڵتان (منصور قلاون) متمانەی نـەما بـوو، بـه (ابـن خلكـان) بۆیه دەکرێ ئەمەی کردبێته پاساوێك بۆ دوور خستنەوەی لە پۆستەکەی[4].

---

(1) العینی، عقد الجمان، ج٢، ص٢٤٥؛بەهارعباس جبرائیل، کورده زرزارییەکان، ل٩٦.

(2) قادرمحمد حسن، اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية، دار سبيريز، (دهوك: ٢٠٠٨م)،ص١٥٠.

(3) الصفدي،الوافي بالوفيـات، ج٧، ص٢٠٣؛ الكـتبي، فـوات الوفيـات، ج١، ص١١١؛ اليـافعي، مـرآة الجنان، ج٤، ص١٤٧؛ابن كثير، البدايةوالنهاية، ج١٣، ص٣٤٣؛ بدر الدين العيني، عقـد الجمـان، ج٢، ص٢٦٦.

(4) الـدرر الكامنــة، ج٦، ص١٣٧.هــەروەها بڕوانــە: ابــن تغــري بــردي، النجـوم الزاهــرة، ج٨، ص٢١٣؛خليل ابراهيم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان.ص٣٤.

ئەویش لەسەر دەرسدان بەردەوام بوو، دیدەنی زاناو نوسەرانی دەکرد، وتوێژی لەگەل دەکردن، دوو قوتابخانەی لە ژێردەستدا مایەوە و بەڕێوەی دەبرد[١]. بێجگە لە شارەزایی لە زانست و ئەدەبیاتدا بۆ خۆشی شاعیرێکی بەتوانابووە وشیعرەکانی باش و پاراون، بۆ نموونە:

يا ربِّ إن العبد يخفي عيبه ... فاستر بحلمك ما بدا من عيبه

ولقد أتاك وما له من شافعٍ ... لذنوبه فاقبل شفاعة شيبه.[٢]

(پەروەردگار بەڕاستی بەندەکەت کە موکوڕی خۆی، دا ئەپۆشێ ...دە تۆش بەحەلیمی خۆت هەرچی کە موکوڕیەکی دەرکەوت داپۆشە

وە ئەوهاتۆتە لات لە حالێکدا هیچ تکاکارێکی نیە...... بۆ تاوانەکانی، دەسا تۆش پیریەکەی بۆ بکە بەتکاکار و تکای وەربگرە)

---

(١) الصفدي،الوافي بالوفيات، ج٧، ص٢٠٣؛ الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١١؛ اليافعي، مرآة الجنان، ج٤، ص١٤٧؛ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٩١٩؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ج١، ص٥٧

(٢) اليونيني ذيل مرآة الزمانج٤، ص١٥٥؛الكتبي،فوات الوفيات، ج١، ص١١٧؛ ابن تغري بردي المنهل الصافي، ج٢، ص٩٤؛ ڕەحیم سورخی، ئینسکلۆپیدیای هەولێر، کەسایەتیە ناودارەکان، گرین گالۆری، ((لوبنان: ٢٠٠٩) ص٤٢٦٩.بۆ زیاتر زانیاری لەسەر شیعرەکانی بروانە(الكتبى/فوات الوفيات، ج١، ص١١٤).

## تەوەرەی چوارەم: بیروڕای مێژوونوسان لەبارەی(ابن خلكان):

لێرەدا بە گرنگ دەزانرێت بیروڕای مێژوونوسان لە بارەیەوە بخرێتە ڕوو، (ابن خلكان) یەكێكە لە كەسایەتییە دیار و ناسراوەكانی ئەوكات، سەرەڕای بایەخ دان و كاركردنی لە چەند بوارێكی ئایینی وەك دادوەری وچاودێری و وانەوتنەوە، شارەزای هەبووە دەربارەی مێژوو ژیننامەی زانایان وخوێنەرێكی باش بووە، شارەزایەكی باشی هەبووە لە شیعر، ئیتر هەموو ئەمانەش وای كردووە كە ببێتە جێگەی سەرنج و بایەخ دانی مێژوو نووسان و لە بارەیەوە بدوێن.

ئەوەتا هەندێك لە مێژوو نووسان زۆر ستایشیان كردووە و پێیاندا هەڵگوتووە، هەروەكو (اليونيني) ستایشێكی زۆری دەكات، بە پێشەوا و شانازی جیهانی داینـاوە و دەڵێت: ((هەموو سیفەتێكی چاكی تیابووە، هاوتای نەبووە، لە گشت بوارەكاندا، جێی متمانەبووە، بۆ هەر شتێك گەیاندبێتی. لە هەموو شتێكی كۆڵیوەتەوە كە یادی كردبێت، لە زانست و ئەدەب و مێژوودا تاك بووە، ورە بەرزی و پاكی دەرونی و ئەزمونی لە یاساكانی حوكم و ڕێزیەوە، لەو بوارانەدا هاوونەی نەبووە، شاعیرانی سەردەمی خۆی شیعری بەرزیان بەسەردا هەڵداوە، ئەویش پاداشتی گرانبەهای داونەتی، كەمو كوڕی پۆشیوە بۆ دەورو بەری، لێبوردە بووە، شێخی پێشەوای حوكمرانی، شانازی جیهان و باشترینی زانایان و تاكی باشەكان و میراتگری پێغەمبەران و پاشماوەی پێشینان و فتوا بێژی هەموو تاقمەكان و خۆری شەریعەت و قازی قازیانی و سەروەری حوكمرانان و پوختەی پادشاهان و كاربەدەستان ئەمیری باوەڕداران)).[1] هەروەها (الذهبي) باسی هەندێك سیفەتی ئەو پیاوە بەڕێزەی كردووە، دەڵێت: ((نان بدە و جوامێرو زیرەك و زانا بووە بە مێژووی خەڵكی))[2].

---

(1) ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص ص٣٨، ١٥٠_ ١٥١.

(2) العبر في خبر، ج٣، ص٣٤٧.

هەندێکی تر لە مێژوو نووسان پایەی زۆر بەرز دەکەنەوە، هەروەکو بەم شێوە وەسفی دەکەن و دەڵێن:((پێشەوایەکی بەرز و هونەر دۆستێکی بلیمەت و شارەزابووە لە رێرەودا، فەتوای جوانی هەبووە، شارەزابووە لە دەربرین، وردەکاربوو، لە زمانی عەرەبیدا مامۆستایەکی بلیمەت بوو، لە شیعر و ئەدەب و مێژوودا، خوێنەوەی زۆر و یادەوەری شرینی وشەرم وحەیای زۆر بووە، خاوەنی سەروەرییەکی گەورە بووە))[1] .

هەروەها وەکو (ابن کثیر)ستایشێکی زۆری دەکات لەو بارەیەوە دەڵێت: (( یەکێکە لە پێشەوا بەرێزەکان و گەورەی زانایان بووە، پێشەنگی سەرکردەکان بوو، هۆنراوەی جوان و ناسکی رێکخستووە، وتارەکانی لە لوتکەی جوانی دابوون))[2] . هەروەها (المقریزی) زۆر ستایشی کردووە، بەو شێوەیە باسی لێوە دەکات ((زاناو ئەدیب دۆست و مێژوو نووسێکی گشتگیر، شیعرێکی زۆر و پەخشانێکی بەرزی هەبووە، دۆستی ئەدەب و ئەدەبناسان بووە، دڵراگیربووە، حەزی لە نیانی و نەرمی بووە، باسی پاشەملەی نەبووە، هەڵی بۆکەس نەڕەخساندووە بۆ باس کردنی پاشەملە، دەرونێکی لێبوردە و خو ڕەوشتێکی بەخشندەیی هەبووە))[3].

هەروەها (ابن تغری بردي) ستایشی کردووە و ڕۆڵی (ابن خلکان)ی لە نێوان ئەدەب و مێژوودا کۆکردۆتەوە:((پێشەواییەکی زاناو بلیمەت و چاپووك بووە، سیفەتی بەرزی زۆر بووە، ئەدەب دۆست وشاعیرو مێژوو نووس بووە)[4]، هەروەها مێژوو نووسێکی تر بە((مێژو نووسی متمانە دار و ئەدیبی شارەزا)) وەسفی دەکات[5].

---

(1) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٤٤٤؛الصفدي،الوافي بالوفيات، ج٧، ص٢٠١؛ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص١٦٨؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ج١، ص٥٨.

(2) البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٥٢؛

http: //www.ahlalhdeeth.com/vb/forum.P١.

(3) المقفى الكبير، ج١، ص٦١٧.

(4)المنهل الصافي، ج٢، ص٩٢.

(5)خير الدين الزركلي، الأعلام، ج١، ص٢٢٠.

## تەوەرەی پێنجەم: لێکۆڵینەوە لەسەر کتێبی (الوفيات الاعيان):

### یەکەم: ناوی کتێبەکە:

(ابن خلكان) خاوەنی چەندین کتێبی مێژووی و زانستی یە، زۆر شتی نووسیوە، بە تایبەتی لە بواری شیعر و پەخشان، هەروەکو (الکتبی والصفدی) دەڵێن: ((کۆمەڵە بەرهەمێکی ئەدەبی هەبووە))[1]، هەروەها دەگوترێت خاوەنی کتێبی(تراجم الشعراء العرب القدامي)یشە[2]، لە لایەکی تریش (ابن خلكان) ژیاننامەی (الملك الظاهر بیبرس)ی لە پەرتوکێکدا نوسیوەتەوە، کە نەژادی بردۆتەوە سەر جەنگیزخانی مەغۆل (م: ٦٢٤ك/١٢٢٧ز) کاتێك (الملك الظاهر)پەرتوکەکەی بینیوە، زۆر دڵی خۆش بووە و وتویەتی ئەمە واتا (ابن خلكان) دەست دەدات بکرێت بە وەزیر[3].

بەلام تاکە بەرهەم کە بەناوی (ابن خلكان ) ماوەتەوە و هەر بەویش ناسراوە، کە گرنگترین شاکارە مێژوویی یە نەمرەکەیەتی، ئەویش بریتییە لە کتێبی (وفيات الأعيان)

---

(1) فوات الوفيات، ج١، ص١١٠؛الوافي بالوفيات، ج٧، ص٢٠٧؛عباس العزاوي، التعريف بالمؤرخين، شركة التجارة في الطباعة المحدودة، (بغداد: ١٩٥٧ز) ص٩٦؛ زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٩٩؛ كاوە فەرەج سەعدون، رۆڵی پرشنگداری زانا موسولمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا، کۆمپانیای چاپ وپەخشی نووسەر، ٢٠٠٧ز، ل٢٠٨.

(2) كارل بروكلمان، تاريخ الأدب العربي، ت: عبدالحليم النجار، ط٥، دار المعارف، قاهرة، ج٦، ص٥٠.

(3) الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١٢؛بەهارعباس جبرائيل، کوردە زرزارييەکان، ل١٣٤.تەنانەت ئاماژە بەوە دەکرێ (الملك الظاهر) وتویەتی داوای بکەن بۆ ئەوەی بیکاتە وەزیر، داوایان کرد، ئەم هەواڵە گەیشتە (بهاء الدين ابن حنا) و هەولیدا لەو مەسەلەیە، تاداواکەی پوچەل کردەوەو لەبیر سولتانی بردەوە، بۆ زانیاری زیاتر بروانە(الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١٢).

کە کتێبێکی مێژوویی هەمەلایەنە[1]، بەسەرهاتی کەسێکی نەنووسیووە ئەگەر مێژووی مردنی نەزانرابێت و ئەم پلانەشی لە زۆر شوێنی کتێبەکەیدا دووپات کردۆتەوە، هەربۆیەش ناوی ناوە (وفيات الاعيان _ مردنی گەورە پیاوان)[2].

## دووەم: پاڵنەری نووسینی کتێبەکە:

پاڵنەری خۆیەتی و کۆمەڵایەتی، هۆکاری دیاری نووسینی ئەم کتێبە بوون. (ابن خلكان) پاڵنەری خۆیەتی دیاریکردووە و حەزی ئەو لەوە بووە، کە زانیاری لەسەر پیاو چاکەکانی پێشوو کۆبکاتەوە، هەروەکو دەڵێت:((دعاني إلى جمعه أني كنت مولعاً بالاطلاع على أخبار المتقدمين من أولي النباهة))[3]، بەلام لە لایەنی کۆمەڵایەتیەوە هەوڵی داوە پێدا ویستەکانی کۆمەڵگا دابین بکات، لە بارەی ژیاننامەی ئەو کە سانەی کە پرسیاریان لە بارەی دەکرێ، کاتێك پرسیاری دەربارەی حەوت شەرعناسی شاری مەدینەی لێکرا، پالی پێوە نا بۆ نووسینەوەی ژیاننامەیان، بۆیە دەستی کرد بە نووسینەوەی کتێبێك لە بواری ژیننامەکاندا، هەروەکو خۆی ئاماژەی بە هۆکاری

---

(1) عباس العزاوي، التعريف بالمؤرخين، ص٩٦؛ زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٩٠؛ احمد خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٥٩؛موحسين محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل ٢٩١؛ کاوە فەرەج سەعدون، رۆلی پرشنگداری زانا موسولمانەکان لە پێشکەوتنە زانستییەکاندا، ل٢٠٨.

(2) الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص٢؛ كارل بروكلمان، تاريخ الأدب العربي، ج٦، ص٥٠؛ موحسين محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورد، ل٢٩١.

(3)وفيات الاعيان، ج١، ص١؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٣٦؛عبدالسلام السيد، موسوعة علماء العرب، ص١٧٠.

کۆمەلایەتی کردوەو دەڵێت: ((ولولا كثرة حاجة فقهاء زماننا إلى معرفتهم لما ذكرتهم))[١].

هەروەها دەکرێ لایەنی سیاسیش هۆکارێکی تری نووسینەوەی ئەم کتێبە بێ، چونکە جیهانی ئیسلامی لە سەدەکانی پێنجەم و شەشەمی کۆچی، ڕووبەڕووی شاڵاوەکانی خاچ دروشمەکان و هێرشەکانی تەتەر بۆ پایتەختی خیلافەت بویەوە، کە بووە هۆی لە ناوچوونی دامەزراوە ئابووری و سیاسیەکان. هەموو ئەم ڕووداوانە ڕەنگدانەوەی لەسەر نووسینەوەی مێژووی ئەوکات دروست کر هەروەکو دەست کرا بە نووسینەوەی سیرەی خاوەندارییەتی، کە جەختی لەسەر سیفەتی ئازایەتی و پاڵەوانی و تێکۆشانی ئەو کەسانە دەکردەوە کە ڕۆڵیان بینی لەبەر گریگردن لە جیهانی ئیسلامی، دژ بە دوژمنەکانی ئیسلام. (ابن شداد) لەسەر ئەم شێوازە کتێبی (المحاسن اليوسفية والنوادر السلطانية) لەسەر( صلاح الدين الايوبي ) نووسی، پاشان ئەم شێوازە لە سەردەمی مەمالیکەکان لەلایەن (ابن خلكان) بەردەوام بوو، ئەویش بە نووسینەوەی ژیننامەی کەسەکان، لە ژێر ناونیشانی (وفيات الاعيان)[٢].

## سێیەم: کات وشوێنی نووسینی کتێبەکە و بەشەکانی:

(ابن خلكان) لە ساڵی (٦٥٤ك/١٢٥٦ز) لە شاری ( قاهیرە ) دەستی کردوە بە نووسینەوەی پەرتوکی (وفيات الاعيان) هەروەکو خۆی ئاماژەی پێکردوەو دەڵێت: ((وكان ترتيبي له في شهور سنة أربع وخمسين وستمائة بالقاهرة المحروسة)) لە پێنج

---

(١)وفيات الاعيان، ج١، ص٢٨٣. هەروەها بڕوانە:خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٣٦.

(٢) ميمونة مير غني حمزة، دراسات في منهجية البحث التاريخي، دار الخليج، (عمان: ٢٠٠٦م) ص٧٢.

بەش پێك هاتووە[١]، ئەو کات تەمەنی (٤٦) ساڵ بوو[٢]، لە نووسینی سەرگوزشتەی (ذو الرمة م:١١٧ك/٧٢٥ن)دا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە، کە بەشی یەکەمی کتێبەکەی لە مانگی (ربیع الأول)ی ساڵی (٦٥٥ك/١٢٥٧ن) لە شاری ( قاهیرە ) تەواو کردووە[٣]. پاشان ژیننامەی دیکەی نووسیووە، کە گەیشتوەتە سەرناوی (یحیی بن خالد بن برمك م:١٩٠ك/٨٠٥ن) گوتوویەتی کە وەك قۆناغی یەکەمین لە ساڵی (٦٥٩ك/١٢٦٠ن) تەواو کردووە. لەوکاتەدا کۆی نووسینەکانی گەیشتۆتە چوار بەش، لەو ساڵەدا بە هۆی سەرقاڵی بەکاری قازییەتی لەوڵاتی شام، ناچار بووە دەست لە نووسین هەڵبگرێت، تا ساڵی(٦٦٩ك/١٢٧٠ن) کە لەم پۆستە لابرا [٤] و هەلی بۆ ڕەخسایەوە و دەستی کردەوە بەنووسین، تا توانی کۆتا بەشیش لە ساڵی (٦٧٢ك/١٢٧٣ن) تەواو بکات.هەروەکو خۆی ئاماژە بە تەواوکردنی کتێبەکەی دەکات لەم بەروارە، :(( في یوم الإثنین العشرین من جمادی الآخرة سنة اثنتین وسبعین وستمائة بالقاهرة المحروسة))[٥]، بەلأم ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە لەم ساڵە بە دواوە ئیدی بە تەواوی دەستی لە نووسین هەڵگرتووە، بەڵکو چەند شتێکی تازەی خستۆتە سەر، دوا شت لە ساڵی(٦٨٠ك/١٢٨١ن)بووە و واتا بەر لە

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص٤٣؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٣٩؛حسام الدين النقشبندي، ما طبع من مخطوطات مصادر التاريخ الاسلامي، ص١١٨؛ عبدالسلام السيد، موسوعة علماء العرب، ص١٦٩.

(٢) رياض مصطفى شاهين، الحركة الصوفية في بلاد الشام خلال الحروب الصليبية، الرسالة ماجستير غير المنشورة مقدمة الى قسم التاريخ بكلية الاداب في الجامعة الاسلامية بغزة، (فلسطين، ٢٠٠٥) م، ص٢٢.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٥٨؛خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٤٠.

(٥) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٥٨؛ بروكلمان، تاريخ الآدب العربي، ج٦، ص٥٠.

مردنی بە سالێك، لەوساڵەوە کە پێش ساڵی (٦٥٥ك/١٢٥٧ن) زانیاری گەلاڵە دەکرد، هەتا دوایی کتێبەکە هەر بەردەوام بە ماددەی تازە پەرەی دەسەند[1].

## چوارەم: پەیرەوی کتێبەکە:

( ابن خلكان ) لە پێشەکی کتێبەکەیدا ئەو پلانەی باسکردووە، کە لە دانانی کتێبەکەدا پەیرەوی کردووە بریتییە لە:

١) بە سەرهاتێکی هیچ کەسێکی نەنووسیوە ئەگەر مێژووی مردنی نەزانرابێت.

٢) ریزبەندی کە سەکانی بە پێی پیتە ئەبجەدییەکانی زمانی عەرەبی رێکخستووە، واتە یەکەم سەرگوزشتەکان بە پیتی (ئەلف) وەکو(ابراهيم) دەست پێ دەکات، پاشان پیتەکانی (ب، ت، پ...هتد) تاوەکو کۆتای دێت.

٣) لەم کتێبەدا باسی هاوەڵ و تابعییەکانی نەکردووە، مەگەر کەمێك نەبێت، هەروەها باسی هیچ لە خەلیفەکانی نەکردووە، تەنها باسی کەمێکیان نەبێ کە پێویست بووە باسی کردووە.

٤) کتێبەکە بۆ باسی چینێکی تایبەتی وەکو زانایان یان شەرعزانان یان وەزیران یان شاعیران یان پەیرەویکەرانی رێبازێکی ناسراوی ئیسلام تەرخان نەکردووە، بەڵکو باسی هەر کەسێکی کردووە کە لەناو خەڵکدا ناوبانگێکی هەبووبێت و پرسیاری زۆری لەبارەوە کرابێت.

٥) هەوڵیداوە بە کورتی و پوختی بەسەرهاتەکان بنوسێت.

٦) دانەر حەزی لەوە بووە، کردەوەی چاکەی خەڵکەکە تۆمار بکات، هەروەها لەگەڵ هەندێ لە هەڵبەست و قسەی سەیر و خۆشی بۆ لابردنی وشکی و بێزاری .

---

[1] زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص٩٩؛موحسين محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٩١.

٧) بەسەرهاتی ئەو كەسانەی كە هاوچەرخی خۆی بوون، یەكسەر لە زمانی خۆیان یان چۆن بەچاو بینوویەتی بەو شێوەیە نوسیووە[1].

لەم كتێبەدا ژیاننامە و سەرگوزشتەی (٨٥٥) كە سایەتی خستۆتە ڕوو، لە قازی وشەرع زان و میرو پادشاو پیاوچاك و شاعیر و مێژوو نووس و وەزیرو زۆر لەوانەی كە بینیوویەتی و زانیاری لیّ وەرگرتون، یان ئەوانەی لە سەردەمی ئەودا ژیاون و نەی بینیون، وەك خۆی ئاماژەی پیّ كردوە، بۆ ئەوەی نەوەی داهاتوو، شارەزای سەردەمی پێش خۆیان بن و باری ژیانیان بزانن[2] .نووسەر لە كتێبەكەی باسێكی زۆری تەرخان كردووە بۆ كە سایەتی و شەرعناسە شافعییەكان، ڕێژەكەیان دەگاتە نزیكەی(٦٠,٧١٪) لێرەدا كاریگەری مەزهەبی شافعی لەسەر (ابن خلكان) بەدی دەكریّ[3]، لەم بوارەشدا دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت، كە (ابن خلكان) هەولێری و كورد و شافعییە.جا ئەگەر دەوری هەولێرییەكان یان كوردەكان، بە تایبەتی شارەزورییەكانی بەرز كردبێت، ئەوەی لە سۆنگەی دەمارگیری نەكردووە، بەڵكو پاڵنەری ئینتیما جاروبار ڕیی هەڵبژاردنی بۆ نیشان كردووە، با مەسەلەی ئینیمای ڕێبازی شافیعی وەربگرین، كە ئەمە ڕێبازی زۆربەی هەرە زۆری كوردە مسولمانەكانە، ئەوكەسە سەر بەو ڕێبازە و لەسەری پەروەردە بووە. پێگەیشتنی لەسەر ئەو ڕێبازە

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص ص٢_ ٣؛ خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٣٧؛ صلاح الدين المنجد، أعلام التاريخ والجغرافيا عند العرب، ص١٣٨؛ زبير بلال، حياة ابن خلكان، ص١٠٢؛

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ج٧، ص ص٢_ ٣، ٢٥٦؛بەهارعباس جبرائيل، كوردە زرزارییەكان، ل١٣٤.

(3) خليل ابراهيم جاسم، منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص٦٨؛ حيدر لشكري، الكرد في المعرفة التاريخية الاسلامية، دار سبيريَز، دهوك، ص٢٥٩.

وای خستۆتە دڵەوە کە ناودارانی ئەو ڕێیازە بەدیاربخات، بەبێ ئەوەی دەمارگیریشیان بۆ بکات [1].

(وفيات الاعيان) کتێبێکی ئەنسکلۆپیدیای گەورەیە، زانیاری زۆری لەسەر پیاوان و ناوداران و ئەدیب و شاعیران و سیاسەتمەداران و شەرعناسەکانی تیایە، کە ڕۆڵیان بینیوە، لە گشت لایەنەکانی ژیانی هزری دا [2].

لەم ڕووەوە ژیاننامەی نزیکەی (٤٠) کە سایەتی کوردی باس کردووە، لە کۆی گشتی کتێبەکەی، کە باس لە (٨٥٥) کە سایەتی دەکات [3]، شیاوی باسە زانیاری زۆر گرنگی تیایە دەربارەی کۆتا ڕۆژگارەکانی فاتمییەکان و لەناوچونیان و دامەزراندنی دەولەتی ئەیوبیەکان، گرنگیەکی زۆری بە پاشاو سەرکردە و میرەکانی ئەیوبیی داوە، چۆنیەتی گەیشتنی بنەماڵەی ئەیوبی کوردی بۆ لوتکەی دەسەلات و ناوبانگیان لە جیهانی ئیسلامیدا بە وردی باس کردووە [4]، کورد بوونی ئەو خانەوادەیەی پشت ڕاست کردۆتەوە [5]، لەو بنەماڵەشدا زیاتر باسی (صلاح الدين الايوبي) ومەلیك (الظاهر صاحب حلب) ومەلیك (الكامل الأيوبي )و مەلیك(الأشرف موسى الأيوبي) و (اسد الدين شێرکۆ)ی کردوە، تەنانەت بۆ بە سەرهاتی (صلاح الدين) (٨٠) لاپەرەی تەرخان کردووە، کە بۆ هیچ کەسێکی دی نیوەی ئەو ژمارەیەشی تەرخان نەکردووە. جگە لەوەش زیاتر لە

---

(١) موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٩٦.

(٢) يسري عبدالغني عبدالله، معجم المؤرخين المسلمين، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩١م) ص٨٠.

(٣) وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٧.لەبارەی کەسایەتیە کوردییەکان بڕوانە هەریەکە لەبەشی دووەم وسێیەم.

(٤) وفيات الاعيان، ج١، ص ص٢٥٤_ ٢٥٥؛ حسام الدين النقشبندي، ما طبع من مخطوطات مصادر التاريخ الاسلامي، ص١١٨.

(٥) وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤١.

(٧٠)جار لە ژیننامەی کە سانی تر باسی کردووە و ناوی هێناوە[١] . لەگەڵ ئەوەشدا تەنها گرنگی بەسەرکردە سیاسی و سەربازییە کوردییەکان نەداوە، بەڵکو ژیاننامەی چەندین زانای کوردی وەکو(ابن صلاح، ابن حاجب النحوی، ضیاء الدین وابن وهتد)باس کردووە، کە ڕۆڵیان بینیوە لە بواری زانستە ئیسلامیەکان و دادوەری دا[٢].بە شێوەیەکی گشتی زیاتر لە (٢٢٣) لاپەرەی بۆ بە سەرهاتی سەرگوزشتەی کوردەکان نووسیوە. (١٨)جار ووشەی(الاكراد)ی بەکارهێناوە، هەروەها (٨)جار ووشەی (الکردي) و (٢)جاریش هەریەکە بۆ هەرسێ ووشەی (أكراد، الكرد، كرديا) بەکارهێناوە[٣]، جگە لەوەی ئاماژەی بەناوی چەندین هۆزی کوردی کردووە، وەکو (الروادية، الهذباني، الماراني، الهکاری، الحميدي، زرزاري)[٤]،

چەند پێوەرێکی داناوە بۆ کوردبوونی ئەو کەسانە، یان ناوی هۆزو نەتەوەی کوردی بە یەکەوە هێناوە، وتویەتی (أنه كان كردياً زرزارياً) [٥]یانیش تەنها ناوی نەتەوەی کوردی هێناوە (وكان كرديا، الكردی)[٦]یاخود گەڕاندویەتییەوە بۆ هۆزێکی کوردی، وەکو (الهکاری، هتد)[٧] یاخود کەسەکانی گەڕاندووەتەوە بۆ شارێکی دیاریکراوی کوردی، وەکو (الإربلي الأصل)[٨].

---

(١) وفيات الاعيان، ج٧، ص١٣٩؛موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٩٣.لەسەر گوزشتەی (صلاح الدين الإربلي/العاضد/الأسعد ابن مماتي/ مظفر الدين كوكبري، هتد) باسی صلاح الدين الايوبيی كردووە.

(٢) وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٢_٢٤٣، ٢٤٨.

(٣) لەم بارەیەوە بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٤).

(٤) لەم بارەیەوە بڕوانە پاشکۆی ژمارە (٥).

(٥) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦.

(٦) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٨.

(٧) وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٠.

(٨) وفيات الاعيان، ج١، ص١٠٨.

هەر وەك چۆن لایەنی جوگرافیاشی فەرامۆش نەكردووە و ئاماژەی بە زۆربەی شارو شارۆچكەو ناوچە كوردنشینەكان كردوە، وەسفێكی جوانی ئەم ناوچانەی كردووە[١]. یەكێكیتر لەو بابەتانەی كە جێی لەسەر وەستانە، بریتییە لە بۆ چوونی (ابن خلكان)، لەسەر ڕەچەڵەكی كورد (ابن خلكان) لە بارەی ئەسل و بنەچەی كورد دا، دەڵێت: (أبو عمر ابن عبد البر) لە كتێبەكەی (الاستيعاب) ئاماژەی بە بنەچەو ئەسلی كورد كردووە، گوایە كوردەكان دەگەڕێنەوە بۆ وەچەی (عمرو مزيقياء)[٢] پاشان چوونەتە خاكی عەجەم و لەوێش ژن و ژنخوازیان كردوەو منداڵیان زۆر بووە، ناونراون بە كور هەربۆیەش هەندێك لە شاعیرەكان لەسەر ئەم قسەی (أبو عمر ابن عبد البر)ئەم شیعرەیان ووتووە:

لعمرك ما الأكراد أبناء فارس ... ولكنه كرد بن عمرو بن عامر[٣].

---

(١) لەم بارەیەوە بڕوانە پاشكۆی ژمارە (٣).

(٢) عمرو مزيقياء: (ابن عامر ماء السماء بن امرىء القيس بن ثعلبة بن مازن بن الأزد)،یەكێك بووە لە پاشایانی یەمەن، دەگەڕێتەوە بۆسەردەمی جاهیلی پێش پێغەمبەر(سەلامی خوای لەسەر بێت)،(الأوس والخزرج) دوو كوری (حارثة بن ثعلبة) بوونەو(حارثة) ش كوری(عمرو مزيقياء) بوونە، واتە هەردوو هۆزی (الأوس والخزرج) نەوەی ئەو بوونە، بە «عمرو» ووتراوە: مزيقياء، لەبرئەوەی هەموو ڕۆژی دووپۆشاكی دەدڕاند حەزی نەدەكرد دووبارە بیانپۆشێتەوە.پاشان لەقەومەكەی جیابۆتەوە هەریەكەیان ڕووی لەناوچەیەك كردووە، ابن قتيبة، المعارف، تحقيق: ثروت عكاشة، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة: ١٩٩٢م)،ص١٤٨؛ المسعودي، التنبيه والإشراف، ص١٥٨؛ابن الأثير، أسد الغابة، دارالفكر(بيروت: ١٩٨٩م)،ج٥، ص١٢٩؛ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٥٠؛محمد طاهر الكردي، التاريخ القويم لمكة وبيت الله الكريم، دار خضر للطباعة (بيروت: ٢٠٠٠م) ج٦، ص٥٥.

(٣) وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٣٥٧_٣٥٨؛ دلشاد حمة صالح البرزنجي، علماء الاكراد ودورهم في النشر العلمي خلال القرنيين الثاني عشر والثالث عشرالهجرييت، رسالة الماجستيرغير منشورة مقدمة الى معهد التاريخ العربي والتراث العلمي، بغداد، ٢٠٠٦)،ص١٣.

لێرەدا ئەوەی جێگای پرسیارە ئەوەیە، کە بۆچی (ابن خلكان) توێژینەوەیەکی وردتر و جیدی لەسەر ڕەچەڵەك و بنەڕەتی کورد نەکردووەو بەسەر نووسینی هاوشێوەی ئەم دێڕە شیعرەدا تێ پەڕیوە، کە کەمترین بەڵگەی مێژوویی پشتگیری ئەم جۆرە بۆ چونانە ناکەن، ئەمە لە کاتێکدا خۆی بەڕەچەڵەك کورد بووە.

## پێنجەم: گرنگی وکاریگەری کتێبی (وفيات الاعيان):

ئەم کتێبە بە یەکێك لە سەرچاوە مێژوویی و ئەدەبیەکان دادەنرێت، بەتایبەتی لە هونەری بەسەرهات و ژیننامە نووسیندا، لە ڕاستیدا ئەم کتێبە گەنجینەیەکی گەورەی لێکۆڵینەوەی مێژوو و ئەدەبیات و کۆمەڵناسی و زمانەوانیە. دانەرەکەی کاکڵێکی پوختی ژیانی زانایانی پێش خۆی لە پیاو و ژن کۆکردۆتەوە، لە لەناوچوون ڕزگاریکردوون.جگە لەوەش ئەوەی خۆی بیستوویەتی و لە هاوچەرخەکانی خۆی زانیووە بەدەست پاکی تۆماری کردووە، ئەوەی دیاریشە ئەو ناودارانەی ئەو لە سەری نووسیون هەمە کارو هەمەجۆرن، لە هەمانکاتدا سەر بە شوێن و سەردەمی جیاوازبوون[١].

گرنگییەکی تری ئەم کتێبە لەوەدایە (ابن خلكان) سەرەڕای ئەوەی خۆی بەشێك بووە لەو ڕووداوانەی کە خۆی لەم کتێبە تۆماریکردووە، هەروەها گوێی لێان گرتووە و پشتی بە چەندین سەرچاوەی پێش خۆی بەستووە، کە هەندێك لەو سەرچاوانە لەناوچوون و نەماون، ڕێژەیەکی زۆر و هەمەجۆری لەسەرچاوە بەکارهێناوە، بۆ نموونە (الكامل في التاريخ/ تهذيب النسب/ تاريخ دولة بني أتابك/ ابن الأثير م:٦٣٠ك/١٢٣٣ز)[٢] و

---

(١) موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٩٣.

(٢) وفيات الاعيان، ج٢، ٥، ص ص١٤٧، ٤٠٠.

(تاريخ بغداد/الخطيب، م:٤٦٣ك/١٠٧٢ن[١]، ( تاريخ إربل/ ابن المستوفي، م:٦٣٧ك/١٢٣٩ن[٢]و ( دعوة الأطباء /ابن بطلان م:٤٥٨ك/١٠٦٥ن[٣]و (لأغاني/أبوالفرج الأصفهاني م: ٣٥٦ك/٩٦٧ن[٤]و (الأنساب/السمعاني م:٥٦٢ ك/١١٦٦م))[٥] و (البلاذري / البلدان م:٢٧٩ ك /٨٩٢م))[٦] و (ابن قتيبة/المعارف م: ٢٧٦ك /٨٨٩م))[٧] و (أبو القاسم المغربي/أدب الخواص م:٤١٨ك/١٠٢٧ن[٨].دەیان سەرچاوەی تری بەکارهێناوە، دەتوانین بڵێین: زۆر بەدەگمەن کتێب هەیە، وەکو ئەم کتێبە بووبێتە جێگەی ڕێزو متمانەی لێکۆڵەرەوە و پەیوەندی دارانی کاروباری مێژوو و بەسەرهاتی ناوداران لە سەردەمە جیاوازەکان[٩]،

تەنانەت بە پلەی یەکەم لە نێو کتێبە (ژیاننامەکان)[١٠]دا دادەنرێت[١]. هەروەها بە گرنگترین سەرچاوە دادەنرێت لە نێو ژیاننامەکان ومێژووی ئەدەبیدا[٢]، چاکترین

---

(١) وفيات الاعيان، ج١، ص٧٣.

(٢) وفيات الاعيان، ج١، ص٣٨.

(٣) وفيات الاعيان، ج١، ص٢٠٥.

(٤) وفيات الاعيان، ج١، ص٤٢.

(٥) وفيات الاعيان، ج١،ص ٣١.

(٦) وفيات الاعيان، ج٦، ص٢٩٩.

(٧) وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٠٦.

(٨) وفيات الاعيانن، ج٣، ص٨٨.بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەو سەرچاوانەی کە(ابن خلكان) بەکاریهێناوە بروانە(خليل ابراهيم جاسم/ منهج ابن خلكان في وفيات الاعيان، ص ص١٤٦_١٧٠).

(٩) موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٩٣.

(١٠) ژیاننامە(تراجم) : کتێبە ژیاننامەکان جۆرێکە لەنوسینەوەی مێژووی، گرنگی گەورەی هەیە بۆ پاراستنی هەواڵ وزانیاری لەبارەی یاوەران وفەرموودەبێژان وشەرعناس وزمانەوانیەکان وپزیشك وشاعیران وگشت ناوداران، زانیاری رۆشنبیری ئیسلامی لە هەموو بوارەکان لەخۆوە دەگرێ، تیایدا لایەنەکانی ژیانیان ودەسکەوتەکانیان وتاوەکو مردنیان باس کراوە، بەهۆی ئەم

بەڵگەش زۆریی و بەربڵاوی کتێبەکەیە لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا، هەروەها بۆتە مایەی بایەخپێدانی زۆر نوسەری دیکە، لەسەر ڕێوشوێنی ئەو کتێبیان داناوە[٣]،

بەم شێوەیە کەلە زانیارییەکان پشتیان پێ بەستووە، بەڕادەیەك بۆتە سەرچاوەیەکی سەرەکی زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکانی دوای خۆی[٤]. یەکێکی تر لە سروشتی ئەو کتێبە ئەوەیە، کە گشتی و هەمە لایەنە، بێگومان ئەم سروشتەش هەندێ جار لای خەڵکی دیکە بەکەم و کورتی دەژمێردرێ، بەڵام لای (ابن خلكان)نا، چونکە زۆر بە وردی زانیارییەکانی پشکنیوە و هەڵی بژاردون وپاڵاوتەی کردوون. هەروەها فراوانی

---

جۆرە نوسینە بۆتە هۆی گەشەسەندنێکی گرنگ لە زانستی مێژوو، جوانترین نموونەش لە جۆری کتێبە ژیاننامەکاندا لەرۆژهەلاتدا، کتێبی (وفيات الاعيان) ی (ابن خلكان) ە، کەبەزمانێکی عەرەبی ڕەوان نووسراوەتەوە.غانم عبدالله خلف، الحياة العلمية في بلاد الشام على عهد الأيوبيين، اطروحة دكتورا غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب_جامعة الموصل، ١٩٩٥م، ص٨٤؛ شحادة علي الناطور، تاريخ صدر الاسلام وفجره، عمان، ص٦٣.

(١) خير الدين الزركلي، الأعلام، ج١ص٢٢٠؛حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام، ط١٤، دار الجيل، (بيروت: ١٩٩٦)،ج١، ص٥٣٠.

(٢) رياض مصطفى شاهين، الحركة الصوفية في بلاد الشام خلال الحروب الصليبية، ص٢٢.

(٣) موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل٢٩٣.

(٤) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ص١٩؛أبو الفداء، المختصر، ج٢، ص٤٩؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٣، ص٩٤٩؛ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج١، ص١٦٠؛اليافعي، مرآة الجنان، ج١، ص١١٧؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج٨، ص٢٤٣؛المقريزي، المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٤١٨م)،ج١، ص١٦٢؛العجمي، ذيل لب اللباب في تحرير الأنساب، تحقيق: شادي بن محمد،مركز النعمان، (اليمن: ٢٠١١ م) ص٢٣٨؛ ابن الغزي، نهر الذهب في تاريخ حلب، دار القلم، (حلب: ١٤١٩ هـ) ج١، ص٢٣١؛عبد القادر بدران،منادمة الأطلال ومسامرة الخيال،تحقيق: زهير الشاويش، المكتب الإسلامي، (بيروت: ١٩٨٥م)،ص٤٠٧ ؛محمد كرد علي، خطط الشام، ط٣، مكتبة النوري، (دمشق: ١٩٨٣م)،، ج١، ص٢٥٥.

ئەو سەرچاوانەی پشتی پیّ بەستوون.بەگشتی کتێبەکە مامناوەندییە و بە ئاسانی دانەی لەبەر دەنووسرێتەوە و دەردەهێنرێ، ڕەوشتی خودی ( ابن خلکان ) لە کتێبەکەدا ڕەنگی داوەتەوە، وەکو بیّ لایەنی و سەر ڕاستی و دادپەروەری و ڕاستگۆیانە باسی کە سانێك دەکات کە لە بڕوا یان ڕیبازی دین یان لە ڕەفتاری ژیان، لەو جیاوازن، هەر وەك (قاضي القضاة) بە گیانی دادوەریی و بیّ لایەنی، مێژوو دەنووسیّ، بۆیە کتێبەکەی سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ ڕاست خوێندنەوەی ناوی کەسان و شوێن و نازناو زاراوە... هتد[١].

بەهۆی گرنگی ئەم کتێبە، ئەو مێژوونووسانەی دوای ئەو هاتوون، سەرەڕای ئەوەی لە زانیارییەکان زۆر شتیان لیّ وەرگرتووە، زۆر ستایشی ئەم کتێبەیان کردووە. هەروەك (ابن كثير) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((خاوەن کتێبێکی مێژوویی بەسودە، کە ناوی ناوە(وفيات الاعيان)، کە زۆرترین داهێنانی تێدایە))[٢]،

هەروەها هەندێك لە مێژوو نوسانی تر دەڵێن:((کتێبی وفيات الاعيان ناوبانگێکی زۆر گەورەی هەیە))[٣]، (خير الدين الزركلي)یش لەم بارەیەوە دەڵێت: ((بە ناوبانگترین کتێبی ژیننامەکانە، چاکترین ڕێکخستنی بۆ کردووە))[٤].

( کتێبی ( وفيات الاعيان ) باشترین هونەری نووسینە، لە جۆری ژیننامەکاندا)[٥]، نوسخەی دەستنووسی ئەم کتێبە بەختەتی دانەرەکەی لە مۆزەخانەی بەریتانیا پارێزراوە، لە ئەڵمانیا بۆ یەکەم جار بەعەرەبی لەچاپ دراوەو پاشان وەرگێڕدراوە بۆ

---

(١) موحسین محەمەد حوسێن، چەند توێژینەوەیەك لە مێژووی کورددا، ل ل٢٩٤_٢٩٥.

(٢) البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٥٢.

(٣) الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص١١٠؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص٢٠١.

(٤) الأعلام، ج١ص٢٢٠.

(٥) اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص١٤٦.

ئینگلیـزی و لـە فەرەنسـا لـە چـاپدراوە. (أظهـر الـدین الاردبیلـي، م:٩٣٠ك/١٥٢٣ن وەریگێڕایەوە بۆ فارسی[١].

بەم شێوەیە ئەم کتێبە ناوبانگێکی جیهانی بەدەست هێناوە، زیاتر لە شـەش جـار پاشکۆو، هەشت جار پوخت کـراوەی (المختصـرات)ی لەلایـەن زانایانـەوە بـۆ دانـراوەو کراوە، هەروەکو (موسی بن احمد)ی کوڕی نووسەر، ئەم کتێبەی پوخت کردۆتەوە و لە چوارچێوەی کتێبکدا بە ناونیشـانی(المختـار مـن وفیـات الاعیـان ) دای ڕشـتووەتەوە و چەندین کەسیش دوای خۆی لاسایی یان کردۆتەوە[٢] .

---

(١) زبیر بلال، حیاة ابن خلكان، ص ص١٠٩_١١١؛کەمال مەزهـەر، مێـژوو، چ٢، چـاپخانەی هیڤـی، (هەولێر: ٢٠٠٨)،ل١١٠؛کاوە فەرەج، ڕۆڵی پرشنگداری زانا موسولمانەکان، ل٢٠٨؛
Ibn Khallikan's Biographical DictionaryK.translat: b mac cuckin de slane(parise).vol: 1.p1

(٢) زبیر بلال، حیاة ابن خلكان، ص١٠٧.کتێبی (وفیات الاعیان) لە لای چەندین کەس تحقیق کراوە کەئەمانەن(محمد محي الدین عبدالحمید، (٦بەشە) /احسان عباس(٨بەشە) / یوسف علي طویل لەگەل مریم قاسم طویل(٦بەشە) ).بۆ زانیاری بڕوانە: منهج ابن خلكان في وفیات الاعیان/جاسم الخلیـل، ص٤٧) (حیـاة ابـن خلكـان/زبیـر بـلال، ص١٠٦).هەرچـەندە بـەدوا داچـوون وگـەرانی زۆرمـان بـۆ کتێبـی (المختـار) ی (موسـی) کـوری (ابـن خلكـان) ی کـرد لەرێگـەی برادەرانـەوە سەردانی وپەیوەندیان بۆ (معهد المخطوطات العربیة) لـە قـاهیرە کـرد کـە گوایـە دەستنووسـی ئەم کتێبە لەم شوێنە هەیە بەلام بەداخەوە لەوێش بوونی نەبوو.

# بەشی دووەم:

## ڕۆڵی سەربازی و سیاسی و کارگێڕی کە سایەتییە کوردییەکان لە چوارچێوەی کتێبی ( وفیات الاعیان ) دا:

تەوەرەی یەکەم : سەڵتەنەت و فەرمانڕەواو میرەکان :

تەوەرەی دووەم: وەزارەت :

تەوەرەی سێیەم : دادوەری :

تەوەرەی چوارەم : سەرکردە سەربازییەکان :

تەوەرەی شەشەم :بەرپرسی قەلا ( دزدار القلعة )

تەوەرەی پێنجەم : پەردەدار:( الحاجب )

## بەشی دووەم: ڕۆڵی سەربازی و سیاسی و کارگێڕی کە سایەتییە کوردییەکان لە چوارچێوەی کتێبی ( وفيات الاعيان) دا:

### تەوەرەی یەکەم : سەڵتەنەت و فەرمانڕەواو میرەکان :

چەمکی سوڵتان زۆر فراوانە، بە واتای بەڵگە دێت[1]، هەروەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێت ﴿لا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطانٍ﴾[2]، (ناشتوانن مەگەر بە دەسەڵاتێك) لێرەدا سوڵتان بەمانای بەڵگە و بورهان دێت[3].

بۆیەش ناونراوە سوڵتان، لەبەرئەوەی بەڵگەیەکی خوایە لەسەر زەوی، هەڵدەستێ بە چەسپاندنی دەسەڵاتی خوای گەورە، پارێزەرو چاودێرە بەسەر بەرژەوندییە گشتیەکاندا، (خالد بن برمك)(١٦٣ك/٧٨٠ز)ی وەزیری ( عەباسیەکان ) یەکەم کەس بوو، نازناوی سوڵتانی پێدرا، پاشان بە میرەکانی (سەلجوقیەکان) دەوترا

---

(١) القلقشندي، صبح الأعشى في صناعة الانشا، تحقيق: يوسف علي الطويل، دار الفكر(دمشق: ١٩٨٧م)،ج٥، ص٤٢٠؛أبو البقاء، الكليات، تحقيق: عدنان درويش ومحمد المصرى، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٩٨م)،ص٤٩٣؛ خالد سليمان حمد، ادارة بلاد الشام في العصر الايوبي، اطروحة دكتوراى غير المنشورة مقدمة الى مجلس كلية الدراسات العليا، الجامعة الاردنية، ١٩٩٧، ص٢٠.

(٢) القران الكريم، سورة الرحمن، آية: ٣٣.

(٣) راغب الأصفهاني،المفردات في غريب القرآن، تحقيق: صفوان عدنان الداودي، دار القلم(دمشق: ١٤١٢م)،ص٤٢٠؛ الفيروزآبادى، بصائر ذوي التمييز في لطائف الكتاب العزيز، تحقيق: محمد علي النجار، لجنة احياءالتراث الاسلامي، (القاهرة: ١٩٩٦)،ج٣، ص٢٤٧؛ محمد ملا صالح، پوختەی تەفسیری قورئان، چ٨، بیروت، ل٥٣٢.ووشەی سولتان(سلطان) لە ڕووی زمانەوانی وزاراوەیی دا وەکو چەمکێکی شەرعی پێناسەی زۆری بۆ کراوە، ڕەهەندی شەرعی و ئیداری هەیە، مەبەستی ئێمە ڕەهەندە ئیداریەکەیە.

سولّتان، بەلاّم لە نێو دەولّەتی( زەنکی ) نازناوی سولّتان تەنها بۆ (نور الدين زنكي)[1] بەکارهات، ئەویش دوای ئەوەی میسری خستە نێو فەرمانڕەواییەکەی، ئینجا پێیان وتووە سولّتان.[2] هەربۆیەش دەلّێن سولّتان، دەبێت زۆر لە ئیدارەی ناوچەو فەرمانڕەوای لە دەست دابێت. هەرچی (صلاح الدين الايوبي)یە، لە سالّی (٥٧٠ك/١١٧٤ز) لەلایەن خیلافەی عەباسی نازناوی سولّتانی موسلّمانانی پێدرا، هەروەها جێگری سولّتانیش لە نێو ئەیوبیەکاندا هەبووە، کاتێك سولّتان (صلاح الدين) لە میسر بۆ شام ڕۆیشت، پاشا (العادل)ی برای وەکو جێگری خۆی لە میسر دانا. سەبارەت بە فەرمانڕەوایی یاخود پاشایەتی (الملك) بەواتای جۆرێك لە جۆرەکانی دەسەلاتداریەتی دێت، کە بریتیە لە دەست بەسەر داگرتن و کۆنترۆل کردنی کاروبارەکان[3].

میرایەتیش لە ئیسلامدا گشتی و تایبەتی لە خۆوە دەگرێت، گشتیەکەش زیاتر مەبەستی ئێمەیە. دەبێتە دوو جۆر، یەکەمیان: میری ڕێپێدراو(امارة الاستكفاء): ئەو میرایەتیە بە ڕەزامەندی خەلیفە دەست بەکاردەبێت، لە ناوچەیەك دەسەلاتی سنورداره، فەرمانڕەوایی دەکات، لە چوارچێوەی ئەو دەسەلاّتەی بۆی دیاریکراوە. دەسەلاتەکەی بریتیە لە ڕێکخستنی سوپاو چاودێری کردنی کاروباری دادگەری و پارێزگاری کردن لە دین و پێشنوێژی کردن، بۆ موسلمانان و کۆکردنەوەی سەرانەو

---

(١) نورالدين محمود زنكي: أبو القاسم محمود بن عماد الدين زنكي بن آق سنقر، بە پاشا(عادل نورالدين) ناسراوه، لە سالی(٥١١ك/١١١٧ز) لەدایك بووه، خاوەنی شام وجەزیره و هتد بووه.کەسێکی دادپەروەرو چاکخوازبووه، حەنەفی مەزهەب بووه، لەسالی(٥٦٩ك/١١٧٣ز) لەقەلای دیمەشق کۆچی دوای کردووه.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص ص١٨٤_١٨٧؛ المقريزي، المواعظ والاعتبار، ج٤، ص١٦٦؛ ابن الغزي، نهر الذهب، ج٣، ص٨٦.

(٢) القلقشندي، صبح الأعشى في صناعة الانشا، ج٥، ص ص٤٢٠_٤٢١ ؛ خالد سليمان حمد، ادارة بلاد الشام في العصر الايوبي، ص ص٢٠_٢١.

(٣)خالد سليمان حمد، ادارة بلاد الشام في العصر الايوبي، ص ص٢٠_٢١.

زەكات و بەرێ كردنی حاجیەكان بۆ حەج و ڕادە دانان و حەد دەركردن، لە تاوانباران و پاراستنی مافی خەڵك. دووەم:میری زاڵ بوو (امارة الاستیلاء): ئەو میرایەتییە بە هێزی خۆی دەست بەسەر هەرێمێك دادەگرێت، خەلیفەش بە ناچاری دانی پێدادەنێت، كاروباری سیاسی و بەڕێوەبردنی پێدەسپێردرێت، دەسەلاتێكی فراوانی هەیە. هەرچی میرایەتی تایبەتە دەسەلاتەكەی كورت كراوەتەوە لە بەڕێوەبردنی سوپاو چاودێری وسەرپەرشتی كردنی خەڵكەكەو پاراستنی ژیانیانە، بۆی نیە دەست بخاتە نێوو كاروباری دادوەری و زەكات وسەرانە[1]. (ابن خلكان ) ئاماژەی بە چەندین كە سایەتی كوردی كردووە، كە ئەم پۆستە گرنگانەیان بەڕێوە بردووە، ئەوانیش:

### ١) نصر الدولة ابن مروان الكردي:

(أبو نصر أحمد بن مروان بن دوستك)ە، كوردی (حەمیدیە)[2]، بە نازناوی (نصر الدولة) ناوبانگی دەركردوە، فەرمانڕەوای (میافارقین) و (دیار بكر)[3] بووە[4]، دوای

---

([1])الماوردي، الأحكام السلطانية والولايات الدينية، دار الحديث، (القاهرة:د.ت)، ص ص٦٢، ٦٤، ٦٦؛ ابو يعلى ابن الفراء، الأحكام السلطانية، تحقيق: محمد حامد، ط٢، دار الكتب العلمية، (بروت: ٢٠٠٠) ص ص٣٦_٣٧؛ القلقشندي، مآثر الإنافة في معالم الخلافة، تحقيق: عبد الستار أحمد فراج، ط٢، مطبعة حكومة الكويت، (كويت: ١٩٨٥)،ج١، ص ص٧٥_٧٦.

([2]) حەمیدی: هۆزێكی كوردییە، بەفراوانی لە نێوان (شهرزور) و(امد) بلاوبونەتەوە، یەكەم ئاماژە بە رۆلی حەمیدی لە گۆرەپانی سیاسیی لە سالی (٢٩٣ك/٩٠٥ز) كراوە، تیایدا بەشداریان لە رێكەوتنامەی نێوان(محمد بن بلال الهذباني) و(حمدانیەكان) كردوەو.رۆلێكی كاریگەریان هەبووە لەبەستنی هاوپەیمانی نێوان حمیدی وهزبانی دژ بە هێزەكانی خیلافەو حەمدانی موسل.كرڤان محمد احمد، الكرد في كتابات المؤرخ ابن الاثير الجزري، اطروحة دكتورای مقدمة الى كلية الاداب، جامعة صلاح الدين،، (اربيل: ٢٠٠٥م)،ص٢٧.

([3]) دیاربكر: ولاتێكی گەورەو فراوانە، شارەكانی (امد) و(میافارقین) و(ماردین) و(سعرت) و هتد لە خۆ دەگرێت. ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج٢، ص٤٩٤؛ المقدسي، أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، دار صادر، بيروت، ص١٣٧؛ اكو برهان محمد، الحياة الثقافة في دياربكر في العصر العباسي، مطبعة الاكاديميا الكوردية، (اربيل: ٢٠١٢)،ص ص٧_١٠.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٧؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٢، ص١٨٠.

کوژرانی (أبو سعید منصور ابن مروان)ی برای لە قەلآی (الهتاخ)[1] لە ساڵی (٤٠١ك/١٠١٠ز) هاتە سەردەسەلات، کەسێکی هیمەت بەرز و سیاسەتمەدارێکی باش بوو (ابن خلکان) ئەڵێت : (الفارقی) لە مێژووەکەی باسی کردووە، ئاماژە بە دادپەروەریی و پێشکەوتوویی سەردەمەکەی دەکات، لە سەردەمی ئەودا هیچ کەسێ زوڵمی لێ نەکراوەو دەست بەسەر ماڵ و موڵکیدا نەگیراوە، تەنها کەسێك نەبێت[2] .

دوای بە دواداچون، بۆ ئەم زانیاریەی کە نووسەر ئاماژەی پێکردووە، لە کتێبی (الفارقی)باس کراوە[3]. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە (ابن خلکان ) بە ئەمانەتەوە نووسینی لەسەرچاوەکانی تری پێش خۆی وەرگرتووە و ئاماژەشی بە ناوی نووسەر و سەرچاوەکان کردووە. بە وتەی (ابن خلکان) لەگەڵ ئەوەی کە ئەم میرە لە خۆشگوزەرانیدا ژیاوە، سەرەڕای ئەوەی زۆر لە نێوو خۆشی و ڕابواردن ژیانی بەسەر دەبرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاداری کاروباری دەوڵەت بوو، کاتەکانی ژیانی دابەش کردبوو لە نێوان گرنگی دان بە خانەوادەکەی و کاروباری دەولەت، گشت نوێژەکانی بەیانی

---

(1) الهتاخ: قەلایەکی توندو سەختە لە دیاربکر نزیك میافارقین.یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٣٩٢؛ابن عبد الحق البغدادي، مراصد الاطلاع على أسماء الأمكنة والبقاع، دار الجيل، (بيروت: ١٤١٢ه)،ج٣، ص١٤٥١.

(2) ابن خلکان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٧؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٥، ص٦٩؛ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٥، ص٢٢٥؛ عبدالرقيب يوسف، دەولەتی دۆستەکی لەکوردستانی ناوەڕاستدا، و: ابوبكر علي، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ١٩٩٨ز، ل٢٧.بۆ زانیاری لە سەر ئەو کەسەی کە سەروەت وسامانی بەسەر داگیراوە بڕوانە.(مێژووی میافارقین وئامەد/ئیبنو ئەرزەقی فارقی، ص٩٤).

(3) ئیبنو ئەرزەقی فارقی، مێژووی میافارقین وئامەد، وە: قادر محەمەد پشدەری وئاکۆ بورهان محەمەد، چاپخانەی منارە(هەولێر: ٢٠٠٧)،ل ل٩٣_٩٤.

لەکاتی خۆی ئەنجام دەدا، منالێکی زۆری لە دوای خۆی بەجێهێشت، زۆر لە شاعیرانی ئەوکات ستایشیان کردووەو لە دیوانەکانیان ناویان هێناوە[١].

بەم شێوەیە لەسەر دەسەلات مایەوە تاوەکو لە ساڵی(٤٥٣ك/١٠٦١ز)کۆچی دوای کردووە، (٧٧)ساڵ ژیاوە[٢]، ماوەی حوکمرانییەکەی هەندێك دەڵێن ( ٥٢ ) ساڵ بووە، هەندێکی تر دەڵێن( ٤٢ ) ساڵ بووە[٣]. تەرمەکەشی هەر لە میافارقین نێژرا، (نظام الدين أبو القاسم نصر)ی کوڕی لە دوای خۆی شوێنی گرتەوە[٤]. لێرەدا نووسەر زیاتر جەختی لەسەر لایەنی دادپەروەری ئەو میرە کوردییە کردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە (ابن خلكان ) وەك کە سایەتییەکی دادپەروەر و بەتوانا لە بەڕێوەبردندا باسی ئەم میرەی کردووە، نابێت ئەوە لە بیرکەین کە یەکێك لە گرنگترین لایەنە نەرێنییەکانی کە سایەتی (نصر الدولة) ڕۆچوون و زیادەڕەوی بووە، لە تەڕەف و

(١)وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٧.هەروەها بڕوانە: ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٥، ص٦٩؛ابن العماد الحنبلي،شذرات الذهب، ج٥، ص٢٢٥ ؛عبدالرقيب يوسف، دەولەتی دۆستەکی لەکوردستانی ناوەراستدا، ل٢٧؛ زرار سديق تۆفيق، چەند لێکۆلینەوەیەك دەربارەی مێژووی کورد لەسەدەکانی ناوەراستدا، ئەکادیمیای کوردی، (هەولێر: ٢٠٠٨ز)،ل١٩.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٨؛ قادر محمد حسن، الامارات الكردية في العهد البويهي، مطبعة رۆژهەلات، (اربيل: ٢٠١١م)،ص٤٩.بەلام بۆچونی تر ئاماژە بەو دەکات (٨٠) سال نيو ژياوە، ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج٨، ص١٧٤، هەروەها (ابن جوزي) ئاماژە بەدوو بۆچون دەکات، هەندێك پێیان وایە (٧٧) سال تەمەنی بووە، هەندێکی تر دەلێن(٨٠) سال تێپەری کردووە.المنتظم، ج١٦، ص٧٠.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٨،ئێمە لەگەڵ بۆچونی یەکەمین ماوەی حوکمڕانییەکەی (٥٢) سال بووە، چونکە لەلایەن ئەم سەرچاوانە ئاماژە بەو ماوەیە کراوە.ابن الجوزي، المنتظم، ج١٦، ص٧١؛ ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج٧، ص١١٦؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٢، ص١٨٠.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٨؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٥، ص٦٩؛ محمد علي الصويركي، مقالات ودراسات كردية، مركز دراسات الكوردية، (سليماني: ٢٠١٠م) ص١٣٣.

خۆشگوزەرانیدا، چونکە بە پێی گێڕانەوەی خودی (ابن خلكان ) خاوەنی( ٣٦٠ ) کەنیزە بووە[١] . ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە چوار ژنی هەبووە، وەك فارقی ئاماژەی پێکردووە[٢].

دەتوانین بڵێین زۆربەی زۆری زانیاریەکانی (ابن خلكان) لە مەڕ ژیننامەی (نصر الدولة) پشتی بە کتێبەکەی (الفارقی) بەستووە، زانیاریەکانی لەو وەرگرتووە، چونکە جگە لەوەی نووسەر لە هەندێ زانیاری ئاماژەی بەوە کردوە لە فارقی وەرگرتووە، لە هەمان کاتدا تاڕادەیەکی زۆر گشت زانیاریەکانی نووسەر لە زانیاریەکانی نێو کتێبەکەی (فارقی)دەچێت[٣].

## ٢) شاهنشاه بن ایوب :

( نور الدولة شاهنشاه بن نجم الدين أيوب بن شاذي بن مروان)، برای سوڵتان (صلاح الدين)ە، گەورەترین کوڕی( نجم الدين ايوب) بوو، باوکی هەریەکە لە (عز الدين فروخ شاه) و (الملك المظفر تقي الدين)ی خاوەنی (حماه) بوو. میر (نور الدولة شاهنشاه)لە شەڕێکدا دژ بە فرەنج لە کاتی گەمارۆدانی (دیمەشق)دا لە مانگی (ربيع الاول)ی ساڵی(٥٤٣ك/١١٤٨ن)کوژرا[٤].

هەرچی (عز الدين أبو سعيد فروخ شاه)کوڕی کە بە مەلیك ( المنصور)ناسرا بوو، پیاوێکی جەوامێر و شکۆدار بووە، سوڵتان (صلاح الدين) لە کاتی گەڕانەوە بۆ میسر کردیە جێنشینی خۆی لە (دیمەشق) زۆر بە جوانی کاروبارەکەی بەڕێوە بردووە،

---

(١) وفيات الاعيان، ج١، ص١٧٧.

(٢) ئیبنو ئەرزەقی فارقی، مێژووی میافارقین وئامەد، ل٩٥.

(٣) ئیبنو ئەرزەقی فارقی، مێژووی میافارقین وئامەد، ل ل٩٥_١٠١.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٥٢؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٤٢؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١١، ص٨٢٦.

تاوەکو لە ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز)مردووە[1].(الملك الأمجد مجد الدين أبو المظفر بهرام شاه بن فروخ شاه) نەوەی (شاهنشاه)ش فەرمانڕەوای( بعلبك)[2] بووە، [3] دوای (الاشرف بن العادل) (بعلبك)ی لێساند، هاتە (دیمەشق) پاشان لەلایەن مەملوکەکەی خۆی لە شەوی چوار شەممەی(١٢)مانگی (شوال)ی ساڵی(٦٢٨ك/١٢٣٠ز)دەکوژرێت[4].

٣) اسد الدين شيركوه:

(أبو الحارث شيركوه بن شاذي بن مروان) نازناوی (الملك المنصور)بوو، مامی سوڵتان (صلاح الدين)ە [5]، هەرچەندە ساڵی لە دایك بوونی دیار نیە و لە سەرچاوەکان

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص ص٤٥٢_٤٥٣؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٦٥؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٦١٧.

(2) بعلبك: يەكێكە لە شارەكانی شام، دار وبێستانی زۆری تيايە.ماوەی نێوان بعلبك و دمشق (١٢) فەرسەخە(٧٢كم).يعقوبي، البلدان، ج١، ص١٦٣؛السيرافي، رحلة السيرافي، المجمع الثقافي، (ابو ظبي: ١٩٩٩)،ص١٠٤.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٥٣؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٨٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٥٣؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٢٤٣؛الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص٢٢٦؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص١٩٠.

(4) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٥٣؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص ص١٤٦_١٤٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٥٣؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٢٤٣؛ الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص٢٢٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص١٩٠.

(5) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٧٩؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣١٩؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، دار الحديث، (القاهرة: ٢٠٠٦م) ج١٥، ص٢٦٤.

ئاماژەی پێنەکراوە، بەڵام (ابن خلکان) دەڵێت: ( نجم الدين )ی برای لە ( دوین)[1] لە دایك بووە، ئەوان واتە (شاذی) و (نجم الدين) و (اسد الدين) لەوێیەوە هاتون[2]، بەم مانایە بێ، دەبێت (اسد الدين)یش لەوێ لە دایك بووبێت. سەبارەت بە گەورە بوونی (شیرکوە) لەگەڵ باوکی و خانەوادەکەی لە (دوین )ەوە کۆچیان کردووە بۆ (تکریت) دوای مردنی باوکیشی هەر لە (تکریت) ماوەتەوە[3]، هاوکاری (نجم الدين)ی برای کردووە لە پاراستن و بەڕێوەبردنی قەلای (تکریت)دا[4] .

(ابن خلکان) دەڵێت (ابن الاثیر) ئاماژەی بەوە کردووە کەوا (اسد الدين) کاربەدەستێکی سەلجوقی کوشتووە، لە کاتێکدا کە بیستویەتی دەست درێژی کردووەتە سەر ئافرەتێك و ئافرەتەکەیش پەنای بۆ (شیرکوە) هێناوە، بۆیە ناچار دەبن (تکریت) جێبێلن بەرەو (موصل)بچن، (عیماد الدين زنکی م:٥٤١ك/١١٤٦ز) سەرداری موصل زۆر بەگەرمی پێشواز لێ کردن و دیاری و بەخششێکی زۆری پێدان، وەك پاداشتێك وابوو، بۆ هەڵوێستی دڵسۆزانەیان کاتێ هەستان بە ڕزگارکردنی لە کوشتن ئەمەش لە کاتێکدا کە (عیمادالدين زنکی) لە نزیك (تکریت) ڕووبەڕووی سەلجوقیەکان بوویەوە و سوپاکەی لە بەرامبەر سوڵتانی سەلجوقیدا تێکشکاو لە کاتی پاشەکشەی

---

(1) دوین: شارێکی گەورەوبەپیت وبەرەکەتە، لەوپەری ئازەربێجانە نزیك تفلیس، لای (اران) و ولاتی(کرج) ە. ابن حوقل، صورة الارض، دار صادر، (بیروت: ١٩٣٨م)،ج٢ص٣٣٧؛ یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٢، ص٤٩١؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٣٩.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ٧، ص ص ١٤٠، ٢٥٥_٢٥٦؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣١٩؛ عطا عبد الرحمن محي الدين، ئەسەدەدین شێرکۆ، نامەیەکە پێشکەشی بەشی مێژووی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتیەکان/زانکۆی سلیمانی کراوە، (سلێمانی: ٢٠٠١ز) ل١١.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٣٩_١٤١؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣١٩؛عطا عبد الرحمن محي الدين، ئەسەدەدین شێرکۆ، ل١٢.

(4) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص٢٥٧؛بهاء الدين الجندي، السلوك في طبقات العلماء والملوك، تحقيق: محمد بن علي، ط٢، مكتبة الارشاد، (صنعاء: ١٩٩٥م)،ج٢، ص٥٢٠.

بۆ موصل بە تکریت تێپەری و گیانی خۆی وسوپاکەی کەوتە دەست (نجم الدین) و(شیرکوە)وە، هەر دوو برا هەستان بە یارمەتی دانی (عیمادالدین) و ڕێگەی ڕزگاربوونیان بۆ ئاسانکرد، تاوەکو گەیشتەوە موصل بەم شێوە (عیماد الدین) چاکەی دانەوەو زەوی پێدان، ماوەیەك پاش ئەوە (عیمادالدین) کوژرا و (نورالدین) کاروباری گرتەدەست (اسد الدین) پەیوەندی بە (نورالدین) کرد، ئەویش بینی کەسێکی ئازاو بوێرە، کردیە پێشەوای سوپاکەی، چەندین ناوچەی خستە ژێردەستی[1]،

دوای بەدوا داچوون بۆ ئەم زانیاریەنەی کە نووسەر ئاماژەی پێکردووە بەوەی لە (ابن الاثیر)ی وەرگرتووە، بە هەمان شێوە (ابن الاثیر) لە کتێبەکەی باسی کردووە[2] .لێرەدا دوو تایبەتمەندی سروشتی تاکی کوردمان بۆ بەدەر دەکەوێ، کە لە زۆر سەرچاوەی تریشدا ئاماژەی پێکراوە، یەکەمیان: ئەوەیە کە زۆر جار کوردەکان بەوە ناسراون کە پابەندبوون بە پاراستنی شەرەف و ناموسەوە، ئەگەرچی ناموسی خەڵکی تریش بێت، وەك چۆن لای (اسد الدین) دیارە. دووەمیان: کوردەکان بونەتە پەناگە بۆ کە سانێك، کە پەنایان بۆیان بردبێت، ئەگەر چی پێشتر دوژمنی یەکتریش بووبن.

(ابن خلكان) باسی ئەو سێ شاڵاوەی کردووە، کە لەیەن (نورالدین زنکی) بەرێکرا بۆ میسر، کە پێشەوای لە شکرەکە بە (اسد الدین) سپێردرابوو، توانی لە شاڵاوی سێیەم سەرکەوتوو بێت و ببێتە وەزیری میسر[3]، ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی (٢٢)ی جەمادی دووەمی ساڵی(٥٦٤ك/١١٦٩ن)ی بۆ یەکجاری چاوی لێکناو مرد، لە شاری (قاهیر)ە

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ٧، ص ص١٤٢_١٤٤، ٢٥٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٨٩؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٣١؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٢٩٠؛صالح قەفتان، مێژووی گەلی کورد، چ٣، ئۆفیستی شڤان، (سلیمانی: ٢٠٠٥ن)،، ل١٧٦.

([2]) ابن الأثير،الكامل في التاريخ، ج٩، ص٣٤٢.

([3])وفيات الاعيان، ج٢، ص ص٤٧٩_٤٨٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣١٩؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٢٩٢.

بەخاك سپێرا، پاش ماوەیەك تەرمەكەی گواسترایەوە بۆ شاری (مدینە)ی پیرۆز لەگەڵ (نجم الدین)ی برای، گواستنەوەكەی بەپێی وەسیەتی خۆی بوو[1]،

(ابن خلكان) دەڵێت:(شیركوە ) دوای خۆی تەنیا كوڕێكی بەجێ هێشتووە ناوی(ناصرالدین محمد)بووە، بە (ملك القاهر) ناسراوە. دوای مردنی (شیركوە) لەمیسر، بە چەند مانگێك (نورالدین) ئەو ناوچانەی كەبە (شیركوە)ی دابوو، دەستی بەسەر داگرتنەوە و لێی وەرگرتەوە. حاڵ بەم شێوەیە مایەوە تاوەكو سوڵتان (صلاح الدین) دەستی بەسەر ( دیمەشق ) داگرت ئەو ناوچانە كەوتنە ژێردەستی (صلاح الدین) و گەڕاندیەوە بۆ (ناصرالدین محمد)ی كوڕی (شیركوە)[2] .

ئەوەی تێبینی دەكرێ، كتێبی ( الكامل في التاریخ) سەرچاوەی سەرەكی نووسەر بووە، لەمەڕ ژیانی (اسد الدین شیركوە) و لێك چوونێكی زۆر هەیە، لە نێوان زانیاریەكانی (ابن الاثیر)و (ابن خلكان)[3].هۆكارەكەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە (ابن الاثیر) نزیكترین كەس بووە، لەو سەردەمەی كە (ابن خلكان ) زانیارییەكانی لێوە وەرگرتووە.

### ٤) توران شاە :

(ابن خلكان) لێكدانەوەی بنەچەی ووشە و ناوی هەندێك كەسانی كردووە، لەوانەش ناوی (توران شاە) كە دەڵێت:(( دوو زاراوەی عەجەمین، (توران) بەمانای

(١) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٢، ص٤٤٨٠ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٣١٩.

(٢)وفیات الاعیان، ج٢، ص٤٤٨٠ عطا عبد الرحمن محي الدین، ئەسەدەدین شێركۆ، ل٢٩.بۆ زانیاری زیاتر لە سەر (اسد الدین) بڕوانە (ئەسەدەدین شێركۆ/عطا عبد الرحمن).

(٣) الكامل في التاریخ، ج٩، ص ص٣٠٥، ٣٢٧، ٣٣٧، ٣٤٢_٣٤٣.

ڕۆژهەلات دێت، (شاه)ش بەمانای پاشا دێت، واتە پاشای ڕۆژهەلات))[1]. پاشا( المعظم شمس الدولة توران شاه بن أيوب بن شاذي بن مروان) بە ( فخر الدين) ناسراو بوو[2]،

برای سوڵتان (صلاح الدين)ە، لەویش بەتەمەن تر بووە، سوڵتان زۆر ڕێزی لێ گرتووە، تەنانەت ئەوی پێش خۆی خستووە، لە ساڵی (٥٦٨ك/١١٧٢ز) (توران شاه) بە فەرمانی (صلاح الدين) بە سوپایەکەوە لە میسر بەرو ولاتی (النوبة)[3] ڕۆیشت، ئازادی کرد، کۆیلەیەکی زۆری دەستکەوت. بەو ولاتە سەرسوڕمان نەبوو، گەڕایەوە بۆ میسر، کەسێکی کارزان و جوامێر بووە، دوای گەیشتنی هەواڵی پیاوێك بەناوی (عبد النبي بن مهدي) کەوا لە (یەمەن) سەری هەڵدایە و بانگەشەی ئەوەی دەکرد، کە هەموو جیهان دێنێتە ژێر فەرمانی خۆی و ناوچەیەکی زۆری لە (یەمەن) دەست بەسەر داگرت، خۆی کردە فەرمانڕەوا، بەرامبەر بەمە سوڵتان (صلاح الدين) سوپایەکی بەهێزی ڕێکخست، سەرکردایەتی ئەم سوپایەشی بە (توران شاه) برای سپارد، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی( ٥٦٩ك/١١٧٣ز ) (توران شاه) بە سوپاوە بەرەو ( یەمەن ) بەڕێکەوت، توانی لەو

[1] وفيات الاعيان، ج١، ص٣٠٩؛هەروەها (اليافعي) هەمان زانیاری (ابن خلكان) ی دووبارە کردۆتەوە بەبێ ئەوەی ئاماژە بە کتێبی نوسەر بکات. مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٢٠٧.

[2] ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص٣٠٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص ص٢٧١_٢٧٢ ؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٦؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٢٧٥؛ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٦، ص٤٢١.

[3] النوبة:ناوچەیەکی فراوانە لە باشوری میسرەوە دەست پێ دەکات وژیان تێدا ئەستەمە، دانیشتوانەکەی نەسارين.ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٣٠٩.

شەڕەدا سەرکەوێت و(عبد النبی) بکوژێت و هەموو ناوچەکان بخاتە ژێرفەرمانڕەوای خۆی[1] .

وادیارە نووسەر لەم زانیاریە پشتی بەهەر یەکە لە کتێبەکانی (ابن الاثیر)و (ابن شداد) بەستووە، چونکە (ابن خلکان) هەمان زانیاری ئەوانی دووبارە کردۆتەوە[2]، تەنها ئەوە نەبێت (ابن الاثیر) ئاماژەیەی بەوە کردوە، هۆکاری ناردنی (توران شاە) بۆ هەریەکە لە ولاتی ( یەمەن ) و (النوبة) لە لایەن (صلاح الدین)ەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ترسی (صلاح الدین) لە مەترسیەکانی (نورالدین زنکی) بۆ سەر دەسەلاتی لە میسر، ئەم دوو ولاتەی وەکو پەناگەیەك بۆ خۆی دابنێت لە کاتی بارودۆخێکی نا هەموار ڕووی تێبکات[3].

لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، نووسەر هەولێداوە خۆی دوورە پەرێز بگرێت، لە باس کردنی ململانی و ناکۆکیەکانی نێوان (صلاح الدین الایوبی) و (نورالدین زەنکی). (ابن خلکان) باس لەوە دەکات کەوا (توران شاە) لەگەڵ ئاووهەوای ( یەمەن ) نەدەگونجا، نامەیەکی بۆ سوڵتان نارد، تا دەستور بدات بگەڕێتەوە بۆ شام، سوڵتانیش لە ڕێگەی نێردراوێك پێی ڕاگەیاند هەر لەوێ بمێنێتەوەو ناوچەیەکی زۆری لە ژێر

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص ص٣٠٦، ٣٠٨؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٥٤؛ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢،ص ص٦١، ٨٠؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٢٧٢؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص ص٣٧٥_٣٧٦ بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هۆکاری ناردنی ئەم شالاوە بۆ یەمەن لەلایەن سولتان صلاح الدین بروانە: فايزة كلاس، الحملة الايوبية الاولى على اليمن، مجلة دراسات تاريخية، كانون الثاني، حزيران، (دمشق: ٢٠١٢)،عدد: ١١٧_١١٨، ص ص٥٢٥_٥٣٩.

(2) الكامل في التاريخ، ج٩، ص ص٣٧٩_٣٨٨؛ النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، ص ص٨٧_٨٨.

(3) الكامل في التاريخ، ج٩، ص٣٧٩.

دەستە، (توران شاه) بە خازندارەکەی دەڵێت هەزار دینارم بۆ بیهێنە، بە نوێنەرەکە و کاربەدەستانی خۆی دەڵێت: بڕۆن لە بازار بەفرم بۆ بکڕن، غولامەکەشی دەڵێت: گەورەم ئێرە ( یەمەن )ە، بەفر لە کوێ دەست دەکەوێت؟ دواتر داوای ئەو جۆرە سەوزەو میوانەی کرد کە لە شام بوونی هەیە، بڕۆن لە بازار بۆم بێنن، نێردراوەکە تووشی سەرسورمان هات، لەوەی کە مەلیك (توران شاه) داوای چی دەکرد، غولامەکەش دەیووت گەورەم لەم جۆرە نیە، لە کوێ بۆت بێنم.! لە کۆتاییدا (توران شاه) بە نێردراوەکەی ڕاگەیاند (ليت شعري ماذا أصنع بهذه الأموال إذا لم أنتفع بها في ملاذي وشهواتي فإن المال. لايؤكل بعينه، بل الفائدة فيه أن يتوصل به الانسان إلى بلوغ أغراضه)، نێردراوەکەش گەڕایەوە بۆ لای سوڵتان و پەیامەکەی گەیاند، سوڵتانیش ڕەزامەندی نیشاندا بگەڕێتەوە[1] .

ئەم بەسەرهاتە زانیاریەکی ناوازەو دەگمەنە، لە سەرچاوە بەردەستەکانی پێش خۆیدا باسنەکراوە و (ابن خلكان)یش ئاماژەی بە سەرچاوەکەی نەکردووە، لەوانەیە خۆی یەکەم کەس بێت ئەم باسەی تۆمار کردبێت، یان لە یەکێك لەو سەرچاوانەوە وەریگرتبێت، کە ئێستا لە ناوچوون. لە دوای خۆشی (الصفدی) ئەم بەسەرهاتەی پشتڕاستکردووەتەوە[2] .

لێرەدا دوو شتمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، لەلایەك (توران شاه) سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ ئاووهەوای (یەمەن) نە دەگونجا، نەشی توانیوە، بەبێ فەرمانی سوڵتان (صلاح الدين) ئەو وڵاتە جێبهێڵێ، زۆر پەیوەست بووە، بە فەرمانەکانی براکەی، لە کاتێکیشدا لە ڕووی تەمەنەوە لە (صلاح الدين) گەورەتربووە، لەلایەکی تریشەوە، جیاوازی ژینگەمان بۆ بەدەردەکەوێ، لە نێوان یەمەنێکی گەرم و وشك، بەرامبەر بە شامێکی کەش و هەواییەکی ساردو پڕ لە سەوزە ومیوەو گیاوبەفر. بەم شێوەیە (توران شاه) لە

---

([1]) وفيات الاعيان، ج١، ص٣٠٨.

([2]) الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٢٧٢.

(یەمەن ) گەڕایەوە لە ساڵی (٥٧١ك/١١٧٥ن) خۆی گەیاندە (دیمەشق) ئەوکاتەش سوڵتان (صلاح الدین) ئابڵوقەی (حلب)ی دەدا، دوای ئابڵوقەکە، سوڵتان هاتەوە بۆ (دیمەشق) لەوێشەوە بۆ وڵاتی میسر بەڕێکەوت، (شمس الدولة توران شاه) وەك جێگیری خۆی لە (دیمەشق) دانا، ماوەیەك لە (دیمەشق) مایەوە پاشان ڕوویکردە میسر[1] (ابن خلکان) ئاماژەی بەوە کردووە، کەوا (ابن شداد) لە کتێبی (سیرە صلاح الدین الایوبی) دەڵێت: (توران شاه) لە ساڵی(٥٧٦ك/١١٨٠) لە ئەسکەندەریە کۆچی دوای کردووە، (ست الشام م:٦١٦ك/١٢١٩ن)ی خوشکی تەرمەکەی بردەوە بۆ دیمەشق و لەوێ ناشتی[2]،

بەڵام ئەم زانیارییە لە کتێبی (النوادرالسلطانیة) یاخود (سیرة صلاح الدین الایوبي) دا نەهاتووە، وەك ئەوەی ( ابن خلکان ) ئاماژەی پێکردووە. لەوانەیە نووسەر سەرچاوەی ئەم زانیاریەی لێ تێك چووبێت و ساڵی مردنی (توران شاه)ی لە (ابن الاثیر)ەوە وەرگرتبێت و لە کاتی نووسیندا (ابن شداد) تێکەڵی لە نێوان ئەم دوو نوسەرە کردبێ، چونکە (ابن الاثیر) ئاماژەی بە هەمان زانیاری (ابن خلکان) کردووە، لە بارەی ساڵ و شوێنی مردنی توران شاهەوە[3].

---

(1) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج١، ص٣٠٦؛ الیافعي، مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ج٣، ص٣٠٦؛ابن تغری بردی، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢٧.

(2)وفیات الاعیان، ج١، ص٣٠٧.هەروەها بڕوانە؛ الیافعي، مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ج٣، ص٣٠٦؛ ابن کثیر، البدایة والنهایة، ج١٢، ص٣٧٦.

(3) الکامل في التاریخ، ج٩، ص٤٥١.

**٥) تاج الملوك بوري :**

نووسەر لێكدانەوەی بۆ ووشەی (بوري) كردووە دەڵێت: ووشەیەكی توركییە، بەزمانی عەربی مانای (ذئب)(گورگ) دەگەیێنێت[1]. (تاج الملوك ابو سعيد بوري بن أيوب بن شاذي بن مروان)نازناوی ( مجد الدين)بوو، برای سوڵتان ( صلاح الدين )ە، بچووك ترین كوڕی(نجم الدين ايوب)بووە، لە ساڵی (٥٥٦ك/١١٦٠ز)لە دایك بووە، خاوەن چاكە و پیاوەتی و بەخشندە بووە، لە كاتی گەمارۆدانی شاری (حلب) لەلایەن (صلاح الدين)ی برای، لە شەڕەكانی ئەویٚ بریندار بووە، كە ڕێكەوتەكەی (٢٦)مانگی (محرم)ساڵی(٥٧٩ك/١١٨٣ز)بوو، هەر بەو هۆیەشەوە لە ڕۆژی هەینی (٢٣)ی (صفر)ی ساڵی(٥٧٩ك/١١٨٣ز)كۆچی دوای كردووە[2].

(ابن خلكان) دەڵێت: (الاصفهانی) لە كتێبی (البرق الشامی) دا ئاماژەی بەوە كردووە، كەوا (صلاح الدين) میواندارى (عماد الدين) فەرمانڕەوای (حلب)ی لە خێمەكەی خۆی كردووە، پێش ئەوەی بچینە ناو شارەكە هەموومان دڵخۆش بووین، بەو ڕێكەوتنە لەناو كۆبوونەوەكەدا، پەردەداری ( صلاح الدين ) بە نهێنی مردنی (تاج ملوك )ی برای پیٚ ڕاگەیاند، (صلاح الدين)یش خۆی تێك نەدا، فەرمانی پێكرد، بەنهێنی بینێژن، تەواو مافی میوانەكەی دا، بەبیٚ ئەوەی هەست بە هیچ شتیٚ بكات، دیارە ( صلاح الدين ) لە دەست دانی برایەكەی خەمبار بووە، هەر بۆیەش دەیووت: (( (حلب) مان بە ئاسانی بەردەست نەكرد، بە كوشتنی تاج ملوك نەبێت))[3] . شیاوی باسە (عماد الدين

---

([1]) وفيات الاعيان، ج١، ص٢٩٢.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص ص٢٩٠، ٢٩٢؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٦٢٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٢٠١؛المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج١، ص١٩٣؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٢، ص٧٧.

([3]) وفيات الاعيان، ج١، ص٢٩٢.

الاصفهانی)یش هەمان شتی گێڕاوەتەوە[1]، ئەمەش ڕوویەكی دیاری بەهێزی كەسایەتی (صلاح الدین)مان پیشان ئەدات وەك پیاوێكی سەربازی بەهێز.

### ٦) الفقيه عيسى الهكاري :

(أبو محمد عيسى بن محمد بن عيسى بن محمد بن أحمد بن يوسف بن القاسم ابن عيسى بن محمد بن القاسم بن محمد بن الحسن بن زيد بن الحسن بن علي بن أبي طالب، رضي الله عنه)(ابن خلكان) سەبارەت بە گەڕاندنەوەی (الفقيه عيسى) بۆ بنەچەی ئیمام(علي بن أبي طالب)خوای لێی ڕازیبێت، دەڵێت:((بەم شێوەیە بنەچەیم لە كوڕی كوڕی براكەی وەرگرتووە. پێی وتراوە (الهكاری)و نازناویشی(ضیاء الدین)بووە))[2]. ئەوەی تێبینی دەكرێ، تەنها (ابن خلكان) بنەچەی (الفقيه عيسى ) گەڕاندۆتەوە بۆ سەر ئیمامی(علی) بەڵام لەسەر چاوەكانی تر بەم شێوەیە ناوو بنەچەی باس كراوە (أبو محمد عيسى بن محمد بن عيسى الهكاری)[3].

هەرچەندە (ابن خلكان) نەیوتوە لە بنەچەدا ئەم كەسایەتیە كوردە، بەڵام لە شوێنی تر دەڵێت: ((هەكارییەكان هۆزێكی كوردن)) [4] . پێم وایە هەر لەبەر ئەوەشە (ابن خلكان) بە پێویستی نەزانیوە لە سەر گوزشتەی بەشێك لە هەكارییەكان بڵێت كوردن، چونكە هەر خۆی بەم دەستەواژەیە كۆتای بە كورد بوونی كەسایەتیە هەكارییەكان هێناوە، كە دەڵێت (هەكارییەكان دەگەڕێنەوە بۆ هۆزێكی كوردی). جگە

---

([1]) البرق الشامي، تحقيق: فالح حسين، مؤسسة عبد الحميد شومان، (عمان: ١٩٨٧م)،ج٥، ص١٣٠.

([2]) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٧.

([3]) المنذري، التكملة لوفيات النقلة، مج١، ص١٢٣؛ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٢١؛علي محمد محمد الصلابي، صلاح الدين الأيوبي، دار المعرفة، (بيروت: ٢٠٠٨م)،ص٣٣٢.

([4]) وفيات الاعيان، ج٣، ص ٣٤٥.

لەوەش لە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان، کەسایەتیە هەکارییەکانییان بە کورد دانراون[١]، تەنانەت (ابن شداد) لە کتێبەکەی ئاماژەی بە ناوی کردووە، بەم شێوەیە (عیسی الکردی الهکاری) هێناویەتی، کە وتاربێژ بووە لە شاری (حلب) هاوسەردەمی (اسد الدین شیرکوه)بووە، هەرچەندە زیاتر زانیاری لەسەری نەداوە[٢].

هەروەها هەندێك لە مێژوو نووسان کاتێك باسی برایەکی(عیسی الهکاری) دەکەن، بەم شێوە ناوی دەهێنن: میر (ابو حفص عمر بن محمد بن عیسی بن محمد بن عیسی بن احمد الکردي) تەنانەت دەڵێن: بە برای (الفقیە عیسی الهکاری) ناسراو بووە، کە بە(مجد الدین)ناسراوە[٣]،ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر کورد بوونی ئەو کەسە. سەبارەت بە ساڵی لە دایکبوونی لەلایەن (ابن خلکان) ئاماژەی پێنەکراوە[٤] .

---

(١) بڕوانە: الیونیني، ذیل مرآة الزمان، ج٢، ص٤٦٢؛الذهبي، معجم الشیوخ الکبیر، تحقیق: محمد الحبیب الهیلة، مکتبة الصدیق، (الطائف: ١٩٨٨)،ج١، ص١٣٦؛ابن قاضي شهبة، تاریخ ابن قاضی شهبة، تحقیق: عدنان درویش، (دمشق: ١٩٩٤) مج٢، ص٣١٧؛ المکي، لحظ الألحاظ بذیل طبقات الحفاظ، دار الکتب العلمیة، (بیروت: ١٩٩٨ز)،ص١٢٣؛ السیوطی، طبقات الحفاظ، دار الکتب العلمیة، (بیروت: ١٤٠٣)،ص٥٢٩؛ السخاوي، الضوء اللامع لأهل القرن التاسع، دار مکتبة الحیاة، بیروت، ج١، ص٢٥١.

(٢) الاعلاق الخطیرة، تحقیق: یحیی زکریا، اشبیلیة، (دمشق: ١٩٩١ز)،ج١، ص١٢١؛ هدار سلیم صالح، الکرد في الاعلاق الخطیرة لابن شداد، الاکادیمیة الکوردیة، (اربیل: ٢٠١٣ز)،ص٢٨١.

(٣) المنذري، التکملة لوفیات النقلة، مج ٣، ص٥١٨؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٤، ص٢٢١؛شوکت عارف، کتاب التکملةللمنذري مصدرا لتاریخ الکرد في العصر الایوبي، مجلة جامعة کرکوك، ٢٠٠٩، عدد: ٢، مج٤، ص١٠٥.

(٤) دیارە ساڵی لەدایك بوونی ڕوون نیە، بۆیە لە سەرچاوەکانی پێش (ابن خلکان) یش ئاماژەی پێنەکراوە، بۆ نموونە(المنذري) لە کتێبەکەی سەرگوزشتەی (عیسی الهکاري) کردووە بەبێ ئەوەی باسی ساڵی لەدایك بوونی بکات.التکملة لوفیات النقلة، مج١، ص١٢٣.

میر (عیسی الهكاري) یەكێك بوو، لە میرەكانی دەولەتی سلاحی، زۆر ڕێزیان لێ گرتووە و خاوەن بۆچوون بووە. لەسەرەتادا خەریكی وانە وتنەوەی زانستە شەرعیەكان بوو، لە قوتابخانەیەكی (حلب) پاشان پەیوەندی بە (اسد الدین شیركوە) كردوە و كردویەتی بە ئیمامی خۆی و پێنج فەرزە نوێژەكانی لە دوای دەكرپاشان بە یاوەری لەگەڵ (اسد الدین)چووە میسر، لە دوای مردنی (اسد الدین)، فەقێ (عیسی الهكاری) لەگەڵ (الطواشي بهاء الدین قراقوش، م:٥٩٧ك/١٢٠٠ز)[1] ڕێكەوت بۆ دانانی (صلاح الدین) بۆ پۆستی وەزارەت لە شوێن مامی. لەكاتی وەرگرتنی ئەم پۆستە لەلایەن (صلاح الدین) زۆر ڕێزی لە (عیسی الهكاری) گرتووەو لە قسەی دەرنەچووە، كەسێكی سودمەندو چاكە خوازبووە، بۆ خەڵك[2].

تەنانەت یەكێك بووە لە گەورەترین هاوڕێیەكانی سوڵتان (صلاح الدین) كاتێك بۆ ماوەی دوو ساڵ لەلایەن فەرەنجەكانەوە زیندانی و دیل دەكرێ، (صلاح الدین) بە (٦٠)هەزار دینار ئازادی دەكات[3].

---

([1]) بۆ زانیاری لەسەر(الطواشي بهاء الدین قراقوش) بڕوانە سەرگوزشتەكەی لە (ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٤، ص٩١).

([2]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٩٧؛ابن الوردي، تاریخ ابن الوردي، ج٢، ص٧٤؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ١١٠؛العلیمي، الأنس الجلیل بتاریخ القدس والخلیل، تحقیق: عدنان یونس، مكتبة دندیس، عمان، ج٢، ص١٤٤بۆ زانیاری لە سەر ڕۆڵی (الفقیە عیسی الهكاری) لە سەر چۆنیەتی ڕازی كردنی سەركردەكانی نوری بۆ دەست بەرداربونیان لە وەرگرتنی پۆستی وەزارەت بۆ صلاح الدین بڕوانە، (ابن الاثیر، التاریخ الباهر في الدولة الاتابكیة، ص١٤٢).

([3]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٧، ص١٦٨؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٦٠؛ابن الوردي، تاریخ ابن الوردي، ج٢، ص٨٦ ؛العلیمي، الأنس الجلیل بتاریخ القدس والخلیل، ج٢، ص١٤٤.

(عیسی الهکاري) پیاوێکی خۆڕاگرو باوەردارێکی بەتین بووە، (ابن شداد) دەگێڕێتەوە کاتێك هەندێك لە جەنگاوەرە موسڵمانەکان لەلایەن فەرەنجە دوژمنەکانەوە شەهید کران، یەك لە شەهیدەکان (ظهر الدین)ی برای(عیسی الهکاري)بوو، من بینیم لەوکاتە عیسی بە زەردەخەنەوە دانیشتبوو، خەلکیش خەریکی تەعزیە بوون، (عیسی) بە خەڵکەکەی دەووت: ئەمڕۆ ڕۆژی خۆشیە نەك تەعزیەو ناخۆشی[1].پێگەو ڕێزی بەردەوام بووە، تاوەکو لە ساڵی(٥٨٥ك/١١٨٩ن) لە (الخروبة) ناوچەیەکە لە نزیك(عکا)[2] کۆچی دوای دەکات، تەرمەکەی لە (قدس) دەنێژرێ[3] . (ابن خلکان)هەر لەسەر گوزشتەی (عیسی الهکاري) باسی برای کردووە، کەناوی میر(مجد الدین أبا حفص عمر)بووە، لە ساڵی(٥٦٠ك/١١٦٤ن) لە دایك بووە، لە ساڵی(٦٣٦ك/١٢٣٨ن)لە قاهیرە دەمرێت، (ابن خلکان) دەڵێت:((هەر خۆم لە کاتی نوێژ کردن لەسەری ئامادە بووم))، [4]

---

([1]) النوادر السلطانية والمحاسن اليوسفية، تحقيق: جمال الدين الشيال، مكتبة الخانجي، (القاهرة: ١٩٩٤)،ص١٧٥.

([2]) عکا: شارێکە لەسەر کەناری دەریای ناوەراست، لە ساڵی(١٥ك/٦٣٦ن) لەلایەن موسلمانەکانەوە ئازاد کرا، ئێستا سەر بە ولاتی (فلستین)ە. المقدسي، أحسن التقاسيم في معرفة الأقاليم، ص١٦٢؛ابن عبد الحق البغدادي، مراصد الاطلاع على اسماء الأمكنة والبقاع، ص٩٥٢؛ محمد بن محمد شراب، المعالم الأثيرة في السنة والسيرة، دار القلم(دمشق: ١٤١١)،ص١٩٩.

([3]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٧؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص ٧٢٢؛ ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، ص٢٩٤.

([4]) وفيات الاعيان، ج٣، ص ٤٩٨.

بەڵام بەبێ ئەوەی بڵێت کورد بووە، یاخود زانیاری زیاتر لەسەری بدات، بەڵام (مجد الدين ابو حفص)لای مێژوو نووسان بە کورد دانراوە. تەنانەت یەکێك لە میرە بەناوبانگەکان بووە، بەسەرهاتی بەناوبانگی هەبووە[1].

۷) مەلیكالمظفر تقي الدين :

(المظفر تقي الدين أبو سعيد عمر بن نور الدولة شاهنشاه بن أيوب) فەرمانڕەوای (حماة)[2]، برازای سوڵتان (صلاح الدين )ی ئەیوبییە[3]، (ابن خلكان) دەڵێت: (( بەدەست خەتی خۆم لە (پەراوگە) دەستنووسەکانم بینی ساڵی لە دایکبوونی( تقي الدين)ی (٥٣٤ك/١١٣٩ن)بووە)) [4] . دەکرێ نووسەر ئەم زانیاریەی لە (ابي شامة)ییەوە

---

(1) المنذري، التكملة لوفيات النقلة، مج ٣، ص٥١٨؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٢٢١.بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ژیانی بڕوانە لە هەریەکە لە(المنذري، التكملة لوفيات النقلة، مج ٣، ص٥١٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٢٢١).

(2) حماة: شارێکی گەورە وبەناوبانگە، لە تەورات ناوی هاتووە. سەر بە (حلب) ە.التطيلي،رحلة بنيامين التطيلي، المجمع الثقافي، (او ظبي: ٢٠٠٢)،ص٢٧٨؛ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج٢، ص٣٠٠؛ابن الوردي، خريدة العجائب وفريدة الغرائب، تحقيق: انور محمود زناتي، مكتبة الثقافة الاسلامية(القاهرة: ٢٠٠٨) ص١٠٨.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٥٦؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٨٣٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٢، ص ص٢٩٨_٩٩٩؛محمد عبد الله عنان، دول الاسلام في الاندلس، مكتبة الخانجي، (القاهرة: ١٩٩٠)،ج٤، ص١٩٤؛سازان حسين ابراهيم، الملك المظفر تقي الدين عمر بن شاهنشاه الايوبي، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٩٤) ص٢٨.

(4)وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٥٧.

وەرگرتبێت، چونکە ئەو لە کتێبەکەی ئامـاژەی بەهەمان ساڵی لە دایکبوونی پاشا(المظفر تقي الدين ) کردووە[١].

کەسێکی ئازاو بوێر بووە، ڕۆڵی گەورە و بەناوبانگی بینیوە، لە ڕووبەڕوو بوونەوەی فەرەنجەکان، لە هەمبەر زانایان و ئاکار چاکاندا، زۆر خاکە ساری نیشان داوە و پشتی هەژاران و داماوانی گرتووە، کاری خێری ئەنجام داوە.ماوەیەك لە میسر، لە نەبوونی سولتان (صلاح الدين )دا جێگیری بووەو پاشان لە ساڵی (٥٨٢ك/١١٨٦ز) لەلایەن سولتان (صلاح الدين )ەوە کراوەتە فەرمانرەوای ( حماة)[٢] و لەگەڵ چەند شارێکی ترلە جەزیرەو شام[٣] .

وادیارە بەشێك لەم زانیاریە، نووسەر لە (ابن الاثير)ی مامۆستای وەرگرتبێت، چونکە (ابن الاثير) ئاماژە بەهەمان زانیاری کردووە[٤] .

---

(١) عيون الروضتين، ج١، ص١٢٧.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٥٦؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٦٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٨٣٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٢، ص٢٩٩؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٤٢٢.

(٣) ابي شامة، عيون الروضتين،ج٤، ص١٧٠؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٨٣٦؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٤٢٢؛العليمي، الأنس الجليل بتاريخ القدس والخليل، ج١، ص٣١٧.لەسەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکرێ کەوا سولتان صلاح الدين ئەو ناوچانەی کەلەژێر دەسەلاتی (مظفرالدين كوكبری) بوو وەکو(حران) و(الرها) و(سميساط) و(الموزر) هەمووی خستە ژێر فەرمانرەوای مەلیك (مظفر الدين تقي الدين). أبو الفداء،المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٧٩؛ابن الوردي،تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص١٠١؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٤١٣.

(٤) الكامل في التاريخ، ج١٠، ص١٦.

پاشان هەوڵی گرتنی قەلای (مناذکرد)[1]ی داوە، ماوەیەك بەردەوام بووە، لەم گەمارۆدانەیە[2]، بەلاَم لە ناکاو مەرگی لە ڕۆژی هەینی (٢٩)مانگی ڕەمەزانی ساڵی(٥٨٧ك/١١٩١ز)هاتۆتە سەر ڕێ، دەگێڕرێت لە نێوان (خلاط)[3]و (میافارقین) مردووەو تەرمەکەیان گواستۆتەوە بۆ (حماه) لەوێ نێژراوە[4]. لە دوای خۆشی مەلیك (المنصور ناصر الدین أبو المعالي محمد بن عمر) شوێنی گرتۆتەوە [5]، بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ فەرمانڕەوابی (حماه)و دەورووبەری بووە، دووجار فەرەنجەکانی تێکشکاندووە[6]

---

(١) منازکرد: دەکەوێتە نێوان (خلاط) و ولاتی ڕۆم، سەربە (ارمینیة) دادەنرێت، خەلکەکەی ئەرمەن وڕۆمن.یاقوت الحموي، معجم البلدان، ج٥، ص٢٠٢؛ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٥٧.

(٢) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٥٧؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٨٠؛الصفدي، الوافي بالوفیات، ج٢٢، ص٢٩٩.

(٣) خلاط: شارێکی گەورەو ئاوەدان و بەناوبانگە لە هەرێمی ئەرمینیا، کەوتۆتە نزیك شاری (أرزن الروم). القزویني، آثار البلاد وأخبار العباد، ص ص٤٩٤، ٥٢٤.

(٤) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٥٧؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٨٠؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٨٣٦؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج٢٢، ص٢٩٩. (ابن العدیم) دەلێت لە کاتی گەمارۆدانەکە لە(ملاذکرد) مردووە. زبدة الحلب في تاریخ حلب، ص٤٢٦.بۆ زانیاری زیاتر لە سەر ژیانی مەلیك(المظفر تقي الدین) بڕوانە نامەی ماستەر(سازان حسین ابراهیم، الملك المظفر تقي الدین عمر بن شاهنشاه الایوبي).

(٥) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٥٧؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٨٣٦؛ الکتبي، فوات الوفیات، ج٤، ص١٢؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج٤، ص١٨٣.

(٦) الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٣، ص٥٢٨؛الکتبي، فوات الوفیات، ج٤، ص١٢؛الصفدي، الوافي بالوفیات، ج٤، ص١٨٣.

لـه ڕۆژی دوو شـەممەی (٢٢)ی (ذي القعـدة)ی سـاڵی(٦١٧ك/١٢٢٠ن)لـە (حمـاه) کۆچـی یەکجاری کردووە[١].

## ٨) سوڵتان[٢] صلاح الدين:

(أبو المظفر يوسف بـن أيـوب بـن شـاذي)نازنـاوی ( الملـك الناصـر صـلاح الـدين)ە، خاوەنی ولاتی میسر و شام و فورات و یەمەنە[٣] (ابن خلكان) هەندێك زانیاری دەگمـەنی لەسەر بنەچەی ئەیوبیەکان باس کردووە و کوردبوونی ئەو بنەماڵەی یـەك لایـی وپشـت ڕاست کردۆتەوەو دەڵێت:(( مێژوو نووسان لەسەر ئەوە ڕێکەوتوون کـە بـاوك و کـەس و کاری (صلاح الدين) لە (دوين)ەوە هاتوون. ئەوان کوردی ڕەوادیین، ڕەوادیش تیرەیەکە لە هەزبانی، کە هۆزێکی گەورەی کوردانە)) [٤].

---

([١]) ابن خلكان، وفيـات الاعيـان، ج٣، ص٤٥٧؛الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٣، ص٥٢٨؛ الصـفدي، الوافي بالوفيات، ج٤، ص١٨٣.

([٢]) ابن خلكان لە نێو بنەماڵەی ئەیوبی تەنها بۆ(صلاح الدين بن ايـوب) ی سـولتانی بـەکارهێناوە، بەوانی تری ووتووە، پاشا(الملك).وفيات الاعيان، ج٧، ص١٣٩.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٣٩؛ الـذهبي، العـبر، ج٣، ص٩٩؛اليـافعي، مـرآة الجنـان، ج٣، ص٣٣٣؛ابن حجر العسقلاني، تبصير المنتبه بتحرير المشتبه، تحقيق: محمد علـي النجـار، المكتبة العلمية، بيروت،ج٢، ص٧٦٤؛موحسین محەمەد، ژینامـەی پیـاوە هـەرە دەرەوشـاوەکە سەلاحەدینی ئەیوبی، و: عەبدورەزاق بیمار، چ٢، دەزگای ئاراس، (هەولێر٢٠١٢ن) ل٧.

([٤])وفيـات الاعيـان، ج٧، ص١٣٩؛بهـاء الـدين الجنـدي، السـلوك في طبقـات العلمـاء والملـوك، ج٢، ص٥٢٠؛کرڤـــان محمـــد احمـــد، الكـــرد في كتابـــات المـــؤرخ ابـــن الاثـــير الجـــزري، ص ص١٤٦_١٤٧؛فرست مرعـي، الدولـة الايوبيـة في الـيمن، مؤسسـة حمـدي، (السـليمانية: ٢٠١٠م) ص٤.

مێژوو نووسانی دوای خۆشی ئەمەیان دووپات کردۆتەوە [١]، هەندێکیان ئاماژەیان بەوە کردووەو لە (ابن خلكان)یان وەرگرتووە[٢]پاشان (ابن خلكان) دەڵێت:(( فەقێیەکی شارەزای خەڵکی(دوین) پێمی گوت: لەبەرامبەر دەروازەی شاری (دوین) گوندێك هەیە پێ دەڵێن (أجدانقان) گشت دانیشتوانەکەی کوردی ڕەوادین، (أیوب)ی باوکی(صلاح الدين) لەو گوندە لە دایك بووە)) [٣] . ئەمەش زانیاریەکی ناوازەو پڕ بایەخە، گرنگی و کۆششی نوسەرمان بۆ بەدەردەکەوێ، کە هەوڵی داوە لەنزیکەوە خەڵکانێك بدوێنێت کە لە بنەڕەتدا بگەڕێنەوە بۆ زێدی ئەیوبیەکان، هەروەها بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە نوسەر بەتەنگ تۆمارکردنی مێژووی کوردە ئەیووبیەکانەوە بووە. (شاذي) خۆی و خێزانی، لەگەڵ (أسد الدين شيركوه) و (نجم الدين أيوب) هەردوو کوڕەکەی هاتونەتە بەغدا و، پاشان لە (تكريت) جێگیر بوونە، تا لەوێ (شاذي) دەمرێت[٤].(ابن خلكان) دەڵێت:(( زۆر لە ڕەچەڵەکی بەرەبابی ئەیوبیم کۆڵییەوە، دوای (شاذي) ناوی باپیرێکی ترم بەرچاونەکەوت، هەتا زۆر نامەم دیت، کە لە بارەی وەقف و موڵك ومالّ بەناوی (شيركوه)و (ايوب)ەوە، تەنیا نوسرابوو (شيركوه بن شاذي)و (أيوب بن شاذي) هەروەها هەندێك لە خانەوادەی ناوداری بنەماڵەکەشیان پێیان ڕاگەیاندووم کەبنەچەی ئەو

---

(١) ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، تحقيق: أنطون صالحاني، دار الشرق، ط٢، (بيروت: ١٩٩٢م)،ص ص٢١٢_٢١٣؛ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص٧٤؛اليافعي، مرآة الجنان، ج٣، ص٣٣٣؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦،ص ص٣_٤؛ محمود شاكر، أواخر الخلفاء العباسيين، المكتب الاسلامي، (بيروت: ٢٠٠٢م)،ص١٣٣.

(٢) ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٦، صص٤٨٨_٤٨٩؛عبد القادر بدران، منادمة الأطلال، ص٢٨٩؛ اشرف صالح، نسب الايوبيين بين تزييف الكتابات وحقائق المصادر، مجلة الفسطاط التاريخية، (القاهرة: ٢٠٠٧)،ص٣.

(٣)وفيات الاعيان، ج٧، ص١٣٩؛شهاب الدين، ذيل لب اللباب في تحرير الأنساب، ص٥٧؛اشرف صالح، نسب الايوبيين بين تزييف الكتابات وحقائق المصادر، ص٣.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٠.

بنەماڵەیە بەم شێوەیە))[١]. تەنها ئەوە نەبێ (ابن خلكان) دەڵێت:(( بینیم لەلایەن (حسن بن غريب بن عمران الحرشي) بە شیوەی مودەرەج ڕیزبەندی بۆناوی بنەماڵەکەیان کردبوو، کە بەم شێوەیە هاتبوو (أيوب بن شاذي بن مروان بن أبي علي بن عنترة بن الحسن بن علي بن أحمد بن أبي علي بن عبد العزيز بن هدبة بن الحصين بن الحارث بن سنان بن عمرو بن مرة بن عوف بن أسامة بن بيهس بن الحارث صاحب الحمالة ابن عوف بن أبي حارثة بن مرة بن نشبة بن غيظ بن مرة بن عوف بن سعد ابن ذبيان بن بغيض بن ريث بن غطفان بن سعد بن قيس عيلان بن الياس ابن مضر بن نزار معد بن عدنان...، تادەگاتە (آدم عليه السلام) ))[٢]. ئەمەش تەنها (ابن خلكان) باسی کردووە، کە یەکەم مێژوو نووس بووە، بنەچەی ئەو بنەماڵەیە بەم شێوە ڕیزبەندییە لە(حسن بن غريب)وەرگرتووەو ئاماژەی پێکردووە، لە دوای خۆشی لەلایەن چەند سەرچاوەیەك پشت ڕاستی ئەم زانیاریە کراوەتەوە[٣] لەوانەیە هۆکاری باس کردنی ئەم زانیاریەش لەلایەن نوسەر دەگەڕێتەوە بۆ پەرۆشی نووسەر بۆ گەڕان و دەسکەوتنی هەر زانیاریەکەوە بێت لە بارەی ڕەچەڵەکی ئەیوبیەکانەوە.

(ابن خلكان) لەسەر گوزشتەی (صلاح الدين)دا درێژە بە باسی ڕەچەڵەك و بنەچەیان دەداو دەڵێت:((بینیم لە کتێبی (تاريخ حلب)ی (ابن العديم)دا، دوای ئەوەی باسی بۆ چونی جیاوازی کردووە لەسەر بنەچەی ئەو بنەماڵەیە، ئاماژەی بەوە کردبوو، گوایە(المعز إسماعيل بن سيف الآسلام ابن أيوب) پاشای (یەمەن) بانگەشەی ئەوەی

---

(١)وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٠؛موحسين محەمەد، ژینامەی پیاوە هەرە دەرەوشاوەکە سەلاحەدینی ئەیوبی، ل٧.

(٢) وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٠.

(٣) ابن واصل، مفرج الكروب في اخبار بني ايوب، تحقيق: محمد حسين وسعيد عبدالقادر، قاهرة، ج١، ص٤٤؛ احمد الحنبلى، شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، تحقيق: ناظم رشيد، دار الحرية للطباعة، (بغداد: ١٩٧٨)،ص٢١.

کردبوو، که ئەوان لە بنەچەدا دەگەڕێنەوە بۆ بنەماڵەی (ئومەوی)یەکان و داوای خەلافەتی دەکر منیش گوێم له (ابن شداد)ی مامۆستاکەم گرت، کە ئەو ئەم باسەی پێشتر لای سوڵتان (صلاح الدين)باس کردبوو، ئەویش له ولآمدا ڕەتی ئەوەی کردۆتەوە بنەچەیان بگەڕێتەوە بۆ (ئومەوی)یەکان))[1]، بەلآم لە ڕاستیدا ئەم زانیارییە لەو نوسخەیەی کتیبی (تاريخ حلب)دا نییە، کە ئێستا لە بەردەستدایە. هەروەها (ابن خلكان) هەر بەوە نەوەستاوە، ئاماژەی بە بۆچونی (ابن الاثير)ی مامۆستاکەشی کردووە و دەڵێت: لە کتێبەکەی باسی بنەچەی ئەو بنەماڵەی کردووە و دەڵێت لە بنچینەدا کوردی ڕەوادین[2] . دوای بەدوا داچوونمان بۆ ئەم زانیاریە، (ابن الاثير) لە کتێبەکەی ئاماژەی پێکردبوو[3] .

لێرەدا دەکرێ بپرسین بۆچی (ابن خلكان) ئەوەندە پەرۆشە بۆ یەك لایکردنەوەیەکی یەکجاری لەسەر ڕەچەڵەکی ئەو بنەماڵەیە، ئایا لێرەدا هەست و سۆزی نەتەوەیی ئەو مێژوو نووسە بۆ کورد بوونی ئەو بنەماڵەیە بەدی ناکرێ؟ لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین (ابن خلكان) بەو هەموو بەدوا داچوونەی بۆ بنەچەی ئەو بینەماڵەیەی کردوە، سنورێك بۆ هەموو گومانێك لە بارەی بنەچەی نەتەوەی ئەیوبیەکان دادەنێ. وای لە مێژوو نووسانی دوای خۆی کردووە ڕەچەڵەکی ئەو بنەماڵەیە بە هیچ ئارستەیەکی غەیرە کورد نەبردرێت.

(ابن خلكان) دەڵێت:((مێژوو نووسان کۆ دەنگن کەوا (صلاح الدين) لە ساڵی( ٥٣٢ك/١١٣٧ز ) لە قەڵای (تكريت) لە دایك بووە، هەندێك دەڵێن لەو شەوەی کە لە قەڵای (تكريت) دەرچوون، بەرەو (موصل) لە دایك بووە، باوکی بە لە دایکبوونی

---

[1] وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤١؛ عبدالمنعم الهاشمي، موسوعة تاريخ العرب العصر الايوبي، الهلال، (بيروت: ٢٠٠٦م)،ص٩.

[2] وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤١.

[3] الكامل في التاريخ، ج٩، ص٣٤٢.

کوڕەکەی لەوکاتە نالەبارە دڵگران بووە، ئەوانەی لەگەڵی دابوونە، وتیانە لەوانەیە خێری تیابێت، خوا ئەزانی خێر لەچ دایە))[١]، بەم شێوە لە سەرەتای ژیانی لە ژێر پەروەردەی باوکی دابووە، پاشان دوای ئەوەی (نور الدين محمود زنكى) بووە، پاشای دیمەشق، (صلاح الدين) لەگەڵ (نجم الدين أيوب)ی باوکی خزمەتی (نورالدين)یان دەکرد[٢]،

جێی ئاماژەیە کە (ابن خلكان) ڕای خۆی سەبارەت بە گرنگیدانی (نورالدين) بە (صلاح الدين)داوەو دەڵێت:(( پەڵە هەوری بەختەوەری بەسەریدا (صلاح الدين) ئەشەکایەوە، پیاوماقوڵیشی لە ئاستێکەوە بۆ ئاستێکی تر ئەیبردە پێشەوە، (نورالدين)بینی و پێی سەرسام بوو، (صلاح الدين)یش لەوەوە فێری ڕێگای خێرو چاکە و کۆشش لە کاروباری جیهاد بوو))[٣].

بەم شێوەیە (نورالدين) گرنگی زۆری بە پەروەردەکردنی (صلاح الدين)دەدا، بۆ ڕێگای چاکەو جیهادو تێکۆشان، بەردەوام بوو، لە پێگەیاندنی تاوەکو بەشداری کرد لە هەر سێ شالاوی سەربازی کە بەسەرکردایەتی(اسد الدين)ی مامی، لەلایەن (نورالدين زنكى)بەرێکرا، بۆ ولاتی میسر[٤].

---

([١]) وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٤٤_ ١٤٥؛السبكي، الطبقات الشافعية، ج٧، ص٣٤١؛ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٣٦؛ احمد الحنبلى، شفاء القلوب في مناقب بني ايوب، ص٢٣.

([٢]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٥.

([٣]) وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٥. هەروەها بڕوانە: ئەحمەد عەبدولعەزیز محمود، ستەم ونادادی دەرهەق بە سەرکردەی موجاهید سەلاحەددینی ئەیوبی، وە: زرار عەلی، تەفسیر، (هەولێر: ٢٠١١)،ل٣٧.

([٤]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٤٥، ١٤٨، ١٥٠. ئەوەی جێی ئاماژەیە بەر لەوەی (صلاح الدين) لەگەل (اسد الدين) ی مامی بەرێبکەوێت بۆ میسر، پێشتر لە سالی (٥٥٠ك/١١٥٥ز) لەلایەن (نورالدين محمود) ی پۆستی (الشحنكية) و(ديوان) ی دیمەشقی بە

بەشداری کردنی (صلاح الدین) لە هەرسێ شاڵاوەکە، بۆتە ئەزمونێکی گرنگی سەربازی و پێگەیاندنی لە بواری سەربازی، (اسد الدین)ی مامی ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە، لە تەواو کردنی کەسایەتی و پێگەیاندنی لە چۆنیەتی بەڕێوە بردن و سەرکردایەتی کردندا.

هەرچەندە (ابن خلکان) دەڵێت: (ابن شداد) لە کتێبەکەی ئاماژەی بەوە کردووە، کەوا (صلاح الدین) قسەی بۆ کردووەو وتوویەتی :((کنت أکره الناس للخروج في هذه الدفعة وما خرجت مع عمي باختیاري)). لێرەدا (صلاح الدین) بە ئارەزووی خۆی لەشالاوی سێیەم نەچۆتە میسر، بەڵکو فەرمانی پێکراوە[1] . بەدوا داچوونمان بۆ ئەم زانیاریە کرد، (ابن شداد) لە کتێبەکەی ئاماژەی پێکردوو[2] .

(صلاح الدین) لەگەڵ مامی دوای شاڵاوی سێیەم لە میسر مانەوەو، (ابن خلکان) دەڵێت: بە خەتی خۆم لە کۆمەڵێك لە دەستنووسەکانم بینی دوای ئەوەی (اسد الدین ) لە ساڵی (٥٦٤ك/١١٦٨ز) هاتە نێو قاهیرە. (شاور )[3] هەوڵی کوشتنی (اسد الدین)

---

(صلاح الدین) ی سپاردبوو ئەویش بۆ ماوەیەك خەریکی بوو پاشان (صلاح الدین) بەهۆی کێشەی لەگەل (ابي سالم) خاوەن دیوان، وازی لەم کارە هێناو گەرایەوە بۆ حلب.تەنانەت نور الدین ئەوەند پەرۆش بووە بۆی، لە گەشت ودانیشتنەکانی دا صلاح الدین لێ جیانەبۆتەوە. ابن طباغ الحلبي، اعلام النبلاء بتاریخ حلب الشهباء، تحقیق: محمد کمال، ط٢، دار القلم، (حلب: ١٩٨٨) ج٢، ص٢٦.

([1]) وفیات الاعیان، ج٧، ص ص١٤٨_١٤٩.

([2]) النوادر السلطانیة والمحاسن الیوسفیة، ص٧٩.

([3]) شاور: ناوی(ابو شجاع، شاور بن مجیر السعدي الهوازاني) یە، سەرەتا والی (صعید) بوو، پاشان لەدژی وەزیری فاتیمی(رزیك بن صالح) راپەریو لەسالی(٥٥٧ك/ ١١٦٢) دا توانی (رزیك) بکوژێت، ئیدی خۆی پۆستەکەی وەرگرت.الذهبي، سیر أعلام النبلاء، ج١٥، ص٢٢٤؛خیر الدین الزرکلي، الاعلام، ج٣، ص٢٠.بۆزانیاری زیاتر بڕوانە (ابن خلکان/وفیات الاعیان، ج٢، ص٤٣٩).

دەدات، لە ڕێگەی ئامادەکردن و ڕێکخستنی خوانێك بۆ (اسد الدين)و ئەمیرەکانی، بەڵام (اسد الدين)هەستی بەم پلانە کرد، لە کۆتاییدا (صلاح الدين )و چەند ئەمیرێك ڕێکەوتن لە سەر کوشتنی (شاور) بۆیە دەستگیریان کرد، نەیان توانی بەبێ ڕەزامەندی (نورالدین) بیکوژن، کاتێ خەلیفەی فاتمی (العاضد)[1](٥٥٥_٥٦٧ك/١١٦٠_١١٧٢ز) ئەمەی بیست ناردی بۆ لایان، فەرمانی کوشتنی داو کوشتیان، (ابن خلکان)دەڵێت: واباس دەکرێ کەوا (اسد الدین) دەستی لە کوشتنەکەدا نەبووە، کاتێ دەکوژرێت (العاضد )بەشوێن (اسدالدین) دەنێریت، ئەویش دەچێتە قاهیرەو دەچێتە لای، (العاضد)یش پۆستی وەزارەتی پێدەدا [2]، دەکرێ نووسەر لەم زانیاریە پشتی بە کتێبەکەی (ابن الاثیر) بەستبێت، چونکە هەمان زانیاری ئەوی دووبارە کردۆتەوە[3].

دوای مردنی مامی (صلاح الدين) پۆستی وەزارەت وەردەگرێت، بەرە بەرە دەسەڵات و پێگەی بەهێز دەبێت لە خاکی میسر[4]، پاشان (صلاح الدين) دەتوانێت ڕووبەڕووی فەرەنجەکان بێتەوە لەکاتی هێرش کردنیان بۆ سەر کەنارەکانی میسرو سەرکەوتوو بوو، لە دورخستنەوەیان [5]،

(ابن خلکان)دەڵێت: (ابن الاثیر) لە کتێبەکەی ئاماژەی بە (نورالدین زنکی) کردووە، کە داوای لە (صلاح الدين) دەکات، بە زووترین کات کۆتایی بەدەوڵەتی (فاتمی) بێنێت، هەرچەندە سەرەتا (صلاح الدين) ئامادە نەبوو، بەم خێراییە ئەم کارە بکات

---

([1]) العاضد: ناوی (عبدالله بن یوسف بن الحافظ)،نازناوی(العاضد) بوو، ابن خلکان دەڵێت (عاضد) شیعەیەکی توندرەو بوو زیادەرەوی دەکرد لە جوێندان بە یاوەران و خوێنی سنی پێ ڕەوابوو.ابن خلکان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٠٩.

([2]) وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٥٠_١٥١.هەروەها بڕوانە: الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٢١٦.

([3]) الكامل في التاريخ، ج٩، ص٣٤١.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٥١؛ السبكي، الطبقات الشافعية، ج٧، ص٣٤١.

([5]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٥٣.

لەکاردانەوەکاندا دەترسا، بەڵام لەبەر زۆری فشارەکانی نورالدین (صلاح الدین) ناچار بوو، دەستی کرد بە کۆتای هێنانی دروشم و دەسەلاتی فاتمییە شیعەکان لە میسرو ئەویش چەند ڕیگەیەکی گرتە بەر بۆ ئەم کارە، وەکو لابردنی ناوی خەلیفەی فاتمی (العاضد)(٥٥٥_٥٦٧ك/١١٦٠_١١٧٢ن) لە وتارەکانی هەینی و خوێندنەوەی

وتارەکان بەناوی خەلیفەی عەباسی (المستضيء بأمر الله) (٥٦٦_٥٧٥ك/١١٧٠_١١٧٩ن)، هەروەها دامەزراندنی چەندین قوتابخانەی شافعی لە میسرو لێدانی لایەنگرانی فاتمییەکان و...هت بەم شێوەیە سەرکەوتوو بوو، لە کۆتای پێهێنانی دەولەتی فاتمی عوبێدی، بە مردنی (العاضد) دەسەلاتەکەی زیاتر بەهێزو پارێزراو بو، لەو کاتەدا وەکو جێگرو نوێنەری سوڵتان (نورالدین زەنگی) حوکمی دەکرد، سوڵتانیش بەناوی (الاسفهسلار)[1] ناوی دەهێنا، لەکاتی نامە گۆرینەوەکاندا[2]. دوای، بەدوا داچوون بۆ ئەم زانیاریە، (ابن الاثير) هەمان زانیاری باس کردبوو[3].

---

([1]) الاسفهسلار: زاراوەیەکی سەربازییە، لە دوو ووشە پێك هاتووە، (اسفه) مانای (المقدم) دەگەیێنێت، (سلار) واتا (سەربان)،کەواتە (اسفهسلار) بە (سوپاسالار) (مقدم العسكر) یاخود(قائد الجيش) دێت.القلقشندي، صبح الأعشى، ج٦، ص٤٦حسان حلاق وعباس صباغ، المعجم الجامع في المصلحات الايوبية والمملوكية والعثمانية، دار العلم للملايين، (بيروت: ١٩٩٩)،ص١٨.

(٢)ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٥٥، ٢٠٧، ٢٠٦، ١٦٥، ١٥٧؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٢٢٥؛ السبكي، الطبقات الشافعية، ج٧، ص٣٤١؛ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٤، ص٣٢ ؛ كارل بروكلمان، تاريخ الشعوب الاسلامية، ت: نبيه امين واخرون، ط٥، دار العلم للملايين، (بيروت: ١٩٤٨م) ص٣٥٢؛البنعلي،الشيخ محمد بن عبد الوهاب المجدد المفترى عليه، دار الفتح، (الشارقة: ١٩٩٥م)،ص٣٧؛

Ruthven, M and Nanji, A. Historical Atlas of Islam. (USA: 2004) P. P.50_51'62.

([3]) التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية، ص ص١٤٢_١٥٧.

پاشان (صلاح الدين) سەركەوتوو بوو، لە لكاندنی (یەمەن) بە میسرەوە[١]، ( ابن خلكان) دەڵێت: (ابن الاثیر) لە كتێبەكەی باس لە هەندێك ساردی پەیوەندی نێوانیان دەكات، كاتێ ڕێكەوتن لەسەر گەمارۆدانی (كرك)[٢] و پاشان ( صلاح الدين ) پاشەكشەی كردو پێش گەیشتنی نورالدين، بە بیانۆی مەترسی فاتمییەكان بۆ سەر میسر، بەڵام دواتر پەیوەندییان ئاسایی دەبێتەوە[٣].

دوای بەدوا داچوونمان لە هەردوو كتێبەكەی (ابن الاثیر) ئاماژە بەم پەیوەندییە ساردو سرییەی نێوانیان كرابوو[٤]. (صلاح الدين) لە دوای مردنی (نورالدين) هەوڵی بۆ یەكخستنی بەرەی ئیسلامی دا، توانی دەست بەسەر (دیمەشق) و (حلب) دابگرێت و موسڵیش چوونە ژێر ركێفی، بەم شێوا سەر كەوتوو بوو، لە دروست كردنی بەرەیەكی بەهێز، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خاچیەكان، توانی لەجەنگی (حطین ) لە ساڵی(٥٨٣ك_١١٨٧) سەركەوتنێكی گەورە و مێژوویی بەسەر خاچیەكان بێنێت و پاشان زۆربەی ناوچەكانی دەوروبەری شاری ( قدس)ی رزگاركرد[٥].

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٦٥.بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە(الدولة الايوبية في اليمن/فرست مرعي).

([٢]) كرك: قەڵایەكی بەهێزو سەختە لەبەرەی شام، كەوتۆتە نێوان هەر یەكە لە (أيلة) ودەریای(قلزم) و(بيت المقدس). ابن عبد الحق البغدادي، مراصد الاطلاع على أسماء الأمكنة والبقاع، ج٣، ص١١٥٩.

([٣]) وفيات الاعيان، ج٧، ص١٦٣؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٥٢.

([٤]) الكامل في التاريخ، ج٩، ص٣٦٧؛ التاريخ الباهر، ص١٥٨.

([٥]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٦٩_١٧٤، ١٧٠، ١٧٩؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص ص٥٩٦، ٦٧٣ ؛البير شاندور، صلاح الدين الايوبي، ت: سعيد ابو الحسن، طلاسدار، دمشق ص٢٠٨، ٢٠٩؛علي محمد الصلابي، صلاح الدين الأيوبي، ص ص٥١٤، ٤١١، ٣٣٠؛ علی الطنطاوی، رجال من التاريخ، دار السلام، دمشق، ص١٧٦؛ ئاراس فەریق زەینەل، جەنگی دەروونی لەسەردەمی سەلاحەددینی ئەیوبییدا، مەكتەبەی بیرو هۆشیاری، (سلێمانی:

پاشان خۆی ئامادەکرد، بۆ ئازاد کردنی شاری( قدس) لەو کاتەش نزیکەی شەست هەزار جەنگاوەری فەرەنجەکانی تیابوو، بەرگریەکی زۆریان کرد، لە دەرنجامدا سوڵتان (صلاح الدین) لە دوای شەڕێکی توند سەرکەوت بەسەریان[1]، لە ڕۆژی هەینی (٢٧) مانگی ڕەمەزان چووە ناو (قدس) و ئازادی کرد، دواتر بەردەوام بوو، لە ڕووبەڕووبونەوەی خاچپەرستەکان و ئازاد کردنی ناوچەکانی تر[2]، سولتان (صلاح الدین) بەگەورەترین سەرکردەو پاڵەوانی موسڵمان دادەنرێت، لە ڕووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکاندا [3]

بەم شێوەیە بەردەوام بوو، لە فەرمانڕەوایی تاوەکو مردنی لە (دیمەشق) لە دوای نوێژی بەیانی ڕۆژی چوارشەممەی (٢٧) ی مانگی صفری ساڵی(٥٨٩ك/١١٩٣ز) کۆچی دوای دەکات[4]. (ابن خلکان) دەڵێت: ڕۆژی مردنی ناخۆشیەکی گەورە بوو، بۆ ئیسلام وموسڵمانان. چواندویەتی بە ڕۆژگارە ناخۆشەکانی نەمانی خیلافەتی ڕاشدین، پاشان تەرمەکەی لە قەڵای (دیمەشق) نێژرا [5]،

---

٢٠٠٨ز)،ل١٥٥؛ محمد رجب البیومي، سەلاحەددینی ئەیوبی، و: محمد حسن، تەفسیر، (هەولێر: ٢٠٠٨ز)،ل١٧٦.

([1]) عماد الدین الاصبهاني، الفتح القسي في فتح القدسي، دار المنار(مصر: ٢٠٠٤) ص ص٧٠_٧١.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٧٩_٢٠٢؛ عەباس عومەر محەمەد، مێژووی کوردە ئەیوبییەکان، چوارچرا، سلێمانی، ل٨١.

([3]) أحمد معمور العسيري، موجز التاريخ الإسلامي، (الرياض: ١٩٩٦م)،ص٢١٥.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص٢٠٢_٢٠٣؛ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص١٠٤؛ ابن الغزي، ديوان الاسلام، ج٣، ص١٩٧؛ هادية دجاني، القاضي الفاضل دوره التخطيطي في دولة صلاح الدين وفتوحاته، مؤسسة الدراسات الفلسطينية، (بيروت: ١٩٩٣م)،ص٣٤١.

([5])وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٠٣.

تەمەنی نزیکەی( ٥٧ ) ساڵ بووە، فەرمانڕەواییەکەی لە میسر( ٢٤ ) ساڵ بوو، لە ( دیمەشق) نزیکەی ( ١٩ ) ساڵ بووە، (١٧) کوڕو کچێکی لە دوای خۆی بەجێهێشت[١]. (الملك الأفضل)ی کوڕی سەرپەرشتی تازیەکەی دەکرد[٢]، پێش مردنی گشت دەسەڵاتەکەی لە نێوان (العادل)ی برای و کوڕەکانی دابەش کرد[٣] .

(ابن خلكان) ڕۆڵی (صلاح الدين)ی لە بواری ئاوەدانی و ئاینیدا، فەرامۆش نەکردوەو ئاماژەی بە دروست کردنی چەندین قوتابخانەی بۆ مەزهەبەکانی شافعی و مالیکی وحەنەفی لە میسرو شام و قدس، جگە لە بیمارستان و خانەقاو...هتد، لەلایەن (صلاح الدين) ەوە کردووە[٤] . (ابن خلكان) دەڵێت:((لە ساڵی (٦٨٠ك/١٢٨١ن) سەردانی گۆڕەکەم کرد، لەسەر گۆڕەکەی نوسرابوو (اللهم فارض عن تلك الروح، وافتح لە أبوب الجنة فهي آخر ما كان يرجوه من الفتوح))[٥] .

---

([١]) أبـي شـامة،عيـون الروضـتين،ج٤، ص٣٧٥؛أبـو الفـداء، المختصـر في أخبـار البشـر، ج٣، ص٨٦.بەلام (الزبيدي) لە کتێبەکەی دەڵێت (١٩) کوڕی هەبووە بەبێ ئەوەی باسی کچی بکە.ترويح القلوب في ذكر الملوك بني ايوب، تحقيق: صلاج الدين المنجد، دار الكتاب الجديد، بيروت، ص٦٩.

([٢]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٠٣.

([٣]) كاهن، دائرة المعارف الاسلامية، ت: ابراهيم زكى خورشيد واخرون، القاهرة، مج٥، ص٤٤٠.

([٤]) وفيات الاعيان، ج٧، ص ص٢٠٦_٢٠٧.

([٥])وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٠٦؛ محسن محمد، ابن شداد وكتابە (النوادر السلطانية) موكريانى، (اربيل: ٢٠١٣م)،ص٧٨.

**گرنگترینی ئەو ئەنجام و دەرکەوتانەی لە ئەنجامی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لە نوسینەکانی (ابن خلکان) لە مەڕ (صلاح الدین) و نوسەر چ دیوێکی زیاتر پشانداوە ئەیانخەینە ڕوو:**

١) سەرەڕای ئەوەی نوسەر زۆربەی زانیاریەکانی لەمەڕ سوڵتان (صلاح الدین)ەوە لە کتێبەکانی (الکامل فی التاریخ )و (التاریخ الباهر)ی (ابن الاثیر)و (النوادر السلطانیة)ی (ابن شداد)وە وەرگرتووە، هەروەك چۆن خۆیشی ئاماژەی پێکردووە، هۆکارەکەشی ئەوە بووە (ابن الاثیر)و (ابن شداد) هاوچەرخی ڕووداوەکانی سەردەمی (صلاح الدین) و (زەنگی)ەکان بوونە، بەڵام نوسەر جگە لە زانیاریەکانی (ابن الاثیر)و (ابن شداد) زانیاری تریشی خستۆتەسەری و زیادی کردووە.

٢) لە ژیننامەی سوڵتان ( صلاح الدین) دا، نوسەر زۆر جەختی لەسەر بنەچەو ڕەچەڵەکی بنەماڵەی ئەیوبیەکان کردۆتەوە، بەڕادەیەك چەندین بەدواداچونی وردی زارەکی ومێژوویی و دەستنووس و بەڵگەی دەگمەن و ناوازەی بەکارهێناوە، هۆکارەکەشی دەتوانیین بڵێین (ابن خلکان) بەو هەموو بە دوا داچوونەی بۆ بنەچەی ئەو بنەماڵەیە کە کردوویەتی ئەم بابەتەیە بە یەکجاری یەکلاییکاتەوەو سنورێك بۆ هەموو گومانێك لە بارەی بنەچەی نەتەوەی ئەیوبیەکان دادەنێ.

٣) نووسەر بۆ بەسەرهاتی (صلاح الدین) (٨٠)لاپەرەی تەرخان کردووە، بۆ هیچ کەسێکی دی نیوەی ئەو ژمارەیەشی تەرخان نەکردووە. باس کردن بەو قەبارە زۆرەیە، کاریگەرو پەرۆشی و سەرسامی زۆری نووسەرمان بۆ کەسایەتی (صلاح الدین) بەدەردەکەوێ، ئەمەش ئەکرێت پەیوەندی بە باکگراوندی نەتەوەیی و هاوزمانی نوسەرەوە بێت، لەگەڵ (صلاح الدین)ی ئەیوبیدا.

٤) نووسەر لە ژیننامەی (صلاح الدین) دا هەوڵی داوە چەند لایەنێك دەربخات وباس بکات ئەوانیش:

أ) چۆنیەتی هاتنی بنەماڵەی ئەیوبیەکان لە (دوین)ەوە بۆ تکریت .

ب) ڕەچەڵەك و بنەچەی ئەیوبیەكان.

ت) پەیوەندیەكانی نێوان ئەیوبیی و زەنگیەكان وچۆنیەتی دروست بوونی متمانە لە نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە.

پ) خستەڕووی چۆنیەتی لە دایكبوونی (صلاح الدین) و پەروەردەكردنی وەك سەركردەیەكی سەربازی و سیاسی لەلایەن هەریەكە لە (نورالدین زنكی)و (اسد الدین شیركۆ)ی مامی.

ج) بەشداری كردنی لە هەرسێ شاڵاوەكانی زەنگیەكان بۆ میسر.

ح) چۆنیەتی گەیشتن بە دەسەڵات لە میسرو كۆتایهێنانی دەوڵەتی فاتمی شیعە مەزهەب و پاشان فراوانخوازییەكان و ڕووبەڕووبوونەوەی بەرامبەر، بە خاچیەكان و یەك پارچە كردنی ناوچەیەكی زۆری جیهانی ئیسلامی، لە ژێر دەوڵەتی ئەیوبیی و ئازاد كردنی ( قودس) و ناوچەیەكی زۆر لە چنگی خاچ دروشمەكان و دابەش كردنی دەسەڵاتی بەسەر كورو براكانی و تاوەكو مردنی.

نووسەر لە نووسینەكانی هەوڵی داوە لە باسی ململانێی سیاسی نێوان (نورالدین زنكی)و (صلاح الدین الایوبی) نەبێتە لایەنگیری هیچ لایەكیان، بە پێچەوانەی (ابن الاثیر)ی، هەوڵی داوە خۆی دوور بگری لە گەورەكردنی ئەو بابەتە، زیاتر لایەنی پەیوەندییە باشەكانی نێوانیانی نیشانداوە، بەڕادەیەك ناوەنگیری و سۆزی نووسەرمان بۆ هەردوو كە سایەتی بەدەردەكەوێ.

### ٩) سیف الإسلام طغتكین :

(سیف الإسلام أبو الفوارس طغتكین بن أیوب بن شاذي بن مروان )ه، بە مەلیك (العزیز ظهیر الدین)ناسراوە[1]، برای سوڵتان ( صلاح الدین ) بووە، دوای ئەوەی (شمس

---

([1]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٢، ص٥٢٣؛ الذهبي، سیر أعلام النبلاء، ج١٥، ص٤٣٩ ؛ المقریزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج١، ص٢٥١.

الدولة تورانشاه) دەستی بەسەر(یەمەن) داگرت، پاشان گەڕایەوە بۆ شام[١]، دواتر (حطان)[٢]دەست بەسەر چەندین قەڵاکانی (یەمەن) دادەگرێت[٣]، بەرامبەر بەمە سوڵتان (صلاح الدين) لە ساڵی (٥٧٧ك/١١٨١ز)(سيف الاسلام طغتكين) نارده یەمەن[٤] توانی فریوی بدات و دەستگیری کرد، لە قەڵایەك زیندانی کرد و دواتر کوشتی[٥]، بەم شێوەیە (سيف الاسلام) بۆتە فەرمانڕەوای ئەو وڵاتە. ئازاو چاك خواز بووە، فەرمانڕەواییەکەی بە باشی بەڕێوە بردووەو کارە چاکەکانی سەرانسەری وڵاتی گرتبۆوە[٦].(سيف الاسلام) هەر لە (یەمەن) ژیاوە، تاوەکو لە ساڵی( ٥٩٣ك/١١٩٦ز) کۆچی دوای کردووە، لە دوای خۆی (الملك المعز فتح الدين إسماعيل)کوڕی کرا بە جێنشین[٧]،

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٥٢٣؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٤٨٠.

([٢]) حطان: کوری(كامل بن علي بن منقذ) ە، لە (شیزر) لەدایك بووە شاعیرو میرێکی ئازابووە، خزمەتی مەلیك (ناصر صلاح الدين) ی کردووەو ئەویش ناردوویەتی بۆ یەمەن. ابن العديم، بغية الطلب في تاريخ حلب، تحقيق: سهيل زكار، دار الفكر، بيروت، ج٦، ص٢٨٤٢.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص١٤٤.

([٤]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٥٢٣.بەلام لەسەرچاوەکانی تردا ئاماژە بەوە دەکات گوایە لە ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) (سيف الاسلام) چۆتە یەمەن. ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص٢١٨؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٦٣؛ ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص٨٩؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج١٥، ص٤٣٩.

([٥]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص١٤٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٨٨٤؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٣٦٩.

([٦]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٥٢٣؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص ص١٤١_١٤٢.

([٧]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٥٢٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١١٣٤سير أعلام النبلاء، ج١٥، ص٤٣٩؛ المقريزي، السلوك، ج١، ص٢٥١؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص١٤١فرست مرعي، الدولة الايوبية الكردية في اليمن، گۆڤاری مێژوو،(هەولێر:٢٠١٠ز)، ژ١٤، ل٢٧٥.

هەر ئەو مەليك (المعز) بووە، بانگەشەی ئەوەی دەكرد، كە ئەو قورەيشيەو لە بنەماڵەی (ئومەوی)ەكانە خۆی بە خەليفە ناساندووەو نازناوی (الهادی) لە خۆی ناوە. كاتێك مەليك (عادل)ی مامی ئەمەی بيستووەو پێی ناخۆش بووە، فەرمانی پێدەكات بگەڕێتەوە بۆ ڕەچەڵەكی ڕاستی خۆی[1]. ( ابن خلكان) دەڵێت: (أبو الغنائم مسلم بن محمود بن نعمه بن أرسلان الشيزری م:٦١٧ك/١٢٢٠ن كە ئەديب و شاعير بووە، كتێبی (عجائب الأسفار وغرائب الأخبار) بە ناوی ئەو مەليك (المعز) داناوە، لەو كتێبەش ئاماژەی بە مردنی( المعز ) كردووە لە (يەمەن)[2]، پياوێك بووە، هەميشە سەرخۆش و زۆردار بووە[3]،

(ابن خلكان) دەڵێت، مەليك (المعز) هەڵسوكەوتی لەگەڵ ميرو كاربەدەستەكانی باش نەبووە، بۆيەش بەدەستی سەردارانی لە شكری خۆی لە ساڵی (٥٩٨ك/١٢٠١ن كوژراوە[4] . لە دوای خۆشی مەليك (الناصر محمد)برای هاتۆتە شوێنی[5].

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص ص٥٢٤_٥٢٥؛ اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج١، ص٣٩؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٨٩.تەنانەت(ابن الواصل) لەكتێبەكەی ئاماژەی بەووتەی مەليك(عادل) كردووە، كەبەشێوازێكی زۆر توند ڕەتی مەليك (المعز الدين اسماعيل) دەداتەوەو دەڵێت: ((اسماعيل درۆی كرد، ئێمە لەبنەچەدا لەبنەماڵەی ئومەوی دانين وناگەڕێنەوە بۆی) ). مفرج الكروب، ج١، ص٤.

([2]) وفيات الاعيان، ج٢، ص٥٢٤.

([3]) الذهبي، العبر في خبر من غبر، ج٣، ص١٢١؛شەرەف خانی بدليسی، شەرەفنامە، و: هەژار، چ ٣، ئاراس، (هەولێر: ٢٠٠٦ن) ل١١٧.

([4]) وفيات الاعيان، ج٢، ص٥٢٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١١٣٤؛ ابن تغری بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص١٨١؛شەرەف خانی بدليسی، شەرەفنامە، ل١١٧.

([5]) وفيات الاعيان، ج٢، ص٥٢٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١١٣٤؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج١٥، ص٤٣٩.

**١٠) مەلیك العزیز ابن صلاح الدین:**

مەلیك(العزیز عماد الدین أبو الفتح عثمان ابن السلطان صلاح الدین یوسف بن أیوب).كاتێك باوكی لە شام بوو، بۆتە جێگری لە میسر. لە (٨)ی (جمادی الاولی)ساڵی (٥٦٧ك/١١٧١ن) لەقاهیرە لەدایكبووە. دوای مردنی (صلاح الدین)ی باوكی لە(دیمەشق) دەسەلاتی بەپێی ڕێكەوتنێك لەگەڵ میرەكان لە میسر جێگیر بوو. گوێی بۆ زانستی فەرمووده لای چەندین زانای میسری گرتووە. مەلیكێكی زۆر چاك خواز وخێرمەندبووە[1]. خەڵكی میسر زۆر خۆشیان ویستووە[2].

مەلیك (العزیز) دەیووت:باوكم لە هەموو منداڵەكانی زیاتر بەمن كاریگەر بووە. وا دیارە لە كاتی ڕاوكردندا، لە ئەسپەكەی گلاوەو بەربۆتەوە. بەو هۆیەوە لە شەوی چوارشەممەی (٢١)ی مانگی(محرم)ی ساڵی (٥٩٥ك/١١٩٨ن) كۆچی دوای دەكات. لە قوبەی ئیمامی شافعی لە( قاهیرە ) نێژراوە. لە دوای خۆی (محمد)ی كوڕی كە نازناوی (ناصر الدین)بوو، بەپێی ئەو وەسیەتەی كردبووی، شوێنی گرتەوە، كە ئەو كات تەمەنی(١٠) ساڵ بوو، لە ژێر چاودێری ئەتابەگێگ دابوو[3].

---

(1) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٢٥١؛ الذهبي، سیر اعلام النبلاء، ج١٥، ص٤١٨؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٩، ص٣٤٠؛ ابن تغري بردي، مورد اللطافة في من ولي السلطنة والخلافة، تحقیق: نبیل محمد، دار الكتب المصریة، القاهرة، ج٢، ص٧؛ محمد امین زكي، مشاهیر الكرد وكردستان، ج١، ص٢٧.

(2) الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٩، ص٣٤٠؛ محمد امین زكي، مشاهیر الكرد وكردستان، ج١، ص٢٧.

(3) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٣، ص ص٢٥١_٢٥٣؛ الذهبي، سیر اعلام النبلاء، ج١٥، ص٤١٨؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٩، ص٣٤٠؛المقریزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج١، ص٢٥٨؛ ابن تغري بردي، مورد اللطافة في من ولي السلطنة والخلافة، ج٢، ص٨.

**١١)مەلیك الظاهر :**

( أبو الفتح وأبو منصور غازي ابن السلطان صلاح الدين يوسف بن أيوب)نازناوی (الظاهر غياث الدين)ە، خاوەنی حلب بوو، ساڵی (٥٦٨ك/١١٧٢ن)لە (قاهیرە) لە دایکبووە، باوکی فەرمانڕەوای (حلب)ی لە ساڵی(٥٨٢ك/١١٨٦ن) بەو سپاردووە، فەرمانڕەوایەکی وشیارو بە هەیبەت بووە. بە دواداچوونی زۆری بۆ بارودۆخی خەڵکەکەی خۆی کردووە، دادپەروەر بووە، زانایان و شاعیران خۆشیان ویستووە[١]، لەگەڵ ئەوەشدا مەلیك (ظاهر) زاناو فەیلەسوفێکی ناوداری ئەوکات بەناوی (شهاب الدين السهروردی)[٢] دەست گیر کردووەو پاشان بە فەرمانی سوڵتان(صلاح الدين)ی باوکی کوشتویەتی، هەرچەندە (ابن خلكان) باسی بۆ چوونی جیاواز کردووە، لەسەر هۆکاری کوشتنی، هەندێك بەزەندەقەو بێباوەڕ لە قەڵەمیان داوە، هەندێکیش پێیان وابوو پیاوێکی چاکخواز وباش بووە[٣]

ڕای (ابن خلكان) لەم بارەوە هەرچی بێت، دەتوانین بڵێین: کوشتنی (سەهرەوەردی) یەکێك بوو، لەو ڕووداوە نەخوازراوانەی، کە لە سەردەمی (صلاح الدين)

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٦؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٧١٨؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٢٣؛ ابن العجمي، كنوز الذهب في تاريخ حلب، دار القلم، (حلب: ١٤١٧)،ج١، ص ص١٠٥_١٠٦؛العليمي، الأنس الجليل، ج١، ص٣٩٧.بۆ زانیاری لەسەر ئەو بەیتە شیعرانەی کەلەلایەن شاعیران بەسەر مەلیك(ظاهر) ووتراوە بڕوانە.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٧.

(٢) شهاب الدينالسهروردي: أبو الفتوح يحيى بن حبش بن أميرك، زانایەکی بەناوبانگ بووە لە زانستەکانی کیمیاوشەرعناسی وفلسفەوخاوەنی چەندین پەرتووك بووە وەکو(التنقيحات، التلويحات، حكمة الإشراق، هتد) لە ساڵی(٥٧٨ك/١١٨٢ن) لە زیندانی حلب کوژراوە.ياقوت الحموي، معجم الأدباء، تحقيق: احسان عباس، دار الغرب الاسلامي، (بيروت: ١٩٩٣)،ج٦،ص ص٢٨٠٦_ ٢٨٠٧؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٦، ص ص٢٦٨_٢٧٣.

(٣)وفيات الاعيان، ج٦، ص٢٧٣.

دا ڕوویدا. دەكرێت ئاماژە بۆ دوو هۆكاری سەرەكی بكەین لە پشتی ئەم ڕووداوەوە: یەكەمیان: ئەوەیە، كە زۆرجار لە مێژووی ئیسلامدا كێشە فكرییەكان لە ڕێگای سیاسییەوە مامەڵەیان لەگەڵ كراوە. خاڵی دووەمیش ئەوەیە، دەسەڵاتدارەكان بە پلەی یەكەم بە تەنگی ڕای گشتییەوە بوون و سڵیان لەو دەنگانە كردووەتەوە كە پێچەوانەی بیركردنەوەی گشتییە. هەر بۆیە ئەم ڕووداوە هاوشێوەی زۆر بووە.

دیارە پەیوەندیەكی خۆشەویستی و ڕێز لە نێوان سوڵتان(صلاح الدین)و مەلیك (الظاهر)ی كوڕی هەبووە، تەنانەت سوڵتان (صلاح الدین) لەسەر داوای مەلیك (ظاهر)ی كوڕی سێ ڕۆژ لە قەڵای (حلب) لای دەمێنێتەوەو بە جوانترین شێوە میواندارى كراوە لەلایەن كوڕەكەی[1].

بەم شێوەیە لەدەسەلات بەردەوام بووە، تاوەكو لە ساڵی(٦١٣ك/١٢١٦ز) لە قەڵای (حلب) كۆچی دوای دەكات و هەر لەوێش دەنێژرێت[2].لە دوای خۆی مەلیك (العزیز غیاث الدین أبو المظفر محمد ابن الملك الظاهر) كوڕی بۆتە فەرمانڕەوای (حلب) بەم شێوەیە بەردەوام بووە، لە فەرمانڕەوایی تاوەكو لە ساڵی(٦٣٤ك/١٢٣٦ز) لە (حلب) مردووە (ابن خلكان ) دەڵێت: ئەو كاتە لە (حلب) بووم، لە قەڵای (حلب)نێژرا[3]. لەدوای مەلیك (العزیز غیاث الدین)یش، مەلیك (الناصر صلاح الدین أبو المظفر یوسف ابن الملك العزیز) كوڕی شوێنی گرتۆتەوە، لە قەڵای (حلب) ساڵی(٦٢٧ك/١٢٢٩ز) لە دایكبووە، فەرمانڕەوای چەندین ناوچەی جەزیرەی فوراتی لە ئەستۆ دەگرێت. پاشان لە ساڵی(٦٤٨ك/١٢٥٠ز) دەسەڵاتی بەرەو (دیمەشق)و ناوچەكانی شام دەكشێت و

---

([1]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٧، ص١٩٢.

([2]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٤، ص٤٧؛ الیافعي، مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ج٤، ص٢٣؛ ابن العجمي، كنوز الذهب في تاریخ حلب، ج١، ص١٠٦.

([3]) وفیات الاعیان، ج٤، ص ص٩_١٠؛ ابن العجمي، كنوز الذهب في تاریخ حلب، ج١، ص١٠٧؛بابە شێخی مەردۆخ رۆحانی، مێژووی ناودارانی كورد، ب٣، ل١٨٠.

دەبێتە فەرمانڕەوای ئەو ناوچانەش، دواتر شام دەکەوێتە ژێر چنگی مەغۆلەکان، بۆیە لە (دیمەشق) دەڕوا و لە ساڵی(٦٥٨ك/١٢٥٩ز) لە نزیك (مراغە)ی سەر بە (أذربیجان) لەلایەن تەتەرەکان دەکوژرێت[1].

**١٢) مەلیك العادل بن أیوب :**

ناوی (أبو بكر محمد بن أبي الشكر أیوب بن شاذي بن مروان)، ( الملك العادل سیف الدین) نازناوی بووە[2] (ابن خلكان) لە بارەی ساڵی لەدایکبوونی دەڵێت: هەندێك پێیان وایە لە ساڵی (٥٣٨ك/١١٤٣ز) لە (دیمەشق) لە دایکبووە، هەندێکی تر پێیان وایە ساڵی (٥٤٠ك/١١٤٥ز) لەدایکبووە[3]، برای سوڵتان (صلاح الدین) بووە، لەگەڵ (اسد الدین)ی مامی و (صلاح الدین)ی برای چۆتە میسر. پاش ئەوەی (صلاح الدین) دەبێتە مەلیکی میسر، مەلیك (عادل ) لە کاتی ڕۆیشتنی (صلاح الدین) لە میسر بۆ شام، دەبووە جێگری لە میسر، یارمەتی و کەل وپەلی سەربازی بۆ( صلاح الدین ) دەنارده شام.

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص١٠؛ابن العجمي، كنوز الذهب في تاريخ حلب، ج١، ص ص١٠٧_١٠٨؛بابە شێخی مەردۆخ ڕۆحانی، مێژووی ناودارانی کورد، ب٣، ل١٨٠.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٧٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٤٥٢؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢، ص١٦٨؛ ابن الفرات، تاريخ ابن الفرات، تحقيق: حسن محمد، دار الطباعة الحديثة، (البصرة: ١٩٧٠ك)،مج٥، ص١؛ هيثم محمود يونس طيبان الحمداني، الملك العادل الايوبي، ص١٠.

([3]) وفيات الاعيان، ج٥، ص٧٨؛ محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان، ج١، ص١٦.بەڵام (الذهبي) و(الصفدي) دەڵێن لە (بعلبك) هاتۆتە دونیاوە، ساڵی لەدایك بوونی لەنێوان سێ بۆچوونی جیاواز (٥٣٤ك/١١٣٩ز) (٥٣٨/١١٤٣ز) (٥٤٠ك/١١٤٥ز) دایە. تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٤٥٢؛ الوافي بالوفيات، ج٢، ص١٦٨.بۆ زانیاری زیاتر لەسەرساڵی لەدایك بوونی بڕوانە. هيثم محمود يونس طيبان الحمداني، الملك العادل الايوبي دراسة سياسية عسكرية، رسالة ماجستير غير المنشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة الموصل (موصل: ٢٠٠٢)، ص١١.

ساڵی( ٥٧٩ك/١١٨٣ن) دەسەڵاتی (حەلەب)ی گرتە دەست، پاشان بەپێی ڕێکەوتنێك لە نێوان خۆی و(صلاح الدین)ی برای لە ساڵی (٥٨٢ك/١١٨٦ن)حەلەبی دایە دەست (الظاهري غازي ابن السلطان). بەرامبەر بەمە سوڵتان (صلاح الدین) ناوچەی تری پێدادوای مردنی (صلاح الدین) ململانێ دروست بوو، لە نێوان (عادل) و کوڕەکانی، سەرەنجام ساڵی (٥٩٦ك/١١٩٩ن) گەیشتە میسرو دەستی بەسەرداگرت، دواتر دەسەڵاتی لە زیادبووندا بوو، توانی پاشایەتی ئەو وڵاتەو

تەواوی ناوچەکانی شام بخاتە ژێر ڕکێفی خۆی. لە ساڵی (٦١٢ك/١٢١٥ن) دەستی بەسەر (یەمەن)یش داگرت، جگە لەمەش وڵاتی (أرمینیە) خستبووە ژێر قەڵەمڕەوی خۆی. دواتر دەسەڵاتی لە نێوان کوڕەکانی دابەش کرد، شامی سپاردە مەلیك (المعظم)و ناوچەی (میافارقین)و دەوروبەری دا بە مەلیك (الأوحد)، وڵاتی (یەمەن)یشی سپارد بە (المسعود صلاح الدین أبا المظفر یوسف المعروف بأطسیس ابن الملك الكامل)و ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی بە مەلیك (الأشرف)سپارد، وڵاتی میسری دا بە مەلیك (الكامل).(ابن خلكان) دەڵێت:(( مەلیك (عادل) پاتشایەکی گەورەو خاوەن ئەزموون و بە ئیرادە بوو، نوێژەکانی لە کاتی خۆی ئەنجام دەدا، زانایان و پیاوچاکانی زۆر خۆش دەویست، لە گەڵیان دا دەنیشت و لیێان بەهرەی وەردەگرت. بەو بۆ نەوە زۆرێك لە زانایانی ئەو سەردەم، بۆ دیتنی دەچوونە قاهیرە، ( فخر الدین الرازي م:٦٠٦/١٢٠٩ن) لە خوراسانەوە بۆ چاو پێکەوتنی گەیشتۆتە میسرو کتێبی (تأسیس التقدیس) بە ناوی ئەوەوە نووسیوە. مەلیك (عادل ) زۆر بەختەوەر بووە، وە یەکێك لە بەختەوەرییەکانی ئەو پیاوە منالی وای لە دوای خۆی بەجێهێشتووە، کە هیچ پاشایەك وەکو ئەو نەبووە، لە سیفەتی جوامێری و هیمەت بەرزی و فەرمانڕەوایی کردنی چەندین وڵاتدا، ژیانی پڕ بوو، لە خۆشی و تام وچێژ، وەرزی هاوین بەهۆی ئاوی سازگارو سەوزەو میوە

له شام ژیانی بەسەر دەبرد، له زستانیشدا بەهۆی ساردی یەوە له میسر دەبوو، چونکه ئاوو هەواکەی ناوەندو لە باربوو، لەم وەرزەدا بێسنور خواردنی دەخوارد))[1].

ئەم زانیاریه تەنها (ابن خلكان) باسی کردووە، تەنانەت (الذهبي)پشت ڕاستی ئەم زانیاریانەی کردووە، وتوویەتی له (ابن خلكان)م وەرگرتووە[2]، تەنها ئەوە نەبێت(ابن أبي أصيبعة م:٦٦٨ك/١٢٦٩ز) ئاماژەی بەو کتێبه کردووە، که (الرازي) نووسیوویەتی بۆ سوڵتان (عادل) سوڵتانیش هەزار دیناری پێداوە[3]. ( ابن خلكان) ئاماژەی بە شاعیران کردووە، کە چۆن ستایشی مەلیك (عادل)و کوڕەکانی کردووە[4]، هەر لە (دیمەشق) لە ساڵی(٦١٥ك/١٢١٨ز) کاتێ که خەریکی دابین کردنی هێزێك بوو، بۆ شەڕ لەگەڵ فەرەنجەکان له نزیك (دیمەشق) کۆچی دوای کرد[5].

**١٣)عماد الدين ابن المشطوب :**

( أبو العباس أحمد ابن الأمير سيف الدين أبي الحسن علي بن أحمدبن أبي الهيجاء ابن عبد الله بن أبي الخليل ابن مرزبان الهكاري)[6]، به (ابن المشطوب) ناسراوەو

---

(1)وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٧٤_٧٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٤٥٣.

(2) تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٤٥٣.

(3) عيون الأنباء في طبقاتالأطباء ، ص٤٧٠.

(4) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٧٦.

(5) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٧٨؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ص١٦، ص١٢٢؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢، ص١٦٨؛ محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان، ج١، ص١٨.بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ژیانی مەلیك (عادل) ی بڕوانه نامەی ماستەر(هيثم محمود يونس طيبان الحمداني، الملك العادل الايوبي دراسة سياسية عسكرية).

(6) الهكاري: کوردە هەکارییەکان دەگەڕێنەوە بۆ ناوچەی هەکاری له باشوری ڕووباری خابوری، کە زۆرینەی پێکهاتەکەی کوردن خاوەن چەندین قەڵای بەهێز وناوچە بوونە وەکو(جولميرط، العمادية، عقرة، الحسينية، داسن، فيشخابور..)،لە بەناوبانگترینیان قەڵای(اشب) بوو کەناوەندی سیاسیی هەکارییەکان بوو، هەکارییەکان بۆ یەکەم جار ڕێکەوتنی ئاشتیان لە سەر

نازنـاوی (عمـاد الـدين)بـوو، (المشـطوب) نازنـاوی باوکیـەتی[1] . لـە نزیکـەی سـاڵی (٥٧٥ك/١١٧٩ن) لـەدایکبووە[2]، میرێکـی گـەورەو خـاوەن رێـز بـووە، لای پاشـایان، کەسێکی هیمەت بەرز و ئـازاو بـە ناوبـانگ بـووە. یـەکێك بـوو، لـە میرەکـانی دەوڵـەتی سلاّحی[3]، هەروەها یـەکێك لـە گـەورە میرەکـانی دەوڵـەتی ئـەیوبی سـەردەمی مـەلیك (کامل) بووە[4] .

تـەنانـەت مێژوو نووسێك دەڵێت : (( ابـن المشـطوب لەسـەردەمی مـەليك (کامـل)بـە گەورەترین میری کوردی لە وڵاتی میسر هەژماردەکرێ))[5]. ململانێی سیاسـی لـە نێـوو بنەماڵەی ئەیوبی لەسەر دەسـەڵات ئەوەنـدە تەشـەنەی کـرد، بەڕادەیـەك بـووە هـۆی ئەوەی، لە دەرەوەی ئەو بنەماڵەیەش کە سانێك بەشداری لەو ململانێیە بکەن و هـەوڵی زیادکردنی پێگەو پایەیان داوە، میر (عماد الدين) یەکێك بوو، لەو میرانەی بەشداری لـەو

---

دەمی میر(ابو الهيجاء عبدالله بن مرزبان) لەگەل (عماد الدين زنكی) بەست تيايدا ملكەچيان بـۆ عماد الدين نيشـان دا. درويـش يوسـف حسـن، بـلاد هكـاري، دار سـثيرێز، (دهـوك: ٢٠٠٥)،ص ص٢٨، ٤٠_٥٢، ١١٧_١١٩؛ محمـد فتحـی الشـاعر، الاكـراد في عهـد عمـاد الـدين زنكـي، دار المعارف، (القاهرة: ١٩٩١م)،ص٤١.

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيـان، ج١، ص١٨٠؛ الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٣، ص٥٧١؛ الصـفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص١٤٨؛نەبەز مەجيد ئەمين، المشطوب الهكاري دراسة عن دور الهكـاريين في الحروب الصليبية، (السليمانية: ٢٠٠٢)،ص٥٩.

(2) ابـن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج١، ص١٨٢؛ الصـفدي، الـوافي بالوفيـات، ج٧، ص١٤٨؛نەبـەز مەجيد ئەمين، المشطوب الهكاري، ص٥٩.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيـان، ج١، ص١٨٠؛ الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٣، ص٥٧١؛ الصـفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص١٤٨.

(4) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٨٥٦؛ العبر، ج٣، ص٩٧.

(5) الخزنداری، تاريخ مجموع النوادر مما جرى للأوائل والأواخر، تحقيق: عمر عبـد السـلام تـدمری، المكتبة العصرية، بيروت، ص٣٩.

ململانێ سیاسیه کر هەولی هەلگەڕانەوەی لە دژی مەلیك (كامل) دا. (ابن المشطوب) لەگەلّ کۆمەڵێك لەسەرکردەو میرەکان ویستیان مەلیك (كامل) لە دەسەلاَت دوورخەنەوەو مەلیك (الفائز سابق الدین إبراهیم) برای بخەنە شوێنی، بەمەش بووە هۆی دوورخستنەوەی لە ولاَتی میسر[1]،

هەندێك لە مێژوو نووسان دەڵێن: میر (عماد الدین) دوای ئەوەی لە میسر دەرکرا، پەیوەندی بە مەلیك (الاشرف)كرد، ئەویش زۆر ڕێزی لێناو (ارجیش) پێدا، بەلاَم دواتر میر (عماد الدین) بە هاوکاری خاوەنی (ماردین) لە دژی مەلیك (الاشرف) هەلگەڕایەوە، چووە (تلعفر)[2].

پاشان بارودۆخی (ابن المشطوب)ی زیاتر تێك چوو، بە تایبەتی کاتێك لە (تلعفر) دەکەوێتە نێوان (موصل) و(سنجار) ئابلووقە درا، میر (بدر الدین لؤلؤ م:٦٥٧ك/١٢٥٨ز) ئەتابەگی (موصل) نوێنەری خۆی ناردە لای و تیایدا داوای ئەوەی لێ کرد، بێتە لای وملکەچی ئەو بێت و سوێندیشی بۆ خوارد، کە فێڵی لێ نەکات، بۆیە میر (عماد الدین) هاتە (موصل) ماوەیەك لەوێ مایەوە، دواتر میر (بدر الدین لؤلؤ) لە ساڵی(٦١٧ك/١٢٢٠ز) دەست گیری کردو ناردی بۆ لای مەلیك (الأشرف مظفر الدین ابن

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ٥، ص ص٧٩_٨٠، ١٨١؛ اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢،صص٢٢٥ _ ٢٢٦؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٢٨٦؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص١٢٧؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص١٤٨.بۆ زانیاری لەسەر هۆکاری ئەو پلانگێریە کەلەلایەن((عماد الدین أحمد بن المشطوب) کردی لە دژی مەلیك كامل بروانە(ذكرى عزيز محمد، عصر الملك الكامل الايوبي، رسالة ماجستير غير مشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب، جامعة الموصل،(الموصل: ١٩٨٨)، ص٢٠).

([2]) سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، تحقيق: ابراهيم الزيبق، الرسالة العالمية، (دمشق: ٢٠١٣)،ج٢٢، ص٢٣٨؛اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص ص٢٢٥_٢٢٦؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٢٨٦.

الملك العادل) ماوەیەك لای ئەویش زیندانی کراو دواتر لە زیندان دەردەچێت و پاشان مەلیك (الأشرف) دووبارە لە قەلای (حران) زیندانی دەکات و زۆر بە توندی زیندانی کردووەو تەنانەت بە ئاسنی قورس پێیەکانی کۆت کردبوو، دەستیشی بەدار گرێ دابوو[1]، دەکرێ سەرچاوەی ئەم زانیاریەی (ابن خلکان)ی، کتێبەکەی (سبط ابن الجوزي)بێت چونکە لێك چوونێکی زۆر لە نێوان زانیاریەکانی نووسەر لەگەل زانیارییەکانی (سبط ابن الجوزي) بەدی دەکرێ.[2]

تەنانەت (ابن خلکان) دەلێت: ئەوکاتە من بچووك بووم، گوێم لێ دەبوو، گوایە سەرو ڕیشی و جل و بەرگی پڕبووە لە ئەسپێ، وەپێیان ڕاگەیاندووم، هەندێك لە خزمەتکارانی ئەو بە دووبەیەت ئەم حالەیان بۆ مەلیك (الاشرف) نووسیبوو :

يا من بدوام سعده دار فلك ... ما أنت من الملوك بل أنت ملك

مملوكك ابن المشطوب في السجن هلك ... أطلقه فإن الأمر لله ولك[3].

(ئەی ئەوکەسەی بە بەردەوامی خۆشی بەخشینی کە شکەلان بەردەوام دەبێت لەسەر سوڕی خۆی...تۆ لە بەندە خاوەندارەکان نیت، بەلکو تۆ لەپادشایانی (ئیبنومەشتوبی ) بەندەت لە زینداندا فەوتا

بۆیە تۆش سەربەستی بکە، فەرمانی ئەو بەدەستخودایە و پاشان بە دەست تۆ)

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٨١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص١٤٨.

([2])مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، ج٢٢، ص٢٤٥.

([3]) وفيات الاعيان، ج١، ص١٨١. ئەوەی تێبینی دەکرێ هەریەکە لە (اليونيني) (الصفدی)،هەمان زانیاریەکانی نوسەریان لەبارەی (ابن المشطوب) دووبارە کردۆتەوە بەبێ ئەوەی ئاماژە بەناوی نوسەر بکەن. ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص ص٢٢٦_٢٢٧؛الوافي بالوفيات، ج٧، ص١٤٨.

بەردەوام بوو لەم بارەدۆخە ناخۆشەیە تاوەکو لە ساڵی(٦١٩ک/١٢٢٢ز) لە زیندان کۆچی دوای کر کچەکەی تەرمەکەی لە (حران) گواستەوە بۆ (راس عین)(سەرێ کانی)[1] لەوێ ناشتی[2]،

(ابن خلكان) دەڵێت: خۆم گۆڕەکەیم بینیووە[3]. مێژوو نووس (ابن خلكان) هەرلە پەراوێزی ئەو باسەی بۆ (عماد الدين ابن المشطوب)ی تەرخان کردووە، بە کورتی ئاماژەی بە میر (سيف الدين أبا الحسن علی ابن أحمد الهكاری)ی باوکی کردووە، کە بە(المشطوب )ناسراوە[4].

لەم بارەیەوە دەڵێت: ئەو کاتەی سوڵتان (صلاح الدين) هەستی بە مەترسی فەرەنجەکان کرد، میر (سيف الدين المشطوب)ی لە (عكا) دانا بۆ پارێزگاری کردن لێی، کاتێك فەرەنجەکان ئابلۆقەیەکی توندیان خستە سەری، ناچاربوو (عكا)بە جێبێلێت[5] .

پاشان لە ساڵی (٥٨٨ک/١١٩٢ز) گەیشتەلای سوڵتان لە( قدس). (ابن خلكان) لە ( ابن شداد )ی وەرگرتووەو باس لە ساتی گەیشتنی میر (سيف الدين المشطوب) دەکات بۆ لای سوڵتان لەوکاتەش (عادل) ی برای سوڵتانیش لەوێ بووە، دەڵێت: سوڵتان (صلاح الدين) لە بەری هەستایەوەو زۆر رێزی لێ گرتووە، تەنانەت بە هاتنی زۆر

---

([1]) راس عین(سەرێ کانی ): شارێکی گەورەو بەناوبانگە لە جەزیرە، دەکەوێتە نێوان (حران) و(نصيبين) و(دنيسر)،سەرچاوەی کانی زۆری تیایەئاوەکەشی سازگارە، گشتیان دەرژێنە ناو خابور.البكري، معجم ما استعجم من أسماء البلاد والمواضع، ط٣، عالم الكتب، (بيروت: ١٤٠٣)،ج٢، ص٦٢٣؛ياقوت الحموی، معجم البلدان، ج٣، ص١٤.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٨١؛اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٢٢٦؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٥٧١؛ الصفدي، الوفي بالوفيات، ج٧، ص١٤٨.

([3]) وفيات الاعيان، ج١، ص١٨١.

([4]) وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٢.

([5]) وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٢.

خۆشحاڵ بووە. دەمێکی زۆر بە یەکەوە قسەیان کردووە، سوڵتان ( صلاح الدین) (نابلس)[١]ی پێداوە[٢] . هیچ میرێك لە میرەکانی دەوڵەتی سلاحی بە قەد ئەو رێزو پایەی بەرز نەبوو، پێیان وتووە میری گەورە[٣] .

نووسەر هەر لە بارەی مردنی ئاماژەی بەوە کردووە، کەوا بە خەتی (القاضي الفاضل )[٤] بینیووە، تیایدا دەڵێت: (سیف الدین) میری کوردان و گەورەیان لە (شوال)ی سالی(٥٨٨ك/١١٩٢ن) لە شاری( قدس) کۆچی دوای کرد[٥]،

(١) نابلس: شارێکی گەورەیە لە فلستین، یەهودی زۆری تیایە، شاری سامرییەکانە، لەم شارەوە زەیتون بۆ میسر ودیمەشق رەوانە دەکرا. البکري، المسالك والممالك، دار الغرب الإسلامي، (بیروت: ١٩٩٢، ج١، ص٤٦٥؛ ابن الوردي، خریدة العجائب وفریدة الغرائب، ص١٠١؛ ابن بطوطة، تحفة النظار في غرائب الأمصار وعجائب الأسفار، اکادیمیة المملکة المغریبیة، (الرباط: ١٤١٧)،ج١، ص٢٥٤.

(٢) وفیات الاعیان، ج١، ص١٨٢؛الیونیني، ذیل مرآة الزمان، ج٢، ص٢٢٥؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٨٥٦.

(٣) وفیات الاعیان، ج١، ص١٨٣.

(٤) القاضی الفاضل: عبد الرحیم بن علي بن الحسن، لە بنەرەتدا عەسقەلانییە، لە میسر ژیاوە بە (قاضي فاضل) ناسراوە، وەزیری سولتان صلاح الدین بووە پێگەی زۆر گەورە بووە لەلای لەدوای مردنی سولتان هەمان پێگەو پۆستی دەبێت لە لای پاشا(العزیز) ی کوری سولتان.تاوەکو لە سالی(٥٩٦/١١٩٩ن) دەمرێت.ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص ص١٥٨_١٦٢؛معالي عبدالسلام الحلبي، رسائل القاضي الفاضل السیاسیة في عهد صلاح الدین الایوبي، رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الى کلیة الاداب، جامعة غزة، (فلسطین: ٢٠١٣)،ص٧.

(٥) وفیات الاعیان، ج١، ص١٨٣.

ئەو زانيارييە ديارە بە تەنها (ابن خلكان) ئاماژەی پێكردووە، چونكە هەر لە دوای خۆی لەلايەن مێژوو نووسی تر پشت ڕاست كراتەوە، بە هەمان زانياری و دەڵێت: لە (ابن خلكان)م وەرگرتووە[١].

( أبو الهيجاء)ی باپيرەی (عماد الدين ابن المشطوب)يش خاوەنی (العمادية)(ئامێدی) و لەگەڵ چەندين قەڵای ولاتی هەكاری لە ژێر دەست دابوو[٢].

**١٤)مەليك الأفضل ابن صلاح الدين:**

(أبو الحسن علیابن السلطان صلاح الدين يوسف بن أيوب)ە، نازناوی (الملك الأفضل نور الدين)بوو[٣] . (ابن خلكان) سەبارەت بە ساڵی لە دايكبوونی ئاماژەی بەدوو بۆ چوون كردووەو دەڵێت: هەندێك دەڵێن: لە ڕۆژی چەژنی رەمەزانی ساڵی(٥٦٥ك/١١٦٩ز) لەدايكبووە، هەندێكی تر دەڵێن: ساڵی( ٥٦٦ك/١١٧٠ز) لە( قاهيرە) لە دايكبووە، ئەوكاتە باوكی وەزير بووە لە ميسر[٤].

---

(١) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٢٢٥.بۆ زانياری زياتر لەسەر گوزشتەی(مشطوب الهكاری) بڕوانە(نەبەز مەجيد ئەمين/المشطوب الهكاري).

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٨١؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٥٧١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص١٤٨.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٩؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٨٦؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٤٢؛ الفاسي، شفاء الغرام بأخبار البلد الحرام، دار الكتب العلمية(بيروت: ٢٠٠٠م)،ج١، ص٤٣٥؛بابە شێخی مەردۆخ رۆحانی، مێژووی ناودارانی كورد، ب٢، ل١٦٩.

(٤)وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٢١. (سبط ابن الجوزي) دەڵێت مەليك (الافضل) لەساڵی(٥٦٥ك/١١٦٩ز) لەدايك بووە، مراة الزمان، ج٢٢، ص٢٧٦.

بەڵام مێژوو نووسانی پێش (ابن خلكان) دەڵێن : لە ساڵی (٥٦٥ك/١١٦٩ن)لەدایك بووە[١]لەلای چەندین زانای میسری و شامی خوێندووەو ئیجازەی وەرگرتووە[٢].

گەورەترین کوڕی (صلاح الدین) بووە، بۆتە جێنشینی، کاتێك باوکی لە (دیمشق) نەخۆش کەوت، ئەو لەگەڵی دابوو، لە دوای مردنی باوکیشی دەبێتە خاوەنداری (دیمەشق) (الملك العزیز)ی براشی دەسەلاتی لەسەر میسر جێگیر بوو[٣]، دواتر ململانێ دروست بوو، لە نێوان مەلیك ( الافضل) لەلایەك و مەلیك( العزیز)ی برای و مەلیك ( العادل)ی مامی لەلایەکی ترەوە، بەم شێوەیە مەلیك (العزیز) ومەلیك ( العادل) ئابلۆقەی (دیمەشق) یان داو دەستیان بەسەر داگرت. بەرامبەر بەمەش (صرخد)[٤] یان دا بە مەلیك ( الافضل) ماوەیەك تێپەڕی مەلیك (العزیز) مرد (الملك المنصور محمد)کوڕی کە تەمەنی بچووك بوو، شوێنی گرتەوە، ئەم کوڕە لە ساڵی(٥٩٥ك/١١٩٨ن) داوای لە مەلیك ( الافضل) کرد، بێتە لای و چاودێری وسەرپەرشتی بکات، بەم شێوەیە چووە لای، پاشان مەلیك (عادل) دەستی بە سەر میسر داگرت و دواتر بەفەرمانی مەلیك (العادل)

---

(١) عماد الدینالأصبهاني، البرق الشامي، تحقیق: فالح حسین، مؤسسة عبد الحمید شومان، (عمان_١٩٨٧م)،ج٣، ص٧٦؛ أبي شامة، عیون الروضتین في أخبار الدولتین النوریة والصلاحیة، ج٢، ص١٥٣.ئێمەش لەگەل ئەو بۆچوونەداین.

(٢) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤١٩.

(٣) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤١٩؛ ابن العبري، تاریخ مختصر الدول، ص٢٢٣؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٨٦.

(٤) صرخد: قەلایەکەکی سەختە سەر بە (حوران) ە، ناوچەیەکی چاك و فراوانە.یاقوت الحموي، المعجم البلدان، ج٣، ص٤٠١؛ ابن عبد الحق البغدادي، مراصد الاطلاع، ج٢، ص٨٣٨.

دەسەلاتی (سمیساط)[1] گرتە دەست، ماوەیەك لەویٚ مایەوە، تاوەكو لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ن) هەر لەویٚ كۆچی دوای كرد[2].

لێرەدا (ابن خلكان) زانیاریەكی دەگمەن لەسەر پەیوەندی نێوان مەلیك (الافضل)و (ضیاء الدین)ی برای (ابن الاثیر)ی مێژوو نووس، دەگێڕێتەوەو دەڵێت:( (ضیاء الدین) كاتیٚ خوێندنی تەواو كرد و پێگەیشت، لای سوڵتان ( صلاح الدین) دامەزراو پاشان سوڵتان كردی بە وەزیری مەلیك (الافضل)كوڕی. ( ضیاء الدین) لە كاروباری خۆیدا زۆر سەربەست و كارامە بوو، وەزیرایەتی حكوومەتی (دیمەشق)ی بەڕێوە دەبرد، هەتا مەلیك (الافضل)یان لەشام دەركرد ( ضیاء الدین)ی وەزیر زۆر ئەترسا كەتنێكی پیٚ بكەن، لە شاری (دیمەشق) دا خۆی حەشار داو كەس نەیدەدیت و لە ئەنجامدا یەكێك لە پەردەدارانی مەلیك (الافضل)خستیە ناو سندوقێك و شاردییەوەو بردیە میسر، لەوێش ببووە جێگرو وەزیری كوڕی (العزیز)، كاتیٚ مەلیك (عادل) میسری كەوتە دەست (ضیاء الدین) دیسان توانی خۆی رزگاربكە و بەر چەنگی (عادل)نەكەویٚ، كاتێك مەلیك (الافضل) لە (سمیساط) جێگیربوو، دووبارە چووە لای و خزمەتی كرد، پاشان ڕوویكردە (حلب) ماوەیەك لای مەلیك (الظاهر)مایەوەو لەوێشەوە چوو بۆ (موصل).[3]لەم بارەیەوە (أبي شامة م:٦٦٥ك/١٢٦٦ن)كە پێش (ابن خلكان) ژیاوە، تەنها ئاماژەی بەوە كردووە، كەوا مەلیك (عادل) لە كاتی كۆبوونەوەی لەگەڵ مەلیك

---

([1]) سمیساط: شارێكە لەسەر كەناری فورات، لەبەرەی (بلاد روم)،قەلایەكی تیایە دانیشتوانەكەی ئەرمەنی بوون، یاقوت الحموي، المعجم البلدان، ج٣، ص٢٥٨.

([2]) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤١٩_٤٢١؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٣٥؛ ابن الوردي، تاریخ ابن الوردي، د٢، ص١٤٣؛ الیافعي، مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ج٤، ص٤٢؛ المقریزي، المواعظ والاعتبار، ج٣، ص٤٠٩؛العلیمي، الأنس الجلیل بتاریخ القدس والخلیل، ج١، ص٣٩٨.

([3]) وفیات الاعیان، ج٥، ص ص٣٩٠_٣٩١.

(الافضل) داوای لێ کردووە، کە وەزیر (ضیاء الدین) لە خۆی دوور خاتەوە، مەلیك (الافضل)یش ڕەتی کردۆتەوە[1].

ئەم زانیاریە تەنها (ابن خلکان) ئاماژەی پێکردووە، لە دوای خۆی هەریەکە لە (الذهبي)و (اليافعي) پشت ڕاستیان کردۆتەوە، بەوەی لە (ابن خلکان)یان وەرگرتووە[2]. تەنانەت ( ابن خلکان) لەسەر گوزشتەی (ابن الاثیر) دا، باسی بینیی کۆمەڵێك شیعرو پەخشانی کردووە، کە بە (مجموعا) ناوی هێناوە، لەلایەن (ضیاء الدین) ەوە، بۆ مەلیك (الاشرف)نووسیبووی[3]. دوای خۆشی (زرکلی) دەڵێت: (ابن خلکان) ئەو کتێبەی بینیوەو ئاماژەی پێکردووە[4]،

لێرەدا پێویستە بپرسین چ هۆکارێك هەبووە کەوای لە مەلیك (عادل) کردووە، داوای دوورخستنەوەی وەزیر (ضیاء الدین)ی لە مەلیك(الافضل)کردووە، لەوانەیە لەبەر ئەوە بوو بێت وەزیرێکی سەرکەوتوو بووە، لە کارەکانی تەنانەت هۆکارێك بووە بۆ بەهێز بوونی مەلیك (الافضل) لە فەرمانڕەواییەکەی بەرادەیەك مەلیك (عادل) ترسی لێنیشتووە، داوای دوورخستنەوەی کردووە، دەتوانین بڵێین: وەزیر (ضیاء الدین) فاکتەرێکی سەرەکی بووە، بۆ زیاد بوونی ململانێی سیاسی نێوان مەلیك (عادل)و (الافضل).

---

[1] عيون الروضتين في أخبار الدولتين النورية والصلاحية، ج٤، ص٤٢٥.

[2] تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٢٥٨؛مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٧، ص٤٤.

[3] وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٩٧.

[4] الاعلام، ج٧، ص١٢٥.

**١٥)مەليك المعظم ابن العادل :**

مەليك (المعظم شرف الدين عيسىابن الملك العادل سيف الدين أبي بكر بن أيوب)، فەرمانڕەوای (دیمەشق) بووه[١]، (ابن خلكان) دەڵێت: له ساڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ن له دایكبوه[٢]، له هەمان كاتیشدا ئاماژەی به بۆ چونی (سبط ابن الجوزی) له كتێبی (مرآة الزمان)یشی كردوه، لەم بارەیەوه دەڵێت: له ساڵی (٥٧٦ك/١١٨٠ن له (قاهیره) لەدایكبووه[٣]. وەك نوسەر ئاماژەی پێكردووه، ( سبط ابن الجوزی) هەمان زانیاری دەربارەی ساڵی له دایكبوونی، له كتێبەكەیدا ئاماژه پێكردووه[٤]. لێرەدا پەرۆشی نوسەرمان بۆ دەردەكەوێ كه چەندە سور بووه لەسەر وردبینی له تۆماركردنی ڕووداوه مێژوويیەكان بەرادەیەك هەوڵی داوه هەرچی زانیاری و بۆ چوونی جیاواز دەربارەی ژیانی ئەو پاشا ئەیوبیانه لەسەرچاوه مێژوويیە گرنگەكان هەیە، ئاماژەیان پێبكات و تۆماريان بكات.

مەليك (المعظم) و زاناو ئازاو مەندو بەسام بووه، له نێو بنەماڵەی ئەیوبیی تەنها مەليك (المعظم) لەسەر مەزهەبی حەنەفی بووه[٥]، چونكه بنەماڵەی ئەیوبیی شافعی

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٤؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٢٩؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٧٧٧؛القرشي، الجواهر المضية في طبقات الحنفية،ج١، ص٤٠٢؛الخزرجي، العقود اللؤلؤية في تاريخ الدولة الرسولية، تحقيق: محمد بن علي، دار الاداب، (بيروت: ١٩٨٣)،ج١، ص٤٧.

([٢])وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٤؛القرشي، الجواهر المضية في طبقات الحنفية،ج١، ص٤٠٣.

([٣]) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٥؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٧٧٧؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٥، ص١٠٧.

([٤]) مرآة الزمان في تاريخ الاعيان،ج٢٢، ص٢٨٥.

([٥]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٤؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٣٨؛ الذهبي، معرفة القراء الكبارعلى الطبقات ولأعصار، دار الكتب العلمية، (بيروت:

مەزهەب بوون[1]، لە دوای خۆشی منالەکانی لەسەر ئەم مەزهەبەوە ڕۆیشتوون، لە ساڵی( ٦١١ك/١٢١٤ز) سەردانی ماڵی خوای کردووەو بۆتە حاجی[2]، سنوری دەسەڵاتەکەی زۆر فراوان بووە، لە (حمص) درێژ بۆتەوە بۆ (عریش)[3] . بەردەوام بوو، لە فەرمانڕەواییەکەی تاوەکو لە ساڵی( ٦٢٤ك/١٢٢٦ز) لە (دیمەشق) کۆچی دوای کرد، لە دوای خۆشی مەلیك ( الناصر صلاح الدین داود)ی کوڕی شوێنی گرتەوە، مەلیك ناصر لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦ز) لەدایکبووەو ماوەیەك حوکمی کردووەو تاوەکو لە ساڵی (٦٥٦ك/١٢٥٨ز) لە (دیمەشق) کۆچی دوای کرد[4].

---

١٩٩٧)،ص٣١٩؛القرشي، الجواهر المضية في طبقات الحنفية،ج١، ص٤٠٣؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٤٦.

(1) أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٣٨.(ابن تغري بردي) دەڵێت مەلیك(العادل) ی باوکی داوای لێ کردووە بگەڕێتەوە بۆ سەرمەزهەبی شافعی، ئەویش ڕەتی کردۆتەوە.النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢١١.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٤؛القرشي، الجواهر المضية في طبقات الحنفية،ج١، ص٤٠٣.

(3) عریش: یەکەم شاری میسرە لە بەرەی شام، کەوتۆتە سەرکەنارەکانی دەریایی ڕۆم لەناوەڕاستی بیابانە.ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج٤، ص١١٣.

(4) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٤٩٥_٤٩٦؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج١، ص٢٤٣؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٨٠٤؛الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص٤١٩؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٣٠٢؛محەمەد ئەمین زەکی بەگ، خولاصەیەکی تأریخی کوردو کوردستان، بنکەی ژین(سلێمانی: ٢٠٠٦) ب٤، ل١٣٩.

**١٦)صلاح الدين الاربلي:**

(أبو العباس أحمد بن عبد السيد بن شعبان بن محمد بن جابر بن قحطان الإربلي)ه، نازنازى (صلاح الدين الاربلي)بوو[١]، له سالّى(٥٧٢ك/١١٧٦ن) له هەولێر لەدايكبووه[٢] .

(ابن خلكان) هەرچەندە خەڵكى هەولێر بووه، شارەزاى بنەماڵەكەى بووه، دەڵێت: له بنەماڵەيەكى گەورەو ديارى هەولێر بووه، هەر خۆشى (صلاح الدين)ى بينيوه، بەلام نەى وتووه كوردە[٣].

كەچى (ابن العديم) له بارەى ئەو كەسەوه دواوەو ئاماژەى به رەچەڵەكى كردووەو دەڵێت: كوردى (هەزبانى)[٤] يە[٥].سەرەتا پەردەدار بووه لەلاى سوڵتان (مظفر الدين بن زين الدين)ى خاوەنى هەولێر، دواتر ماوەيەك زيندانى دەكرێ، لە دواى ئازاد بوونى له سالّى(٦٠٣ك/١٢٠٦ن) كۆچ دەكات بۆ شام. لەوێ خزمەتى (الملك المغيث ابن الملك العادل)دەكات، تا مردنى(المغيث) هەر لاى ئەودەبێت، پاشان بەرەو ولاتى ميسر بەرێدەكەوێت، دەبێتە كاربەدەست لەلاى (الملك الكامل) پێگەى زۆر گەورە دەبێت و دەبێتە مير، پاشان ئەم پێگەيەى لەدەست دەچێت. له نێوان سالانى

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٤؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٣٤؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص٤٠.

([٢]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص ص١٨٤_١٨٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٣٤؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج١، ص١٥٠.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٤.

([٤]) هەزبانى: هۆزێكى گەورەى كوردن له ناوچەكانى (اربل) و(ارمية) و(شنو) (مراغة) و(سلماس) (شهرزور) (جەزيرەى فوراتى) وهتد نيشتەجێ بوونه.بۆ زانيارى زياتر بروانه. احمد عبد العزيز محمود، الامارة الهذبانية الكردية، التفسير، ط٢(اربيل: ٢٠٠٦) ص ص٢٩_٤٥.

([٥]) بغية الطلب في تاريخ حلب، ج٢، ص٩٨٣.

(٦١٨ك/١٢٢١ن)بۆ(٦٢٣ك/١٢٢٦ن) زیندانی دەکرێ لەلای (الملك الكامل) پاشان ئازاد دەکرێ و دەگەڕێتەوە بۆ هەمان دەسەڵات و پێگەی خۆی[1].

پێدەچێ ئەم زانیاریە (ابن خلكان) لە کتێبەکەی (ابن المستوفی) وەرگرتبێت، چونکە لێك چوون لە نێوان زانیاریەکان بەدی دەکرێ، تەنها ئەوە نەبێت (ابن المستوفی) ئاماژەی بە هیچ ساڵی ڕووداوەکانی (ابن صلاح)ی نەکردووە[2].(صلاح الدين الاربلي)پێگەیەکی دیاری هەبووە، هەر بۆیە لە سەرچاوەی تر بە میری گەورە ناویی هاتووە[3]، تاوەکو لەگەڵ سوپایەك دەردەچێت بۆ وڵاتی ڕۆم و لە ئۆردوگای سەربازی نەخۆش دەکەوێت و لە شاری (ڕوها)[4] لە ساڵی(٦٣١ ك/١٢٣٣ن)دەمرێت. پاشان تەرمەکەی لەلایەن کوڕەکەی لەساڵی(٦٣٧ك/١٢٣٩) دەگوازرێتەوە بۆ میسر، هەر لەوێش دەنێژرێ. (ابن خلكان) دەڵێت: ئەوکات من لە قاهیرە بووم[5]،

جێی ئاماژەیە هەریەکە لە (الذهبي)و (الصفدی) هەمان زانیاریەکانی نووسەریان لە مەڕ ژیانی (صلاح الدين الاربلی) دووبارە کردۆتەوە، بەبێ ئەوەی ناوی (ابن

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٣٤؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج١، ص١٥٠.

(2) تاريخ اربل، تحقيق: بشار عواد وصلاح محمد، دار الغرب الاسلامی، (تونس: ٢٠١٣)،ج٥، ص ص٣١٣_٣١٤.

(3) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٣٤.

(4)الرها: شارێکە کۆن وگرنگە لە جەزیرە، ماوەی نێوان (الرها) و(حران) نزیکەی(٦) فەرسەخە. الحميرى، الروض المعطار في خبر الأقطار، تحقيق: احسان عباس، ط٢، دار السراج، (بيروت: ١٩٨٠) ص٢٧٣؛ حكيم احمد خوشناو، الكورد وبلاده عند البلدانيين والرحالة المسلمين، دار الزمان، (دمشق: ٢٠٠٩)،ص١٦٤.

(5) وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٧.

خلكان)بهێنن، تەنانەت جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان زانیاریەکانی (ابـن خلکـان) لەگـەڵ هەریەکە لە (الذهبي)و (الصفدی) بەدی ناکریٚ[١] .

١٧)مەلیك الزاهر :

( أبوسليمان داود ابن السلطان صلاح الدين يوسف بن أيوب) نازنازی (الزاهر مجـير الدين)بوو[٢]، لە ساڵی (٥٧٣ك/١١٧٧ن) لە (قاهیرە) لـە دایکبـووە، دوازدەهـەمین کـوڕی سوڵتان (صلاح الدين)ە [٣]، فەرمانڕەوای قەڵای(البيرة)[٤]بوو[٥].کەسێکی زانست دۆسـت و زاناپەروەر بـووە، زانایـان لـە هـەموو لایەکـەوە هاتوونەتـە دیـداری[٦] و ئیجـازەی لـە (المؤيد الطوسي)وچەندین زانای تر وەرگرتووە[٧] .

---

([١])تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٣٤؛ الوافي بالوفيات، ج٧، ص ص٤٠_٤١.

([٢]) ابن خلكان، وفيـات الاعيـان، ج٢، ص٢٥٧؛ اليـونيني، ذيـل مـرآة الزمـان، ج٢، ص١٨؛الـذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٦٩؛المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج١، ص٣٧١؛ ابن العجمـي، كنوز الذهب في تاريخ حلب، ج١، ص١٢٧.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيـان، ج٢، ص٢٥٨؛ اليـونيني، ذيـل مـرآة الزمـان، ج٢، ص١٨؛الـذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٦٩.

([٤]) قلعة البيرة: قەڵایەکی بتەوسەختە لە سەر کەناری فوراتـە نزیـك (سميسـاط) لـە نێـوان (حلـب) وسنوری ڕۆمەکانە، هەر بەوناوەش شارێکی کۆن هەیە لە (اندلس) کە وێران بووەوخەڵکەکەشی کۆچیان کردووە بۆ (غرناطة).ياقوت الحموي، المعجم البلدان، ج١، ص٥٦٢؛ابن خلكـان، وفيـات الاعيان، ج٢، ص٢٥٧؛ابن الوردي، خريدة العجائب وفريدة الغرائب، ص٦٨.

([٥]) ابن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٢، ص٢٥٧؛ الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٤، ص٦٩؛ الصـفدي، الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٣١٧.

([٦]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٥٧؛اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص١٨.

([٧])الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٤، ص٦٩؛ابـن كـثير، البدايـة والنهايـة، ج١٣، ص٣٩٣؛ النعيمـي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٤٧٧.

(ابن خلكان) دەڵێت: كۆمەڵێك لە مەلیك (الزاهر)یان گێڕاوەتەوە، وتوویەتی هەر كەسێك بیەوێ (صلاح الدين) ببێنێت با من ببینێت، من لە هەموو منالەكانی زیاتر لەو دەچم.(ابن خلكان) دەڵێت لە ساڵی (٦٣٢ك/١٢٣٤ن) لە قەلای (البيرة) كۆچی دوای كرد، ئەو كاتە من لە (حلب) بووم، هەواڵی مردنی گەیشت، مەلیك (العزيز)ی كوڕی مەلیك (الظاهر)ی برای بەرەو ئەو قەلایە چوو دەستی بەسەر داگرت[1].

١٨) **مەلیك كامل الايوبي :**

(أبو المعالي محمد، ابن الملك العادلأبو بكر محمد بن أبي الشكر أيوب بن شاذي بن مروان)ە، نازناوی مەلیك (الكامل ناصر الدين) خاوەنی ولاتی میسر[2] .(ابن خلكان ) دەڵێت لە دەست نووسێكم بینی لە ساڵی (٥٧٦ك/١١٨٠ن)لەدایكبووە[3]، دوای ئەوەی لە ساڵی (٦١٤ك/١٢١٧ن) مەلیك (عادل)ی باوكی ناوچەكانی ژێر دەسەلاتی بەسەر

---

([1])وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٥٨.هەروەها بڕوانە: اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٤١٨؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٥٦؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٦٩؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٣١٧.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٨٩؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص١٨٥؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٤٣؛القلقشندي، نهاية الأرب في معرفة أنساب العرب، تحقيق: إبراهيم الإبياري، ط٢، دار الكتاب، (بيروت: ١٩٨٠) ص١٠١؛ذكرى عزيز محمد، عصر الملك الكامل الايوبي،ص١١.

([3]) وفيات الاعيان، ج٥، ص٨٣.هەروەها لەچەند سەرچاوەی تریش هەمان ساڵی لەدایك بوونی دووپات كراوەتەوە. الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص١٨٥ ؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٧٤.بۆچوونی جیاواز لەسەر ساڵی لەدایك بوونی لە نێوان مێژوونوسان بەدی دەكرێ بۆ زانیاری لەم بارەیەوە بڕوانە(ذكرى عزيز محمد/ عصر الملك الكامل الايوبي، ص١٢).

کوڕەکـانی دابــەش کـرد، مــەلیك (کامـل) ولآتــی میسـری بەرکـەوت[١] . لـە سـاڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز) پاش ئەوەی باوکی مرد، لە سەروبەندی دەسـەڵاتیدا، ڕووبـەڕووی دوو مەترسی بۆیەوە. هێرشی فەرەنجەکان بۆ (دمياط)[٢] لەلایەك و هـەروەها هەڵگەڕانـەوەی (عمـاد الـدين أحمـد بـن المشـطوب) لەگـەڵ کۆمـەڵێك لەسـەرکردەو میرەکـان لـە دژی دەسەلاتی، ویستیان مەلیك (کامل) لـە دەسـەلآت دوور خەنـەوەو مـەلیك (الفـائز سـابق الدين إبراهيم) بـرای بخەنـە شـوێنی.مـەلیك ( کامـل) ئاگـادار ئـەم بارەدۆخـە بـوو، هـیچ کاردانەوەیەکی نیشان نەدا، تـاوەکو مـەلیك (معظـم)ی بـرای لـە سـاڵی (٦١٥ك/١٢١٨ز) هاتە میسر و بارەدۆخەکەی بۆ باس کردو پێی ڕاگەیاند بەرپرسی ئەو پلانگێریـە (عمـاد الــدين أحمــد بــن المشــطوب)ە، لەبەرامبــەر ئەمەشــدا مــەلیك (معظــم) تــوانی زۆر بەسەرکەوتووانە (عماد الدين أحمد بن المشطوب)و مەلیك (الفـائز سـابق الـدين إبـراهيم) برای دوور بخاتەوە بۆ دەرەوەی میسـر، مـەلیك ( الفـائز سـابق الـدين إبـراهيم) هـەر لـە سنجار مر بەم شێوەیە گشت سەرکردەکان چوونە ژێر فەرمانی (مەلیك کامل)[٣].

پاشان مەلیك (کامل) سوپایەکی پێك هێناو چـووە بەرامبـەر فەرەنجـەکان، مـەلیك (معظم)ی براشی بە هێزی خۆیەوە هاتە پاڵی و شەڕێکی توند و هەمەلایەنە دەستی پـێ

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٧٦؛ ابن تغري بـردي، النجـوم الزاهـرة، ج٦، ص ص١٦٣، ٢٢٧؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٧، ص٢٨.

(٢) دمياط: دەکەوێتە هەرێمی چوارەم، لەسەر کەناری دەریایە، هەر لەو شارە ئاوی (نیل) کۆتـای پێدێت بەشێکی بۆ دەرایی تنیس دەڕوات، شاری تنیس نزیکترین شارە لەسەرکەناری دەریا لە (دمیـاط)،بەشەکەی تری بۆ ناو دەریای سوور دەڕژێت.، خەلکەکەشی دەولەمەندن، لـە ڕێگـەی ئەم شارەوە بە کەشتی دەڕۆیشتن بۆ ولاتی ڕۆم.اليعقوبي، البلدان، ص١٧٦؛اسحاق بن المنجم، آكام المرجان في ذكر المدائن المشهورة في كل مكان، عالم الكتب، (بيروت: ١٤٠٨)،ص٨٧.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٧٩_٨٠؛أبـو الفـداء، المختصـر في أخبـار البشـر، ج٣، ص١٢٠؛الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦،ص١٢٧.

کرد، سەرەنجام دوژمن شکاو بەرەو پاش کشایەوە. شاری (دمیاط) لەلایەن فەرەنجەکان تەسلیم بە مەلیك (کامل) کرا[1] .

لە دوای ئەم سەرکەوتنە مەلیك (کامل) گەڕایەوە بۆ (قاهیرە) و دەستی کرد بە ئاوەدانی ولآت، مەلیك (کامل) پاتشایەکی مەزن و جوامێر و لایەنگری زانایان بوو، بەخشینی بە ئەندازە بوو، نەدەست تەنگ و نە زێدەرەوی دەکرد، بیروباوەڕێکی باشی هەبوو، شەوانی هەینی بۆ کۆڕی زانایان تەرخان کردبوو، بۆ خۆشی تێگەیشوو بوو، بەشداری دەکرد و وەلآمی پرسیارەکانی وەردەگرت. سالّی (٦٢٦ك/١٢٢٨ز) دوای مەرگی مەلیك (معظم)ی برای، کە فەرمانڕەوای شام بوو، بۆ خۆی چووە (دیمەشق) و دەسەلآتی ئەو ولآتەی دایە دەستی مەلیك (الأشرف مظفر الدین موسی)برای و بەرامبەر بەمە ناوچەکانی(حران والرها وسروج والرقه ورأس عین)ی وەرگرت[2] .

دواتر گەڕاوە (قاهیرە) و کەوتە کۆکردنەوەی لە شکرو هێزێکی گەورەی پێك هێناو سالّی (٦٢٩ك/١٢٣١ز) ڕووی کردە ناوچە کوردیەکان و(آمد)[3]و باقی ناوچەکانی ئەو شوێنانەی لە دەستی مەلیك (مسعود رکن الدین مودود)[4]ی دەرهێنا[1] .

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٩٠؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٣٠.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٨١؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٦١؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص ص١٤٥، ١٧٤؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٧، ص٢٨.

([3]) امد: گەورەترین شاری دیاربکرە هاوسنورە لەگەل ولاتی رۆم. ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، ص٥٦؛ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٩٤.

([4]) مسعود ركن الدين مودود: کوریمەلیك(صالح الصالح محمود بن محمد بن قرا أرسلان بن داود بن سقمان بن أرتق) ه، پیاوێکی فاسق وزالم وداوێن پیسبوو.ماوەیەك زیندانی کرا لەلایەن مەلیك کامل، دواترلەلایەن تەتەرەکان دەکوژرێت.أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٥٢؛الذهبي، العبر، ج٣، ص٢٠٥.

بەم شێوەیە چەندین ناوچەی لە ژێر دەسەڵات دابوو، میسر و شام و حیجازو یەمەن و ئامەدیشی دەگرتەوە، بەسەر هەر بەشێكیدا كەسێكی خۆی دانابوو. بۆ ناوچەكانی ڕۆژهەلات و (امد) مەلیك (الصالح نجم الدین أبا المظفر أیوب) كوڕی دانا، میسریشی بەكوڕە بچوكەكەی مەلیك (العادل سیف الدین أبا بكر) دابوو. هەروەها (یەمەن وحیجان)ی دا بە مەلیك (المسعود)ی كوڕە گەورەی[٢].

دیارە (ابن خلكان) خودی خۆی مەلیك (كامل)ی بینیوە، چونكە هەر خۆی دەڵێت :مەلیك (كامل)م بینی، لە كاتی گەڕانەوەی بۆ (دیمەشق) لە ساڵی (٦٣٣ك/١٢٣٥ن)[٣]، مەلیك (كامل) سەردەمێك بەسەر بەرزی و سام و شكۆوە ژیاوە، نزیكەی (١٠) مەلیك لە ژێر خزمەتی ئەودابوون[٤]،

---

(١) ابـن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٥، ص٨٢؛ أبـو الفـداء، المختصـر في أخبـار البشـر، ج٣، ص١٥٢؛الذهبي، العبر، ج٣، ص٢٠٥؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٥٥.

(٢) ابـن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٥، ص٨٢؛أبـو الفـداء، المختصـر في أخبـار البشـر، ج٣، ص١٤٢؛الـذهبي، العـبر، ج٣، ص١٥٢؛اليـافعي، مـرآة الجنـان وعـبرة اليقظـان، ج٤، ص٧٢؛المراكشي، الذيل والتكملة لكتابي الموصول والصلة، تحقيق: إحسان عباس، دار الثقافة، (بـيروت: ١٩٦٥)،السـفر الخـامس،ج٢، ص٦٩٢.ابـن خلكـان لـەبارەی مـەلیك(مسـعود بـن كامل)دەلێت لە سالی(٦٢٦ك/١٢٢٨ن) لە مەككە مرد، وەسەتی كردبـوو ئەگـەر مـرد تـەرمەكـەی بەشێخ(صديق بن بدر بن جناح) كوردی هەولێری بووە، بەو بسـپێرن، ئـەو چـۆنی كفـن ودەفـن دەكا باوابی، شێخ(صديق) بەرامبەر بەو وەسیەتە، بەو بەرگەی خۆی كە زۆر سالان پێوە حەج وعومرەی بەجێ هێنابوو، كفنی كردو وەكو كەسانی ئاسایی لـە(معلی) دا ناشـتی وەك خـۆی ویستبووی، نە گۆنبەزێكیان كردەوە نەهیچ، تەنیا بەسەر كێلەكەیەوە ئەمەیان نوسی كە خـۆی گوتبووی:((هذا قبر الفقير إلى رحمة الله تعالى،يوسف بن محمد بن أبـي بكـر بـن أيـوب))،وفيـات الاعيان، ج٥، ص٨٤؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٥١.

(٣) وفيات الاعيان، ج٥، ص٨٣.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٨٣.

برای و خانەوادەکەی بە ناوی ئەو حوکمیان دەکردو وتاریان دەداو پارەی بەناوی خۆیەوە دەرکردوەو لای خەڵکیش خۆشەویست بووە[١] . مەلیك (کامل) ناوبانگ و دەسەڵاتی ئەوەندە زۆر بووە تەنانەت لە وتاری مەکەش ناوی هاتووە، هەروەکو(ابن خلكان) دەڵێت: کەسێك بۆی گێڕامەوە کە ئامادەی وتاری هەینی بوو، لە مەکە، دەڵێت: وتاربێژەکە لە کاتی پاڕانەوە، بەم شێوەیە نزای بۆ مەلیك (کامل)کرد، وتی:(( صاحب مكة وعبيدها، واليمن وزبيدها، ومصر وصعيدها، والجزيرة ووليدها، سلطان القبلتين، ورب العلامتين، خادم الحرمين الشريفين، أبو المعالي محمد الملك الكامل ناصر الدين خليل أمير المؤمنين))[٢] .

لەدوای خۆشی(المكي) ئەم بابەتەی لە (ابن خلكان) ەوە وەرگرتووەو ئاماژەی پێکردووە[٣] . پاشان نەخۆش دەکەوێت و سەرەنجام لە ڕۆژی چوارشەممەی دوای عەسر، کۆچی دوایی کرد، لە ڕۆژی پێنج شەممەی مانگی رەجەب ساڵی (٦٣٥ك/١٢٣٧ن) لە قەڵای (دیمەشق) نێژرا، (ابن خلكان) دەڵێت: ئەو کاتەی من لە (دیمەشق) بووم[٤]، ئەوەی جێ ئاماژەیە مەلیك (کامل) بە یەکێك لە فەرمانڕەوا بەهێزەکانی ئەیوبی دادەنرێت، تەنانەت هەر لە دەقی پاڕانەوەکەی وتاربێژی مەکە بۆ (مەلیك کامل) گەواهی بەهێزی و فراوانی سنوری دەسەڵاتی مەلیك (کامل) بە دەردەخات.

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٨٩.

(٢) وفيات الاعيان، ج٥، ص٨٢.

(٣) افادة الانام بذكر بلد الله الحرام، تحقيق: عبدالملك بن عبدالله بن دهيش، ج٣، ص١٢٥.

(٤) وفيات الاعيان، ج٥، ص٨٣؛اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج١، ص٣٣٣؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٦١؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٧٣؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٧، ص٢٨.بۆ زانیاری زیاتر لەسەر مەلیك(کامل) بروانە(ذکری عزیز محمد، عصر الملك الكامل الايوبي).

**١٩)مەلیكالأشرف موسی الأیوبي :**

(أبو الفتح موسى ابن الملك العادل سيف الدين أبي بكر بن أيوب)، نازناوی مـەلیك ( الأشـرف مظفـر الـدين)بـووە[١]. (ابـن خلكـان) دەڵێـت: هەنـدێك دەڵـێن لـە سـاڵی (٥٧٨ك/١١٨٢ز) لە ( قاهیرە) لە دایكبووە، هەندێكی تریش پێیـان وایـە لـە (الكرك) لـە دایكبووە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بـە هـیچ سەرچـاوەیەك بكـات لـەم بـارەوە[٢]، هـەروەها هەندێك مێژوو نووسی دوای (ابن خلكان) لە بارەی شوێنی لـە دایكبـوونی ئـەو پاشـایە، هەمان قسەی نووسەریان دووبارە كردۆتەوە، بەوەی یان لە (قاهیر)ە یان لە (الكرك) لـە دایكبووە[٣] .

مـەلیك (الاشـرف) هـەر لـە سـاڵی (٥٩٨ك/١٢٠١ز) بەرپرسـیارەتی پـێ سـپێردراوە، ئەویش لەوكاتە باوكی ناوچەی (الرها)ی پێـداو (حـران)یشـی بـۆ خسـتە سـەر، پاشـان لەگـەڵ مـیر (نـور الـدين أرسـلان شـاە، م:٦٠٧ك/١٢١٠ز)ی خـاوەنی موسـل، لـە سـاڵی (٦٠٠ك/١٢٠٣ز) لە نێوان هەردووڕووبار بەیەك گەیشتن و شەڕ ڕوویدا، لە ئەنجامدا مەلیك (الاشرف) سەركەوت[٤] . كاتێك مەلیك (الأوحد)ی برای لـە سـاڵی (٦٠٩ك/١٢١٢ز) كۆچـی

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٠؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشـر، ج٣، ص١١٠ ؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٩، ص١٥٩؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج٦، ص٨؛ ابن دقماق، نزهـة الانام في تاريخ الاسلام، تحقيـق: سـميرة طبـارة، المكتبـة العصـرية، بـيروت، ص٩١؛ ابـن تغـری بـردي، النجـوم الزاهـرة، ج٦، ص٣٠٠؛ ابـن العمـادالحنبلي، شـذرات الـذهب، ج٧، ص٣٠٦؛ابـن الغزي، ديوان الاسلام، ج١، ص٤٥.

([٢]) وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٣.

([٣]) ابن تغرى بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٣٠٠؛ محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان، ج١، ص٢٧.بەلام (ابن دقماق) دەلێت لە سالی(٥٧٦ك/١١٨٠ز) یـان لـە (قـاهیرە) وەیـان لـە(الكـرك) لەدایك بووە. نزهة الانام في تاريخ الاسلام، ص٩١.

([٤]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٠.

دوای کرد، (خلاط)و (میافارقین)و بە شێکی گەورەی لە مەڵبەندی جزیرەشی هاتە ژێر فەرمانی و ئەوجارە (الرقة)ی کردە ناوەندی فەرمانرەوای خۆی[1].

دوای مردنی مەلیك (الظاهر غازي) کوڕە مامی کە سەرداری (حلب) بووە، ( عز الدین کیکاوس)[2] ی پاشای ڕۆم، بە هاوکاری مەلیك (الافضل بن صلاح الدین)ی ئامۆزای هەوڵی گرتنی (حلب)ی داوە، بەلام مەلیك (الاشرف موسی) پارێزگاری لێ دەکات و دەیخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە، لێرەدا (ابن خلکان) ئاماژەی بە هۆکاری ئەو پاڵپشتیەی ئامۆزای بۆ (عز الدین کیکاوس) لە دژی مەلیك (الاشرف موسی) ئامۆزای نەکردووە، دیارە ململانێی نێو خانەوادەی ئەیوبیەکان لە دوای (صلاح الدین الایوبی) ئەوەندە بەهێز بووە، گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی هەریەکەیان لە پێناو زیادکردنی نفوزی خۆیان، هانا بۆ هێزی بێگانە ببەن لە دژی یەکتر بەکاری بهێنن. مەلیك (الاشرف) بەهاوقۆڵی مەلیك (الکامل) دیمەشقیان لە مەلیك (الناصر صلاح الدین داود)کوڕی مەلیك (المعظم) سەندەوەو (کرك)و (نابلس)و چەندین شوێنی تریان پێدا. ئینجا مەلیك (الاشرف) خۆی دەسەلاتی (دیمەشق)ی گرتە دەست و گواستییەوە ئەو شارەو، ( حران) و (الرها) و (سروج)و (الرقه) و (رأس عین)ی دایە دەستی مەلیك (الکامل)[3]. دواتر

---

(1) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٥، ص ص٣٣٠_٣٣١؛الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٣، ص٢١٢؛ابن کثیر، البدایة والنهایة، ج١٣، ص٧٧.

(2) عز الدین کیکاوس:کوری غیاث الدین کیسخرو بن قلیج أرسلان بن مسعود بن قلیج أرسلان السلجوقي،،سولتانی سەلجوقی بووەلە ولاتی رۆم، کە پێیان وتراوە سەلاجقەی رۆم، لە سالی (٦٣٤ك/١٢٣٦ز) کۆچی دوای کردووەو تەرمەکەیان لە (قونیە) ناشتووە. ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٥، ص٣٣١؛مجهول، أخبار سلاجقة الروم، تحقیق: محمد سعید، ط٢، المرکز القومي للترجمة، (قاهرة: ٢٠٠٧)،ص٢٤٧.

(3) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٥، ص٣٣١.هەروەها بڕوانە.أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٥٤؛الذهبي، العبر، ج٣، ص١٦٤؛ الیافعي، مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ج٤، ص٢٤؛الداوودي، طبقات المفسرین، دار الکتب العلمیة، بیروت، ج١، ص٣٢٣.

(جلال الدين خوارزم شاه، م:٦٢٨ك/١٢٣٠ز) له سالّى (٦٢٦ك/١٢٢٨ز) دەستى بەسەر (خلاط) داگرت، نوێنەرى مەليك (الاشرف) بەرپرسى ئەو شارە بوو، مەليك (الاشرف) ئەوكات لە (ديمەشق) بوو، نەيتوانى هاوكارى نوێنەرەكەى بكات، بەرامبەر بەمە مەليك (الاشرف) هاوپەيمانى بەست لەگەلّ (علاء الدين كيقباذ السلجوقي م:٦٣٤ك/١٢٣٦ز) سولّتانى رۆم، كە دەبێتە براى (عز الدين كيكاوس) بۆ بەرەنگاربوونەوەى مەترسيەكانى خوارزمييەكان، بەم شێوەيە هەردوو سوپاى مەليك (الاشرف) و رۆم لە سالّى (٦٢٧ك/١٢٢٩ز) لە نێوان (خلاط) و (ارزنكان) رووبەرووى (خوارزم شاه) بوونەوە، توانيان شكستى پێبێنن و (خلاط) يش گەرايەوە بۆ ژێر دەسەلاّتى مەليك (الاشرف)[1]

مەليك (الاشرف) بەردەوام بوو، لە فراوان كردنى سنورى دەسەلاّتى لە سالّى (٦٢٩ك/١٢٣١ز) چووە ناو (امد)و خستيە ژێر فەرمانرەواييەكەى[2] .(ابن خلكان) لە بارەى ئاكارەكانى ئەم سولّتانەوە دەلّێت : كەسێكى نەرم ونيان و سينگ فراوان و بەرەوشت بوو، تەنانەت ئەوەندە بەخشندە بووە، سەرەراى فراوانى سنورى دەسەلاّتەكەى هيچ پارە لە خەزينەكەى نەما بوو، هەر بەو بۆنەوە رۆژێك مەليك (الاشرف ) چاو لە قەلّەمدانەكەى شاعير (الكمال أبى الحسن )[3] دەكاو دەبينىّ تەنيا

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٢؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج١، ص٣٤١؛ابن سباط، تاريخ ابن سباط، تحقيق: عمر عبدالسلام تدمرى، جروس بروس، لبنان، ١٩٩٣، ج١، ص٢٩٩.بۆ زانيارى لەبارەى (جلال الدين خوارزمى) بروانە(النسوي، سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، تحقيق:حافظ احمد، (القاهرة:١٩٥٣).هەروەها بۆ زياتر زانيارى لەسەر (علاء الدين كيقباذ) بروانە(الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص١٥٣.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٢.

([3]) الكمال أبي الحسن:علي بن محمد، ناسراوە بە(ابن النبيه المصري)،شاعيرو سەرۆك ديوانى مەليك الاشرف بوو، خاوەن ديوانى شعرى بەناوبانگ بووە، لە سالى (٦١٩ك/١٢٢٢ز) لە نصيبين كۆچى دواى كردووە، ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٣٣٤، ٣٣٦؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ج٧، ص١٥١.

یەك قەڵەمێکی تێدایە، زۆری پێ سەیر دەبێ و لێی دەپرسێ چۆن دەکرێ نوسەرێکی وەك تۆ تاکە قەڵەمێکی هەبێ؟ (ابن النبیە )دەسبەجێ ئەم دوو بەیتەی بۆ دەڵێ:

قال الملك الأشرف قولاً رشدا ... أقلامك يا كمال قلت عددا

جاوبت لعظم كتب ما تطلقه ... تحفى فتقط فهي تفنى أبدا.[1]

واتا: مەلیك (ئەشرەف) گوتەیەکی وردی گوت. گوتی: ئەرێ (کەمال) بۆ قەڵەمت وا کەمە؟ گوتم: بەو بۆنەوە بەخشین و خێرو خەڵاتی تۆ هێندە زۆرە .قەڵەم کوا بەش دەکا ؟! دیارە ئەم زانیاریە بە تەنها (ابن خلکان) ئاماژەی پێکردووە، چونکە بەدوا داچوونی زۆرمان کرد لە سەرچاوەکانی پێش خۆی، ئەم بەسەر هاتەیان تۆمارنەکردووە، هەروەها هەرخودی (ابن خلکان)یش دەڵێت: چاوم بە زاوای (ابن النبیە) شاعیر لە (قاهیرە) کەوتووە و ساڵی مردنی (ابن النبیە)م لێ وەرگرتووە[2]، دەکرێ ئەو زانیاریەشی لەو زاویەی وەرگرتبێت.

(ابن خلکان) دەڵێ:((ساڵی (٦٣٣ك/١٢٣٥ز) لە (دیمەشق) بووم، مانگی ڕەمەزان و کاتی ڕۆژوو بوو، ئەو کاتە مەلیك (الکامل)یش لە لای مەلیك (الاشرف)بوو، من هەموو ڕۆژێ ئەو دوو میرەم دەبینی کە لە مەیدانی (الاخضر الکبیر)دا بە ڕۆژوو چەند سەعات گۆبازییان دەکردو کەیفم دەهات بەو هەموو دۆستایەتی و ڕێز و خۆشەویستییە لە نێوانیاندا.))[3]، ئەم پەیوەندییە تاسەر نەبوو، نێوانیان تێك چوو، مەلیك (الاشرف) و

---

([1]) وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٣٣٣_٣٣٤؛ابن تغرى بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٣٠١. ابن خلکان دەڵێت سەرەڕای ئەمەش، زۆربەی شاعیرە ناودارەکانی ئەوکاتوەکو(شرف الديم محمد بن عنين) و(البهاء أسعد السنجاري) و(الشرف راجح الحلي ابن الأردخل الموصلي)..هتد لەدیوانەکانیان ستایشی مەلیك الاشرف یان کردووە.وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٦.

([2]) وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٦.

([3]) وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٣.

زۆربەی مەلیکەکانی تر لە ژێر فەرمانی مەلیك (الكامل) دەردەچن[١]، لە کۆتاییدا مەلیك (الاشرف) تووشی نەخۆشیەکی توند دەبێت. بەو هۆیەوە لە ڕۆژی پێنج شەممەی (٤)ی (محرم)ی ساڵی (٦٣٥ك/١٢٣٧ن)لە (دیمەش) دەمرێت و هەر لەوێش تەرمەکەی نێژراوە[٢].

## تەوەرەی دووەم: وەزارەت :

وەزارەت پۆستێکی کارگێری باڵایە، بۆ یەکەمجار لە دەوڵەتی ئیسلامی، لە سەر بنەمایەکی یاسایی و بە شێوەیەکی ڕەسمی، لە سەردەمی عەباسیدا هاتەکایەوە و جێگیر بوو. نازناوی وەزیر بەکارهێنرا، کە پێشتر لە شوێنی وەزیر ناوی (کاتب )بەکاردەهات[٣] . وەزارەت دوو جۆرە: وزارەتی جێبەجێ کردن، وەزارەتی پێسپاردن، وەزارەتی جێبەجێ کردن لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خەلیفەدا بەرتەسك دەبۆەو وەزیر هیچ هەڵسوکەوتێکی شەخسی سەربەخۆی تێدا ئەنجام نەدەدا، بەڵکو لەم بارەدا ئەڵقەی پەیوەندی نێوان خەلیفەو خەلك بوو، هەرچی وەزارەتی پێسپاردنە لەسەر هەڵسووکەوتی ڕەهای وەزیر لە کاروباری دەولەتدا ڕاوەستا ببو[٤] .

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٣.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٣٣٣؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢٩٩؛ ابن الغزي. ديوان الاسلام، ج١، ص٤٥.

(٣) ابن الطقطقي. الفخري في الآداب السلطانية والدول الاسلامية، تحقيق: عبد القادر محمد مايو، دار القلم العربي، (بيروت: ١٩٩٧)،ص١٥٠؛ القلقشندي، صبح الأعشى في صناعة الانشا، ج٣، ص٥٥٣؛ توفيق بن عبدالعزيز، الاسلام والدستور، وكالة المطبوعات والبحث العلمي(الرياض: ١٤٢٥)،ص١٥٥.

(٤) الماوردي، الأحكام السلطانية، ص ص٥٠، ٥٦؛ ابو يعلى ابن الفراء، الأحكام السلطانية، ص٢٩، ٣١ ؛بدر الدين، تحريم الأحكام في تدبير أهل الاسلام، تحقيق: فؤاد عبدالمنعم، ط٢، (دار

پایەی وەزارەت لە سەردەمی خەلیفەکانی فاتمی، لەسەرتاوە تاکۆتا وەزیر، کە (صلاح الدین الایوبی)بوو، لە کۆشکی وەزارەت کارەکانیی خۆیان ڕادەپەراند، هەندێك جار پۆستی وەزارەت لە دەوڵەتی (فاتمی) لەلایەن کەسانی سەربازی و شمشێر بازەکان بەڕێوەدەبردرا، بۆ ماوەیەکیش لەلایەن پێنووس بەدەستان و زانایان بەڕێوەدەبردرا، لە هەردوو کاتیشدا پایەی وەزارەت بەرز بوو، لە هەندێك کاتدا وەزیری پێسپاردن، بە سوڵتان یاخود نزیك لەو دادەنرا، هەندێك جاری تریش دەسەلاّتی ئەوەندە لاواز دەبوو، وەك ناوەندگیری یەك سەیر دەکرا[١].

لەسەردەمی (فاتمی) نازناوی پاشا(الملك) دەدرا بە وەزیرەکان، بۆ نموونە شاور نازناوی (الملك المنصور)ی بەخشی بە وەزیر (صلاح الدین الایوبی) تەنانەت تەنها وەزیر بۆی هەبوو، لەلای خەلیفە دانیشێت و لەکاتی مەجلیسی خەلیفە وەزیر لەلای ڕاستی خەلیفە دادەنیشت[٢]

بەم شێوەیە دەردەکەوێت وەزارەت لە سەردەمی ئەیوبیشدا گرنگی خۆی پاراست و دەسەلاّتی وەزیر تارادەیەك لە ئاستێکی باشدا بوو. دیارە هیچ کەسایەتیەکی کوردی لە سەردەمی فەرمانڕەوایانی ئەیوبی پۆستی وەزیریان وەرنەگرتووە، هەربۆیە (ابن خلکان) ئاماژەی پێنەکردووە، تەنها ئاماژەی بەو وەزیرە کوردانەی سەردەمی دەوڵەتی (فاتمی) لە میسر کردووە، ئەم پۆستەیان بەڕێوەبردووە، کەئەمانەن:

---

الثقافة، الدوحة: ١٩٩٨)،ص٤٧٧ محمد سهیل طقوش، مێژووی دەولەتی عەباسی، وە: نهاد جلال، نارین، (هەولێر: ٢٠٠٨)،ل٦٢.

(١) القلقشندي، صبح الأعشى في صناعة الانشا، ج٣، ص٥٥٣.

(٢) جمال الدین الثیال، دراسات في التاریخ الاسلامي،، مكتبة الثقافة الدینیة، (بورسعید: ٢٠٠٠م)،ص ص٥٠_٥١.

١) العادل ابن السلار:

ناوی (أبو الحسن علی بن السلار) كه به (ابن السلار)ناسراوه[١]، (ابن خلكان) دەڵێت: له شوێنی تر بینیومه به ناوی (أبو منصور علی بن إسحاق) ناوی هاتووه [٢]، تەنها (ابن خلكان) ئاماژەی بەوە كردووەو دەڵێت: ((له هەندێك مێژووی میسرم بینی، كەوا (ابن السلار) كوردی (زرزاری) بووه)) [٣]، جگە لەوەی (ابن الطویر، م:٦١٧ك/١٢٢٠ن)پێش (ابن خلكان)ژیاوه، كه له ساڵی (٦١٧ك/١٢٢٠ن)مردووه، له كتێبەكەی كاتێك باسی (ابن سلار)ی كردووه دەڵێت: باوكی كوردی (زرزاری)یه، لەوانەشه (ابن خلكان) لەوی وەرگرتبێت[٤] . لەدوای خۆشی هەریەكه له(الذهبي)و (العمري) پشت ڕاستی ئەمەدەكەنەوەو دەڵێن: له (ابن خلكان)مان وەرگرتوه[٥]، ساڵی له دایكبوونی (٤٧٢ك/١٠٧٩ن))بووه[٦].

پەروەردەی كۆشكی (قاهیره) بووه، سەرەتادا والی ناوچەی (صعید) بووه پاشان بۆته والی شاری (ئەسكەندەری)یه [٧]، دوای ئەوەی (نجم الدين أبا الفتح سليم بن محمد

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٣٧٧.

([٢]) وفيات الاعيان،،ج٣، ص٤١٦. هەروەها لەسەرچاوەی تریش هەمان شت ئاماژه پێكراوه بڕوانه.ابن منظور، مختصر تاريخ دمشق لابن عساكر، تحقيق: روحية النحاس واخرون، دار الفكر، (دمشق: ١٩٨٤م)،ج٣، ص٢٢٩؛المقريزي، اتعاظ الحنفاء بأخبار الأئمة الفاطميين الخلفاء، تحقيق: محمد حلمي محمد أحمد، المجلس الأعلى للشئون الإسلامية، ج٣، ص٢٠٢.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦؛مەهدی عوسمان هەروتی، ڕۆڵی سەربازی كورد، ئەكادیمیای كوردی، (هەولێر: ٢٠٠٨ن)،ل٢٤٧.

([٤]) نزهة الملقتين في اخبار الدولتين، تحقيق: ايمن فؤاد سيد، دار صادر (بيروت: ١٩٩٢)،ص٥٧.

([٥]) تاريخ الاسلام، ج١١، ص٩٣٦؛ المسالك الابصار، ج١١، ص٢٦٧.

([٦]) ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٣٧٧.

([٧]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦؛تاريخ الاسلام، ج١١، ص٩٣٦؛ علي محمد محمد الصلابي، صلاح الدين الأيوبي، ص٣١٠.

مصال)کرا بە وەزیر لەلایەن (ظافر) لە ساڵی(٥٤٣ك/١١٤٨ن)، (ابن مصال) یەکێك بوو، لە گەورەترین میرەکانی دەوڵەت، بۆ ماوەی (٥٠) ڕۆژ وەکو وەزیر دەست بەکاربوو[١].

پاشان ( ابن سلار) لە (ئەسکەندەریە) لە دژی هەڵگەڕایەوەو داوای ئەم پۆستەی کرد، توانی بەسەر (ابن مصال ) سەرکەوێت، لە ساڵی (٥٤٤ك/١١٤٩ز )چووە ناو( قاهیرە) و کاروباری دەوڵەتی وەرگرت، بەڵام دووبارە ڕووبەڕووی لایەنگرانی (ابن مصال) بۆیەوە. لەم شەڕەشدا سوپاکەی سەرکەوت و کەللەسەری (ابن مصال)یان هێنا بۆ (قاهیرە) بەم شێوە وەکو وەزیر لەدەسەلاتدا بەردەوام بوو، تاوەکو کوژرانی[٢] .نازناوی (الملك العادل)ی لەلایەن (الظافر) پێدرا [٣]، تەنانەت بە وەزیرو سوڵتانی میسر ناویان بردووە[٤]، لەسەر مەزهەبی سوننەی شافیعی بوو[٥].

قوتابخانەیەکی گەورەی بۆ شەرعناسە شافعییەکان لە ئەسکەندەریە دروست کرد[٦]، (ابن خلکان) لەم بارەیەوە دەڵێت :((هیچ قوتابخانەیەکی شافعیم جگە لەمە لەئەسکەندەریە نەبینیوە))[٧].

لە بارەی چۆنیەتی کوژرانی وەزیر (العادل)، نووسەر بەم شێوەیە یاداشتی کردووە، بەوەی کاتێك (أبو الفضل عباس بن أبي الفتوح ابن يحيى بن تميم بن المعز بن باديس الصنهاجي) منداڵێك بووە، لەگەڵ (بلارة)ی دایکی لە (ئەفریقا) هاتوون بۆ

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٤١٦_٤١٧؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٥، ص٢١٠.

([٢]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦؛الذهبي، العبر، ج٣، ص٦.

([٣]) ابن منقذ، الاعتبار، حرره: فيليب حتي، مكتبة الثقافة الدينية، مصر، ص٨.

([٤]) السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٢٧٨.

([٥]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦؛الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج١٥، ص٢٧٩؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٦، ص٣٧.

([٦]) أبي شامة، عيون الروضتين، ج١، ص٢٩٢؛الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج١٥، ص٢٧٩.

([٧])وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٧؛ تاريخ الاسلام، ج١١؛ ص٩٣٦.

(قاهیره) ئەویش هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو بێوەژنە کرد، ماوەیەکی زۆر لای مایەوە. (عباس)یش خوای گەورە کوڕێکی پێبەخشین ناوی نا(نصر)، کە لەناو ماڵی (العادل )لای داپیرەی دەژیا، (العادل)زۆر سۆزو ڕێزی پێدەدا، پاشان (عادل) سوپایەکی بەسەرکردایەتی (عباس) بەڕێکرد، بۆ بەرەی شام بۆ جیهادکردن، لەڕێگادا پلانی بۆ کوشتنی (العادل)داڕێشت، بۆیە بڕیاریدا ئەم پلانە لەلایەن (نصر)ی کوڕی جێبەجێ بکری[1]،

چونکە ئەو لەنێو کۆشکی (عادل) دەژیا، کوشتنی بۆی ئاسانە، (نصر)یش کە زڕ کوڕەزای (عادل) بوو، پلانەکەی ئەنجام دا. توانی لە سەر جێگای نوستنی لە ساڵی (٥٤٨ك/١١٥٣ن) وەزیر(عادل)بکوژێت[2].

٢) اسد الدين شيركوه :

دوای ئەوەی (اسد الدين) توانی لە شاڵاوی سێیەمی بۆ سەر میسر سەرکەوتوو بێت، هەر لە میسر مایەوەو لە ڕۆژی چوارشەممەی (٢٧)ی مانگی (ربيع الآخر) لە ساڵی ( ٥٦٤ك/١١٦٨ن) لەلایەن (عاضد) بانگێشت کراو پۆستی وەزیری پێسپێردرا. تەنها دوومانگ و پێنج ڕۆژ، لە وەزارەکەتەکەی دابوو، ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی ٢٢ی جەمادی

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦؛ تاريخ الاسلام، ج١١، ص٩٣٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢١، ص٩٤.تەنانەت (ابن الطوير) زۆر بەجوانی ئاماژە بۆ رۆلی (اسامة بن منقذ) دەکات لە پلاندارێژی بۆ کوشتنی (ابن سلار).(نزهة المقلتين في اخبار الدولتين) ص ص٦١_٦٤.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٩، ص٩١؛مەهدی عوسمان، ڕۆلی سەربازی کورد، ل٢٥١.

دووەمی ساڵی(٥٦٤ك/١١٦٨ن)ی بۆ یەکجاری چاوی لێکناو مرد، لە شاری( قاهیرە) بە خاك سپێرا[1].

## ٣) سوڵتان صلاح الدين:

(صلاح الدين) لەگەڵ مامی دوای شاڵاوی سێیەم لە میسر مانەوە، دوای ئەوەی (اسد الدين)ی مامی پۆستی وەزارەتی (میسر)ی لەلایەن (عاضد) وەردەگریت، بۆ ماوەی دوومانگ و پێنج ڕۆژ لەم پۆستەدا دەمێنێتەوەو پاشان دەمرێت [2]، لەوکاتەدا گشت میرو سەرکردەکانی (نوری) لە (میسر) هەوڵیان دەدا، بۆ ئەم پۆستە. خۆیان بەشیاوتر دەزانی، بەڵام لەنێو ئەم سەرکردانەدا (عاضد) بانگێشتی (صلاح الدين)ی کرد، پۆستی وەزارەتی بەو سپارد، لەو کاتەدا وەکو جێگرو نوێنەری سوڵتان (نورالدين زەنکی) حوکمی دەکرد، سوڵتانیش بەناوی میر (الاسفهسلار) ناوی دەهێنا، لە کاتی نامە گۆڕینەوەکاندا وەك ڕێزێك بۆ (صلاح الدين) [3].

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ٢، ص ص٤٧٩_٤٨٠، ١٥١؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣١٩؛ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٣٦؛ ابن تغري بردي، مورد اللطافة في من ولي السلطنة والخلافة، ج١، ص٢٩٨.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٥٠_١٥١؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١١، ص٤٥٣؛ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٣٦؛ابن تغري بردي، مورد اللطافة في من ولي السلطنة والخلافة، ج١، ص٢٩٨؛السير هاملتون، صلاح الدين الايوبي، تحررها: يوسف ابيش، ط٢، بيسان(بيروت: ١٩٩٦م)،ص١١٩.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٥٣_١٥٥؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٢١٦؛محمد فريد ابو حديد، صلاح الدين الايوبي وعصره، دار الكتب المصرية، (قاهرة: ١٩٢٧م)،ص٦٥؛عبدالمنعم الهاشمي، موسوعة تاريخ العرب العصر الايوبي، ص١٣؛السير هاملتون، صلاح الدين الايوبي، ص١١٩.

ڕەنگــە ئەمــەش بــۆ ئــەوە بگەڕێتــەوە، کــە (نورالــدين) دانــی بــە ســەربەخۆیی وەزارەتەکەیــدا نــەناوە، بــەڵکو وەك کاربەدەســتێکی خــۆی بەســەر( میســر)ەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە، بەلأم وەك ڕێزێك بۆ (صلاح الـدين) نـاوی لـە پـێش گشـت میرەکـانی تـر، لـە نامـەکانی دەنووسـی. دەتـوانین بلـێین زیـاتر وەك جێگـر یـاخود سەرکردەیەکی سەربازی خۆی لە(میسر) سەیری( صلاح الدين)ی دەکرد، ئـەوەی جێـی ئامارەیە (صلاح الدين الايوبی) توانی هاوسەنگیەك لـە نێـوان هـەردوو هێـزی (نورالـدين زنكی)و (فاتمی)ەکان کە دژی یەك بوون ڕابگرێت. بەڕادەیەك لەیەك کاتـدا وەك وەزیـری (فاتمی)ەکان و سەرکردەی سەربازی (زەنکی)ەکان حـوکمی دەکـرد، دەرەنجـامی ئـەو هونەرە سیاسیەی کە پـەیڕەوی دەکـرد، بـووە هـۆی دەرکـەوتنی وەك سـەرکردەیەکی بەهێزو ناودار لە ناوچەکە.

(صلاح الدين) توانی لە ڕێگەی ئەم پۆستەوە، دەسەلأت و پێگەی خۆی لە (میسـر) قایم بکـات و سـەرکەوتوو بـوو، لـە پاراسـتنی خـاکی (میسـر) لـە گشـت مەترسـیەکانی دەرەوەو ناوەوە، تا ئەوکاتەی توانی کۆتایی بە دەسـەلأتی (فـاتمی)یـەکان بهێێنێـت و جیهانی ئیسلامی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی گەورەتر ئامـادە بکـات. شـیاوی باسـە وەك چۆن نووسەر خۆیشی ئامارەی پێکردووە، هەموو ئەم زانیارییانەی لـە (ابـن الاثـیر)ەوە وەرگرتووە، بەبێ ئەوەی زیادەیەکی ئەوتۆی خستبێتە سەری[1].

(1) التاريخ الباهر في الدولة الاتابكية، ص ص١٤١_١٤٣.

**تەوەرەی سێیەم :دادوەری :**

دادوەری بە یەکێك لە پۆستە بەرزەکانی ئایینی دادەنرێت، ئەم پۆستەش بە کەسانێك دەدرێت کە مەرجەکانی وەکو عەقل و شارەزایی لە شەرع و بنچینەی ئاینی و دادپەروەری و بیستن وبینین و هەستەکانی تێدا بێت[1]. کارەکەی بریتییە لە براندنەوەو کۆتای پێهێنان و یەك لایکردنەوەی کێشەو ناکۆکییەکانی خەڵك و نەهێشتنی ستەم و زۆرداری لە کۆمەڵگە[2] .

لەنێو دادوەری دا پۆستی قازی قوزات (قاضي القضاة)هەیە، کە بە بەرزترین پۆستی ئاینی دادوەری دادەنرێت. چ لە ڕووی ڕێزەوەو چ لە ڕووی پلەوە، تەنانەت مافی ئەوەی هەیە بۆ خۆی جێگرێك دانێت، بۆ ڕاپەراندنی کارەکانی دادوەری[3] . قازییەکانیش بۆ بریاردان لە کێشەکان دەگەڕێنەوە بۆ بنچینەو سەرچاوەکانی ئاینی ئیسلام، کە بریتین لە قورئان و فەرموودە و (الاجماع) لەگەڵ (القیاس )و (الاجتهاد)[4]،

---

(1) الماوردي، الاحكام السلطانية، ص ص١١١_١١٢؛ظافر القاسمي، نظام الحكم في الشريعة والتاريخ الاسلامي، ط٢، دار النفائس (بيروت:١٩٨٣)، ص١١١٥؛سلام حسن خوشناو، جزيرة ابن عمر في القرنين السادس والسابع الهجريين، مديرية مطبعة الثقافة، (اربيل:٢٠٠٦)، ص١٠٢.

(2) الأنباري،الزاهر في معاني كلمات الناس، تحقيق: حاتم صالح الضامن، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٩٢)،ج١، ص٤٤٨٦؛الهروي، تهذيب اللغة، تحقيق: محمد عوض، دار إحياء التراث العربي، (بيروت: ٢٠٠١)،ج٩، ص١٧٠؛ابن المنظور، لسان العرب، ط٣، دار صادر، (بيروت: ١٤١٤)،ج١٥، ص١٨٦؛ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، ج١، ص٢٧٥؛الزبيدي، تاج العروس من جواهر القاموس، مجموعة من المحققين، دار الهداية، ج٣٩، ص٣١٥؛ فاروق عمر واخرون، النظم الاسلامية، دار الحكمة، (بغداد: ١٩٨٧)،ص١٩٩؛سعدي أبو جيب، القاموس الفقهي لغة واصطلاحا، ط٢، دارالفكر، (دمشق: ١٩٨٨)،ص٣٠٥.

(3) قادرمحمد حسن، اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية، ص١٤٥.

(4) الماوردي، الاحكام السلطانية، ص١١٢؛ ابن قدامة، المغني، تحقيق: عبدالله بن عبد المحسن التركي وعبدالفتاح العلو، ط٣، عالم الكتب (الرياض: ١٩٩٧)،ج١٤، ص٧٣.

بەو مەرجەی نابێت ئیجتهادەکە پێچەوانەی دەق بێت[1]. (ابن خلكان) ئاماژەی بە چەند دادوەرێکی کورد کردووە لەوانە:

١) أبو القاسم ابن كج القاضي :

(أبو القاسم يوسف بن أحمد بن يوسف بن كج (الكجي)[2] الدينوري[3]، (ابن خلكان) باسی ساڵی لە دایکبوونی نەکردووە[4]. زانایەکی ڕێبازی شافعی بووە، خاوەنی زانستی باڵا و ئاکاری بەرز بووەو بە بۆنەی ئەوەوە (دینەوەر) وەکو ناوەندێکی زانست و زانیاری لێ هاتووە و مامۆستایان و قوتابیان لە دوور و نێزیکەوە بۆ فێربون و فێرکردن، ڕوویان تێ کردووەو کەسانی

وەك (أبی القاسم عبد العزيز الداركي م:٣٧٥ك/٩٨٥ن)[5] لە مەجلیسەکەی بەشداربوونە[1]، قازی (دینەوەر)[2] بووە، کەسێکی چاکەکارو چاکخواز بووە[3]، تاوەکو

---

([1]) الكاساني، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، دار الكتب العلمية، ط٢، (بيروت: ١٩٨٦)،ج٣، ص٢٤٥.

([2]) الكجي: دەگەڕێتەوە بۆ ناوی باپیرەیان. ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛ ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، ج٥، ص٣٥.

([3]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج١٣، ص٨؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٠؛ الحسيني، طبقات الشافعية، تحقيق: عادل نوهيض، دار الافاق الجديد، (بيروت: ١٩٧١)،ص١٢٦؛چرا محمود حسن، بزاڤ زانستی دینەوەر، ماستەرنامەی بلاونەکراوە، پێشکەش بە کۆلیژی زانستە کۆمەڵایەتییەکان، زانکۆی سلیمانی، (سلیمانی: ٢٠٠٧)،ل٥٣.

([4]) لەسەرچاوەکانی تریش ئاماژەی پێنەکراوە.

([5]) بۆ زانیاری لەسەری بڕوانە سەرگوزشتەی خۆی (أبو القاسم الداركي).ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٨٨.

لە شەوی (٢٧)مانگی ڕەمەزانی ساڵی(٤٠٥ك/١٠١٤ز) لەلایەن عەیارییەکانەوە هەر لە (دەینەوەر) دەکوژرێت[٤] .

## ٢) ضیاء الدین شارح المهذب:

(أبو عمرو عثمان بن عیسی بن درباس بن فیر بن جهم بن عبدویس الهذباني (الماراني) [٥] [٦]، الشافعي[١]، الكردي) [٢]، نازناوی (ضیاء الدین)بووە[٣]. (ابن خلكان)

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٠؛ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٥، ص٢٥.الذهبي دەڵێت: (ابو القاسم ابن كج) قوتابي (ابي حسين بن القطان) ی بووە. سير أعلام النبلاء، ج١٣، ص٨.

([٢]) دینەوەر: شارێکە سەر بەهەرێمی چیایە، نزیکە لە قرمسین وهمدان، سێ یەکی همدان دەبێت، ماوەی نێوان دینەوەرو شهرەزوور (٤) قۆناغە(١٤٤کم)، خەلکێکی زۆر لە زانایان وئەدیبان وفەرموودەناسان دەگەڕێنەوە بۆ ئەسلی ئەم شارە.زين الدين الهمداني، الأماكن أو ما اتفق لفظه وافترق مسماه من الأمكنة، تحقيق: حمد بن محمد الجاسر، دار اليمامة(الرياض: ١٤١٥)،ص٤٣٥؛ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج٢، ص٥٤٥.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٠؛محمد جميل الروذبياني، مدن كردية قديمة، تاريخها، جغرافيتها رجالها وعلماوها واودباؤها، هەوال، (السليمانية: ١٩٩٩)،ص٢٢٨.

([٤]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٠؛ الحسيني، طبقات الشافعية، ص١٢٦.(الذهبي)، دەڵێت لەلایەن دزێك لە شەوی ڕەمەزانی ساڵی(٤٠٥ك/١٠١٤ز) كوژرا.سير أعلام النبلاء، ج١٣، ص٨.

([٥])الماراني: دەگەڕێتەوە بۆ نەوەی (ماران) كە هۆزێكی كوردە، دەكەوێتە ناوچەی(مروج) تەنیشت شاری موسل.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، ص٢٥٢.

([٦]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢١؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢١٢.

ئامازەی بە ساڵی لە دایکبوونی نەکردووە[٤]، (ضياء الدين) برای قازی (صدر الدين أبی القاسم عبد الملك) قازی ولاتی (میسر) بووە. (ضياء الدين) ماوەیەك جێگری قازیەتی (صدر الدين )ی برای بووە، لە (قاهیرە)[٥].

شارەزاییەکی کەم وێنەی هەبووە، لە مەزهەبی شافعی، هەر بۆیە (ابن خلكان) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((زیرەکترین شەرعناسی مەزهەبی شافعی بووە، لەو کات))[٦]،

پاشان دوور خراوەتەوە لە پۆستەکەی. لە دواییدا میر (جمال الدين خشترين الهكاري م:٦١٩ك/١٢٢٢ز) قوتابخانەیەکی لە نێو کۆشکی (قاهیرە) دروست کردبوو، ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەم قوتابخانەیەی بە قازی (ضياء الدين) سپارد، ئەویش دەستی کرد بەوانە وتنەوە تیایدا تاوەکو لە لە مانگی (ذي القعدة)ى ساڵی(٦٠٢ك/١٢٠٥ز) کۆچی دوای کرد، تەمەنی نزیکەی (٩٠) ساڵ دەبوو[٧].

---

(١) المنذري، تكملة لوفيات النقلة، مج٢، ص٩٠.

(٢) ابن قاضى شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص٦٠؛ السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٠٨؛ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، ج١١، ص٣٥٩.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛اليافعي،مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٣.

(٤) لە سەرچاوەکانی تریش ئامازەیان پێنەکردووە. المنذري، تكملة لوفيات النقلة، مج٢، ص٩٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٣١.

(٥) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٣١.

(٦) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢.هەروەها بڕوانە: اليافعي،مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٣؛ السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٠٨.

(٧) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٣١؛اليافعي،مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٣؛ ابن قاضى شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص٦٠.(ضياء الدين) کوڕێکی هەبووە بە ناوی(جمال الدين أبو إسحاق إبراهيم)،شەرعناس وموحەدیس وشاعیر بووە، لە نێوان (هند) و(یەمەن) لە ساڵی (٦٢٢ك/١٢٢٥ز) مردووە. السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ٤٠٨.

**٣) قازی(صدر الدين أبی القاسم عبد الملك):**

**(صدر الدين أبی القاسم عبد الملك[١]، بن عيسی بن درباس الكردی الموصلی)[٢]، برای قازی (ضياء الدين أبو عمرو عثمان بن عيسی بن درباس الهذبانيالماراني)بوو[٣]. حاكمی ولاتی ميسر بوو[٤].قازيقوزاتی شافعی بووه، له ولاتی ميسر[٥].**

**هەرچەندە (ابن خلكان) لە گوزشتەیەكی تایبەت باسی قازی (صدر الدين) نەكردووە، بەلام لەسەر گوزشتەی(ضياء الدين شارح المهذب)برای، ئاماژەی بە ژیان و**

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛الحسيني، صلة التكملة لوفيات النقلة، تحقيق: بشار عواد معروف، دار الغرب الاسلامي (بيروت: ٢٠٠٧)،ج١، ص٢١٤؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛ ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، ص٢٥٢.

(٢)سبط ابن الجوزي، مرآة الزمان في تاريخ الاعيان، ج٢٢، ص٨١؛السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٠٨؛ لولاف مصطفى سليم، القضاء في مصر والشام في العهد الايوبي، دار دجلة، (عمان: ٢٠٠٧)،ص٨٥. بە ناوی(أبو القاسم صدر الدين الكردي) یش هاتووە.ابن حجر العسقلانی، رفع الاصر عن القضاة مصر، ص٢٥٢.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٣١؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٣٠.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٣٠.تێبینی دەكرێ (ابن خلكان) ووشەی (حاكم) ی بۆ قازی(صدر الدين) بەكارهێناوە، لەوانەیە مەبەستی (ابن خلكان) لە پۆستی (حاكم) (قاضي القضاة) بێت، چونكە لە زۆربەی سەرچاوەكانی تر نالێن (صدر الدين) حاكم بووە، بەلكو دەلێن قازيقوزات بووە.هەروەكو لە پەراوێزی (٨) ئاماژەمان پێكردووە.

(٥) الحسيني، صلة التكملة لوفيات النقلة، ج١، ص١٢؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٣١؛الغساني، العسجد المسبوك والجوهر المحكوك في طبقات الخلفاء والملوك، تحقيق: شاكر محمود عبد المنعم، دار البيان(بغداد: ١٩٧٥)،ص٣٢٧؛ السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ٤٠٨؛لولاف مصطفى سليم، القضاة في مصر والشام في العهد الايوبي، ص ص ٨٥، ١٧٣.

ڕۆڵی قازیەتی (صدر الدین) کردووە. دەڵێت: (ئەو دوو دڵ بووە، لەوەی ئایا لە کۆتاییەکانی ساڵی ( ٥١٦ك/١١٢٢ن) یاخود لە سەرەتاییەکانی (٥١٧ك/١١٢٣ن)لە دایکبووە)[1].

سەرەتا قازی ڕۆژئاوا(الغربیە)[2] بووە، پاشان (صلاح الدین الایوبیی) لە ساڵی (٥٦٥ك/١١٦٩ن) قەزای وڵاتی میسری پێداوە[3]. تاوەکو لە مانگی (رجب)ی ساڵی (٦٠٥ك/١٢٠٨ن) لە قاهیرە کۆچی دوای کردووە[4].

لێرەدا پێویستە هەڵوەستە بکەین، لەسەر ئەوەی بۆچی نوسەر لەسەرگوزشتەیەکی تایبەت باسی قازی (صدرالدین)ی نەکردووە؟ لە کاتێکدا لە قازی (ضیاء الدین)ی برای بە ناوبانگتربوە، دەکرێ جەخت کردنەوەی زیاتری نووسەر، لە سەر (ضیاءالدین) بۆ ئەوە بگەڕێتەوە (ابن خلكان) سەرسام بووە بە شارەزایی زۆری

---

(١) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢.لەوانەیە(ابن خلكان) سالی لەدایك بوونی قازی(صدرالدین) ی لە کتێبەکەی(المنذري) وەرگرتبێت، چونکە (المنذری) دەلێت(قاضي القضاة صدر الدین ابو القاسم) لە کۆتاییەکانی ساڵی(٥١٦ك/١١٢٢ن) یانیش لە سەرەتاییەکانی (٥١٧ك/١١٢٣ن) لە(مروج) لە لای موسل لەدایك بووە. التكملة لوفيات النقلة، مج٢، ص١٥٦.

(٢) الغربیة: ناوچەیەکە سەر بەوڵاتی میسرە کەوتۆتە بەشی خوارەوەی میسر، چەندین ناوچە لەخۆدەگرێت وەك(الامیوط) و(البثنون) و(برمة) و(سخا) وهت القزويني، آثار البلاد وأخبار العباد، ص٢٠٢؛ياقوت الحموي، معجم البلدان، ج١، ص ص٢٥٦، ٣٣٨، ٤٠٣.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٢_٢٤٣.لێرەدا (ابن خلكان) ناڵیێت پۆستی (قاضي القضاة) ی میسری وەرگرتووە، تەنها دەلێت قەزای میسری پێسپێردراوە.بەلام سەرچاوەی تردەلێت لەدوای ئەوەی قازی ڕۆژئاوای میسر بووە، پاشان دەبێتە قازیقوزاتی میسرو بەشێکی زۆر لە ناوچەکانی شام، هەروەها دەبێتە بەرپرسی دیوانی (الاحباس) ی گشت ناوچەکانی میسر.المنذري، التكملة لوفيات النقلة، مج٢، ص١٥٦؛ ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، ص٢٥٢.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥.

(ضیاء الدین) لە مەزهەبی شافیعی، بەو ئەندازەی هەر خودی نووسەر دەڵێت: (زیرەکترین شەرعناسی مەزهەبی شافعی بووە، لەو کات). جگە لەوەش بە کتێبەکەی (المهذب)ی (ضیاء الدین) کاریگەربووە، بە ڕادەیەك لە سەرگوزشتەی (ضیاء الدین)دا بەم شێوەیە ناوی (ضیاء الدین)ی لەگەڵ کتێبەکەی بەیەکەوە هێناوە، نووسیەتی:(ضیاء الدین شارح المهذب).سەرەڕای ئەمانەش نووسەر لە نزیکەوە پەیوەندی لەگەڵ (ضیاء الدین المارانی) هەبووە، ئەمش کاریگەری خۆی هەبووە.

**٤) قاضي القضاة بدر الدين يوسف:**

قاضي القضاة ( بدر الدين يوسف[١]، بن حسن بن علي السنجاري[٢]، الكردي) [٣] .(ابن خلكان)، لە سەرگوزشتەیەکی تایبەت لە کتێبەکەی باسی ژیانی ئەم کەسایەتییەی نەکردووە، بەڵکو لە ژیننامەی (جمال الدین ابن مطروح) بە کورتی هەندێك زانیاری دەربارەی ئاماژە پێکردووەو دەڵێت: ((چەندین جار پێی وتومە، لە مانگی( ربیع الاول)ی ساڵی (٥٠٨ك/١١١٤ن) لە چیاکانی هەولێر لە دایکبوومە، (زرزاری) بووە[٤] .

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٦، ص٢٦٦؛ اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٤، ص١٥٠؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٧٨.

([٢])الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج١٦، ص٢٧٠؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٥، ص٢٨٦؛المقريزي، السلوك لمعرفة دول الملوك، ج١، ص٤٩٥؛ بدر الدين العينى، عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، ج١، ص٤١١؛السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج٢، ص١٦٠.

([٣]) بدر الدين العينى، عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، ج١، ص٤١١؛ ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر،ص ٤٧٤.

([٤]) وفيات الاعيان، ج٦، ص٢٦٦.

(بدرالدين يوسف) بۆ چەندین جار پۆستی قـازیقوزاتی میسری پـێ سـپێردراوە[١].
پەیوەندییەکی بـاش لـە نێـوان (بدرالـدين يوسـف)و (ابـن خلكـان)هـەبووە، رەچـەڵەکی (زەرزاری) هۆکارێك بووە، بۆ دروست بوونی پەیوەندی، کە هاوهۆزی کۆی دەکردنەوەو هەردووکیان لە هۆزی (زەرزاری) بوون . ئەمـەش هۆکارێـك بـووە، (بدرالـدين سـنجار)ی پۆستی جێگری قازیقوزات بە(ابن خلكان) بسپێرێت[٢].

(بدر الدين ) لەم پۆستە بەردەوام دەبێت، تـاوەکو لـە دوای شـەڕی (عـين جـالوت) کاتێك (الظاهر بيبرس) دەبێتە سوڵتان، لـە سـاڵی(٦٥٩ك/١٢٦٠) لـە پۆسـتەکەی دووری دەخاتەوەو زیندانی دەکات و پاشان ئازاد دەکرێ[٣].( ابـن خلكـان) دەڵێـت:((لـە ڕۆژی شەممەی(١٤)ی مانگی (رجب)ی ساڵی (٦٦٣ك/١٢٦٤ز) لە قاهیرە کۆچی دوای کـردووەو هەر لە قوتابخانەکەی خۆی دەنێژرێ)) [٤].

---

(١) بدر الدين العينى، عقد الجمان في تاريخ أهل الزمـان، ج١، ص٤١١ ؛ ابـن حجـر العسـقلانى، رفـع الاصر عن قضـاة مصـر، ص٤٧٤؛ السـيوطي، حسـن المحاضـرة في تـاريخ مصـر والقـاهرة، ج٢، ص١٦٤؛قادر محمد حسن، اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية، ص١٤٦.

(٢) ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصـر، ص ص٤٧٤_٤٧٥ ؛زبـير بـلال، مـن مشـاهير الكـرد (المـؤرخ ابـن خلكـان)،ص٩٧؛احمـد الخليـل، تـاريخ الكـرد في العهـود الاسـلامية، ص٣٥٨٩٧؛بەهارعباس جبرائيل، كوردە زرزارییەکان، ل٩٢.

(٣) ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، ٤٧٥.

(٤) وفيات الاعيان، ج٦، ص٢٦٦؛ ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، ٤٧٥.

### تەوەرەی چوارەم :سەرکردە سەربازییەکان :

(ابن خلکان) ئاماژەی بە دوو سەرکردەی سەربازی کورد کردووە، کە ڕۆڵیان بینیوە لە یەك لاییکردنەوەی شەڕو ململانێیە سیاسیەکانی سەردەمی عەباسی، هەروەکو سەرکردەی سەربازی ماونەتەوە تاوەکو مردنیان، ئەوانیش:

#### ١) أبو مسلم الخراساني :

(أبو مسلم عبدالرحمن بن مسلم)پێیان وتووە (عثمان)، (خراساني)بانگەوازی بۆ عەباسیەکان دەکرد[1]، دەڵێن ئەو(إبراهيم بن عثمان بن يسار بن شذوس بن جودرن)لە کوڕی ( بزرجمهر بن البختكان ) فارسی بووە.ئیمام (إبراهيم ابن محمد بن علي بن عبد الله بن العباس بن عبد المطلب) پێی وتووە: ناوت بگۆڕە، ئەویش ناوی لە خۆنا ( عبد

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٥؛ الذهبي، ميزان الاعتدال في نقد الرجال، تحقيق: علي محمد البجاوي، (بيروت: ١٩٦٣)،ج٢، ص٥٨٩؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص ص١٦١_١٦٢؛ دياب الإتليدي، إعلام الناس بما وقع للبرامكة مع بني العباس، تحقيق: محمد أحمد، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٤)،ص٧٨؛ عبد الحي الطالبى، نزهة الخواطر وبهجة المسامع والنواظر، دار ابن حزم، (بيروت: ١٩٩٩)،ج١، ص٤٩؛ عبدالرحمن فامى هروى، تاريخ هرات، دستنوشستى نويافتة، مركز ثذوهشى ميراث مكتوب، (تهران: ١٣٨٧) ص٣١؛ عبد الشافى محمد عبد اللطيف، السيرة النبوية والتاريخ الإسلامي، دار السلام، (القاهرة: ١٤٢٨)،ص٢٩٠؛علي محمد الصلابي، الدولة الأموية عوامل الازدهار وتداعيات الانهيار، دار المعرفة، (بيروت: ٢٠٠٨)،ج٢، ص٥٤٥.

الرحمن)[١]. باوكی خەڵكی رستاقی(فريذين)ە، لە گوندی (سنجرد) هەروەها دەگوترێت دەگەڕێتەوە بۆگوندی (ماخوان )كە (٣) فەرسەخ /(١٨كم) لە شاری (مرو)[٢] نزيكە[٣] .

باوكی هەندێك جار مەڕو ماڵاتی بۆ شاری كوفە دەهێنا، دواتر بە هۆی پیربوونی نەيتوانی زياتر ئەم كارە بكات. هەر لە (فريذين) كارمەندی شارۆچكەكەی لە سەر (ديوان) دايدەمەزرێنێت، باوكی كاتێك لە كوفە بوو، كە نيزەيەكی بەناوی (وشيكة) لەگەڵ خۆی هێنا بوو، دوو گيان بوو، باوكی بەر لەوەی بڕوات بۆ (أذربيجان)چەند ڕۆژێك لای (عيسی بن معقل بن عمير)مايەوە. لەوێ خەون دەبينێت، لەخەونەكەيدا خەريكی ميز كردن بوو، ئاگرێكی لە ئاسمان بينی، زەوی ڕووناك كردەوە، ئاگرەكە لە ناوچەی ڕۆژهەڵات كەوتە خوارەوە، بەم شێوەيە خەونەكەی بۆ (عيسی بن معقل) گێڕايەوە، ئەويش وتی: هيچ گومانم نيە ئەو كەنيزەی تۆ كوڕێكی دەبێت، پاشان باوكی كەنيزەكە بەجێدێلێت و ڕوودەكاتە (أذربيجان) هەر لەوێش دەمرێت. ئەم كەنيزەيە (ابامسلم)ی لێ دەبێت[٤]. (ابن خلكان) دەڵێت: (ابو مسلم الخراسانی) لە ساڵی (١٠٠ك/٧١٨ن)) لە گوندی (ناوانە) لە دايكبووە، خەڵكی(جی)ی (الاصبهانی)ش دەڵێن: لە (جی) لە دايكبووە[٥]،

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٢.

([٢]) مرو: بە ناوبانگترين شاری خوراسانە، بنكەی واليەكانی خوراسان بوو، ماوەی نێوان (مرو) و(سرخس) نزيكەی(٦)قۆناغە/(٢٥٢كم).اليعقوبي، البلدان، ص٩٨؛القزويني، آثار البلاد وأخبار العباد، ص٤٥٦.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٥؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج٦، ص٢٢٠.

([٤]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص١٤٥_١٤٦؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٢.

([٥])وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٩؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج٦، ص٢٢٠؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٣، ص٣٣٧.

(أبو حنيفەی دەينەوەری) دەڵێت:(( (ابو مسلم) مەملوك بووە، لەلای (عيسى)و (معقل ابني إدريس ابن عيسى العجليين ) ئەوان پەروەرديان كردووە، وەكو كوڕی خۆيان سەيريان كردووە، هەروەها ئاماژەی بە قسەی (ابو مسلم)يش كردووە، وتويەتی: دايكم لەلای ئەوانەوە بە حملەوە كراوە، پاشان من لای ئەوان لە دايك بوومە)) [١]. بەم شێوەيە لە لای (عيسى) گەورە دەبێت، كەسێكی ئەديب و زيرەك دەردەچێت، پاشان (عيسى)و (إدريس)ی برای لەلايەن (خالد بن عبد الله القسری) والی عيراق لە كوفە زيندانی دەكرێن، (ابامسلم )يش بە دواياندا دەڕوات و لە زيندان خزمەتيان دەكات، لەوێ كۆمەڵێك لە نوقەباكان (النقباء) ئيمام (محمد بن علي بن عبد الله بن العباس بن عبد المطلب)و هەندێك لە شيعە خوراسانيەكان، بەڕێكەوت، چاويان بە (ابا مسلم) دەكەوێت، سەر سوڕمان دەبن بە عەقل و مەعريفەت و قسەكردن و ڕەوشتی [٢].

پاشان (ابا مسلم) دەزانێت ئەوانە بانگەوازكەری عەباسين، لە گەڵيان ڕێك دەكەوێت (عيسى )و (ادريس) لە زيندان ڕادەكەن (ابو مسلم) لەگەڵ نوقەباكان كۆچ بۆ مەكە دەكەن، ئەيبەنە لای ئيمام (إبراهيم بن محمد) كە لە دوای مردنی (محمد بن علی) باوكی بۆتە ئيمام و ڕابەری عەباسيەكان، بەم شێوەيە، ئيمام (ابراهيم) زۆر سەرسام دەبێت، بە مەنتيق و عەقل و ڕەوشتی (ابامسلم) تەنانەت (ابامسلم) لە گەشتەكان لەگەڵی دابوو، بەردەوام خزمەتی دەكر پاشان نوقەباكان گەڕانەوە بۆ لای ئيمام (ابراهيم)و پێيان وت: كەسێك بۆ كاروباری خوراسان دانێ، ئەويش وتی (ابا مسلم ) دادەنێم، چونكە شارەزای ناوەوەو دەرەوەی ئەو كەسەم، بەم شێوەيە (ابا مسلم) لەسەر ناوچەی خوراسان

---

(١) الأخبار الطوال، تحقيق: عبد المنعم عامر، دار إحياء الكتب العربي، (القاهرة: ١٩٦٠)،ص ص٣٣٧_٣٣٨.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٦؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج٦، ص٢٢٠؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٢.

دانـرا[1]، دوای ئـەوەی (مـروان بـن محمـد)(م:١٣٢ك/٧٤٩ن) دوایـین خەلیفـەی ئومـەوی هەستی بە مەترسیەکانی عەباسیەکان کرد، ئیمام (ابراهیم)ی لە (حران) دەستگیر کـرد، پاشان هەر لە زیندان مایەوە، تـاوەکو لـە سـاڵی (١٣٢ك/٧٤٩ن)مر وەسـیەتی کـرد، لـە دوای خۆی (ابو العباس السفاح)ی برای ببێتە ئیمام، بەم شێوەیە (ابو مسلم) بانگەوازی عەباسی لە نێو خەڵك بۆ ئیمام (أبی العباس عبد الله بن محمـد) کـە بـە (السـفاح)ناسـراو بوو، دەکرد [2].

(ابن خلكان) دەڵێت: یەکەم دەرکەوتنی (ابو مسلم) لە (مـرو) لـە خراسـان لـە ڕۆژی هەینی مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٢٩ ك/٧٤٦ن) بە خۆی و(٥٠) پیـاوی لەگـەڵ دابـوو، کـە ئەو کاتە (نصر بن سیار) والی خوراسان بوو، لە بەرامبەر ئەمـە (نصـر بـن سـیار) چـەند نامەیـەکی بـۆ خەلیفـەی ئومـەوی ( مـروان بـن محمـد) نـارد، تیایـدا ئامـاژەی بـە مەترسیەکانی (ابو مسلم) کردبوو، ( مروان) بـە هـۆی سـەرقاڵ بـوونی، بـە لـە نـاوبردنی بزوتنەوەی خەواریجەکان لە جەزیرەی فوراتی نـەیتوانی یارمـەتی و کۆمـەك بـۆ (نصـر) بنێرێت. بۆیە (نصر ) بێئومێد بوو، لە پاڵپشتی (مروان) بۆیـە ناچـار بـوو خوراسـان بـە جێبێڵێت و بەرەو عیراق بڕوات.هەر لە ڕێگە لە ساڵی(١٣١ك/٧٤٨ن) لە دوای (٢٠) سـاڵ والیـەتی کۆچی دوای کرد.پاشان (ابو مسلم) توانی کەسایەتی (علـي بـن جدیع بـن علـي الكرماني) لە (نیسابور) بکوژێت. لە (دست)[3] وتاری بەناوی یەکـەم خەلیفـەی عەباسـی (أبـی العبـاس عبـد الله بـن محمـد)خوێنـدەوە. پاشـان سـوپایەکی ئامـادە کـرد، بـۆ ڕووبەڕووبوونەوەی خەلیفە (مروان) بەم شێوەیە یەکێك لە سوپاکانی خوراسانی و چەند

---

([1]) ابـن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٣، ص ص١٤٦_١٤٧؛الـذهبي، سـير أعـلام النـبلاء، ج٦، ص٢٢٠؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٢.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٧.

([3]) دست : ناوچەیەکی ناسراوە کەوتۆتە نێوانە هەریەکـە لـە(الـري)و(همـذان)و(قـزوين). الحمـوي، معجم البلدان، ج٢، ص٤٧٦.

سوپایەکی سەر بە (السفاح) توانیان لە (الزاب) لە نێوان موسل و هەولێر ڕووبەڕووی (مروان)ببنەوەو سەرکەوتنیان بەسەری تۆمارکرد، پاشان (مروان) بە شکاوی ڕایکرد، بۆ شام. لە وێشەوە بۆ میسر تاوەکو لە ساڵی(١٣٢ك/٧٤٩ز) دەکوژرێت و کەللەی سەرەکەشی بۆ (السفاح)دەنێردرێت و ئەویش کەللە سەرەکەی بۆ (ابو مسلم) دەنێرێ و (ابو مسلم) دەبێتە کاربەدەست لە خوراسان. (السفاح) زۆر ڕێزو گەورەیی بە (ابو مسلم) دەدا، بە هۆی پلان و کارەکانی، تەنانەت هەر کاتێك لای بووایە شیعری بەسەر دەوت[1].

تەنانەت (ابو مسلم)ی بەکاردەهێنا، بۆ لە ناوبردنی نەیارو ئەو کەسانەی کە جێگەی مەترسی بوون، بۆ دەسەلاتەکەی، بۆ نموونە بە فەرمانی ئەو (أبو سلمة الخلال)[2]کە وەزیری (السفاح) بوو، لە ساڵی(١٣٢ك/٧٤٩ز) لەلایەن (ابو مسلم الخراسانی) دەکوژرێت[3] . لە دوای مردنی (ابی العباس السفاح) لە ساڵی(١٣٦ك/٧٥٣ز

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص١٤٩_١٥١؛أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج١، ص٢٠٩؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٣، ص٥٨٥ ؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص ص١٦٢_١٦٣؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٣، ص٢٣٧.

(٢)بۆ زانیاری لەسەر ژیانی(أبو سلمة الخلال) بڕوانە سەرگوزشتەکەی لە (ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص١٩٥).

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص١٩٦؛
Holt.P.M, Lampton, A.S and Lewis, B. The Cambridge History of Islam(Cambridg: 1970) p.p: 106_107.
ئەوەی جێ ئاماژەیەهەندێك لە کەسایەتیە دیارەکانی بانگەوازکەری عەباسی بەدەستی (ابو مسلم) کوژراون جگە لە (ابو سلمة الخلال)،سەرچاوەکان ئاماژە بە کوژرانی (سليمان بن كثير) دەکەن کەیەکێك بوو لە بژاردەکانی بانگەوازی عەباسی لە خوراسان کە دواتر لەلایەن (ابو مسلم الخراسانی) دەکوژرێت.الذهبي، العبر، ج١، ص١٢٧؛ القلقشندي، نهاية الأرب في معرفة أنساب العرب، ص٤١٣.هەروەها کەسایەتی(إبراهيم بن ميمون، الصائغالمروزي) کە زۆر فەرموودەی لەبەر بوو تەنانەت هەریەکە لە(أبو داود)،و(النسائي) وهتد لەوی ڕیوایەتیان کردووە.سەرچاوەکان دەلێن بە ستەم بەدەستی (ابو مسلم) لە خوراسان لە

(ابوجعفر منصور)ی برای شوێنی گرتەوە[1] . (ابو مسلم) یەکێك بوو، لە بەهێزترین سەرکردە سەربازییەکانی عەباسی، تەنانەت (ابو جعفر) سودی لەو بەهێزیەی وەرگرت بەکاریهێنا، بۆ لە ناوبردنی نەیارەکانی و بەشداری پێکرد، لە ململانێی سیاسی نێو بنەماڵەی عەباسی، بەتایبەتی دوای ئەوەی (عبدالله )ی مامی لە ژێر فەرمانی (ابو جعفر) دەرچوو، داوای پۆستی خیلافەی کرد، (ابو المنصور) سوپایەکی بە سەرکردایەتی (ابو مسلم) بۆ ڕووبەڕووبونەوەی

ئامادەکرد، (ابو مسلم) توانی لەم ڕووبەڕووبونەوەیەدا سەرکەوێت و (عبدالله)ش ڕابکات[2] .(ابن خلكان) دەڵێت: (المدائني م:٢٢٤ك/٨٣٨ن) بەم شێوەیە وەسفی ڕوخساری (ابو مسلمی) کردووەو دەڵێت: باڵا کورت و ئەسمەرێکی ڕەوشەن و زۆر جوان بووە، ڕیشێکی جوان و قژێکی درێژ و دەنگێکی نەرم و زمانێکی پاراوی عەرەبی و فارسی هەبووە، شارەزابووە بە گشت کارەکان، لە ساڵێ یەك جار دەچووە لای ئافرەت)[3].

---

ساڵی(١٣١ك/٧٤٨ن) دەکوژرێت.المزي، تهذيب الكمال في أسماء الرجال، تحقيق: بشار عواد معروف، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٨٠) ج٢، ص٢٢٤ ؛بدر الدين العينى، مغاني الأخيار في شرح أسامي رجال معاني الآثار، تحقيق: محمد حسن محمد، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٦)،ج١، ص٢٢؛ أكرم بن محمد، المعجم الصغير لرواة الإمام ابن جرير الطبري، الدار الأثرية، الاردن، ج١، ص٢٧.

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص١٥٣؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٤.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص١٥٢؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج٦، ص٢٢٨؛ م.ا.شعبان محمد، فراهم آمدن زمينه هاى سياسى و اجتماعي نهضت عباسيان در خراسان، ت:.ثروين تركمنى اذر، (تهران: ١٣٨٦) پژوهشگاه علوم انساني ومطالعات فرهنگى.ص١٨٢.

(3) وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٨؛الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج٦، ص٢١٩؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٢؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٣، ص٣٣٧.

پاشان (ابو جعفر) دڵی لە (ابو مسلم) کرمی بوو، بڕیاری کوشتنی دا، (ابن خلكان) دەڵێت: لە دوای ئەوەی (ابو مسلم) لە حەج گەڕایەوە، لە (حيرة) نزيك كوفە چاوی بە گاورێك كەوت، كە شارەزایی لە گەردوون وخەون هەبوو، بە (ابو مسلم)ی وت: گەر بڕۆیتەوە بۆ (خراسان) سەلامەت دەبیت، (ابو مسلم) بڕوای پێكرد، بڕیاری گەڕانەوەی بۆ (خراسان) دا، بەڵام (منصور) لە ڕێگەی نامەكانیەوە فێڵی لێكردو تاوەكو هاتە لای، لە (مدائن) بۆ چەندین جار، لەگەڵ (منصور) كۆبۆوە، لە دواجار دا (منصور) چەند كەسێكی ڕاسپاردبوو، بەنهێنی لای خۆی حەشاردابوو، كاتێك (ابو مسلم) هاتە لای سەرەتا سەركۆنەی كرد، پاشان فەرمانی كوشتنی دا. هەرچەندە (ابو مسلم) بیانوی هێنایەوەو داوای لێبوردنی لێكرد، پێی وت: بۆ دوژمنەكانت بمهێڵەوە، ئەویش وتی: جگە لە تۆ كێ لە پێشترە لە دوژمنەكانم، بەم شێوەیە لە ساڵی (١٣٦ك/٧٥٣ز) هەندێك دەڵێن ساڵی(١٣٧ك/٧٥٤ز) كوژرا[1].

---

(1) وفيات الاعيان، ج٣، ص ص١٥٣_١٥٤؛ الذهبي، ميزان الاعتدال في نقد الرجال، ج٢، ص٥٩٠؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٤؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٣، ص٣٣٧؛خواند امير، تاريخ حبيب السير في اخبار افراد بشر، چاپخانەی حيدری،چ٢، ١٣٨٠،ص ص٢٠٩_٢١٠.ئەوانەی پێیان وایە لە ساڵی (١٣٧ك/٧٥٤ز) كوژرایە.اليعقوبي، تاريخ اليعقوبي،ط٢، دار صادر، (بيروت: ٢٠١٠)،مج٢، ص٣٦٨؛ ابن قتيبة الدينوري،المعارف، تحقيق: ثروت عكاشة، ط٢، الهيئة المصرية العامة (القاهرة: ١٩٩٢)،ص٣٣٧؛ الفسوي، المعرفة والتاريخ، تحقيق: أكرم ضياء العمري، ط٢، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٨١) ج١، ص١١٩؛ الطبرى، تاريخ الرسل والملوك، ج٧، ص٤٩١؛ ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج٥، ص٥٦؛ ابن العبرى، تاريخ مختصر الدول، ص١٢٠؛الذهبي، ميزان الاعتدال في نقد الرجال، ج٢، ص٥٩٠؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٨، ص١٦٢.بۆ زانیاری لەسەر هۆكارەكانی كوشتنی (ابو مسلم الخراسانی) لەلایەن خەلیفە(ابوجعفر) ی بڕوانە.وفيات الاعيان، ج٣، ص ص١٥٣_١٥٤. ئەوەی جێی ئاماژەیە نوسەری هەمان زانیاری (الطبرى) و(ابن الاثير) لەسەر هۆكارەكانی كوشتنی(ابو مسلم) دووبارە كردووە. (الطبرى، تاريخ الرسل والملوك، ج٧، ص٤٩١) و(الكامل في التاريخ/ابن الاثير، ج٥، ص ص٦١_٦٢).

هەروەها (ابن خلكان) دەڵێت: (الزمخشری) لە کتێبی (ربیع الأبرار ) دەڵێت: (ابو مسلم) لە تەمەنی (١٨) ساڵی دەستی بە بانگەوازی کرد بۆ عەباسیەکان و لە تەمەنی (٣٢) ساڵی دەکوژرێت[١]. دوای بەدوا داچوون بۆ ئەم زانیاریە، لەکتێبەکەی ( الزمخشری) هەمان زانیاری ئاماژە پێکرابوو[٢].

تێبینی دەکرێ (ابن خلكان) گرنگیەکی زۆری بە سەرگوزشتەی (ابو مسلم)داوە، تەنانەت (١١) لاپەڕەی بۆ تەرخان کردووە، جگە لەمەش ئاماژەی بەقسەی زۆر لەو کەسانە کردووە، کە تیایدا بە باشی ستایشی (ابو مسلم) یان کردووە، بۆ نموونە یەك لەو کەسانەی کە (ابن خلكان) هێناویەتیەوە، ستایشی (ابو مسلمی) کردووە، خەلیفە (المأمون)( ١٩٨_٢١٨ك/٨١٣_٨٣٣ن)ە بەم شێوەیە وەسفی

(ابا مسلم) دەکات و دەڵێت: ((باشترین پاشایانی زەوی سێن، ئەوانەن کە هەستان بە قورسایی و بەهێز کردنی دەوڵەت، ئەوانیش ( اسکندر)و (أردشیر)و (أبو مسلم الخراسانی)بوون[٣].

سەبارەت بە ڕەچەڵەکی (ابو مسلم الخراسانی) (ابن خلكان) دەڵێت: بۆ چوونی جیاواز هەیە، هەندێك دەیگەڕێننەوە بۆ عەرەب، هەندێکی تر بۆ فارس و هەندێکی تر بۆ ڕەچەڵەکی کورد دەیگەڕێنەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم بەڵگە بەهێزەی کە دەیسەلمێنێت (ابو مسلم الخراسانی) لە بنەچەدا کوردە، بەڵگەکەش ئەوەیە لە دوای کوژرانی (ابو مسلم الخراسانی) (ابو دلامة)ی شاعیر، دوو بەیتە شیعری بەسەردا وتووەو تیایدا کوردبوونی ئەو کەسە پشت ڕاست دەکاتەوە، کە دەڵێت:

---

(١) وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٩.

(٢) ربيع الأبرار ونصوص الأخيار، مؤسسة الأعلمي، (بيروت: ١٤١٢)،ج٣، ص ص٥٤_٥٥.

(٣) وفيات الاعيان، ج٣، ص١٤٧؛ الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج٦، ص٢٢٠؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٣، ص٣٣٧.

أبا مجرم ما غير الله نعمةً ... على عبده حتى يغيرها العبد
أفي دولة المنصور حاولت غدرةً ... ألا إن أهل الغدر آباؤك الكرد[1] .

(ئـەی تاوانبـار، هـیچ کـات خـودای گـەورە نیعمـەتێکی لەسـەر عەبـدی خـۆی نەگۆڕیوە......هەتاوەکو بەندەکە خۆی لە خۆیی تێك نەدابێت ...ئایا لـە ژێردەسـەڵاتی (منصور)دا هەوڵی غەدر کردنت داوە.. ئەی نازانی غەدرکاران باوانتن لە کورد).

هەر لەم بارەیـەوە بـە دواداچـوونمان لـە سەرچاوەکانی پـێش (ابـن خلکـان)کـرد، زۆربەیان دەڵێن بۆ چوونی جیـاواز هەیـە، لەسـەر ڕەچـەڵەکی، لـە کۆتـایی قسـەکانیان دەڵێن (ابـو دلامـة) گەڕاندیتیـەوە بـۆ بنەچـەی کوردەکـان، بـە بەڵگـەی ئـەو دووبەیتـە شیعرەی ئاماژەمان پێکرد، کـە دەڵێـت: بـاب و باپیرانـت کـوردانی سـتەمکارن[2].جگـە لەوەی دانەری کتێبی (تأريخ سيستان) بە کوردی دادەنێت[3].

---

(1) وفيات الاعيان، ج٣، ص١٥٥؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظـان، ج١، ص٢٢٧؛ زرار صـديق توفيق، کوردو کوردستان، چاپخانەی ڕۆژهەلات، (هەولێر: ٢٠١٠)،ل٦١.

(2) ابن قتيبة الدينوري،المعارف، ص٢٤٠؛البلاذري، جمل من أنساب الأشراف، تحقيق: سهيل زكار و ريـاض خـير الـدين الزركلـي، دار الفكـر(بـيروت: ١٩٩٦)،ج٤، ص٢٠٧؛المجهـول، أخبـار الدولـة العباسية وفيه أخبار العباس وولده، تحقيق: عبد العزيز الـدوري واخـرون، دار الطليعـة، بـيروت، ص٢٥٨تەنانەت(ابن المعتز) باسی کێشەی نێوان (ابـو مسـلم) و(ابـو دلامـە) دەکـات، دەڵێـت لەدوای کوژرانی ابو مسلم لەو کاتە (ابو دلامة) هاتە لای (ابو جعفر) وسەری (ابو مسلم) ی بینی بەکوژراوی، ئینجا ئەم شیعرەی بەسەری داووت کەباسمان کرد، ئەمەش بەلگەیـەکی روونـە بـۆ کورد بوونی (ابو مسلم) چونکە (ابو دلامة) زۆرباش (ابو مسلم) ی ناسیوەو دیـارە دلنيـا بـووە کوردە بۆیە لەشعرەکەی بە کورد ناوی هێنـاوە. طبقـات الشـعراء، تحقيـق: عبـد السـتار أحمـد فراج، ط٣، دار المعارف، القاهرة، ص٦٢.

(3) ئەویش بەبەلگەی ئـەوەی ئـەو کتێبـە لەلایـەن (محمـد بهـار) سـاخکراوەتەوە کـە دەلێـت دەکرێ ووشەی کرد کە لەدوای ابو مسلم بەکار هاتووە باشگریێت بۆ ناوی ابو مسلم، لێرەدا (کرد) بـەمانای نـاو دێـت واتـە (کـورد) نـەك فـەرمان.تـاريخ سيسـتان، چـاپخانە فـردين وبـرادر، (١٣٨٩: طران)،ص١٣٦.

**٢) احمد بن الليث الكردي:**

(ابن خلكان) له سەرگورزشتەی (یعقوب بن الصفارم:٢٦٥ك/٨٧٨ن) باسی کەسایەتی (احمد بن الليث الكردي) کردووه [١]، سەرکردەیەکی سەربازی بوو، لە هەرێمی فارس، سوپاکەی لە کورد پێك دەهات، ڕۆڵێکی کاریگەری لە ڕووبەڕووبوونەوەی سەفارییەکان هەبوو[٢].

دوای ئەوەی (یعقوب بن الصفار) لە ڕێگەی نوێنەرێك چەند دیاریەکی گران بەها بۆ ( المعتز بالله) (٢٥٢_٢٥٥ك)(٨٦٦_٨٦٨ن) دەنێرێت و داوای (کرمان)ی لێ دەکات، کە ئەو کاتە ناوچەکانی هەرێمی (فارس) لە ژێر دەسەلاتی (علی بن الحسین بن قریش) دابوو، ( المعتز بالله) ڕەزامەندی نیشاندا، بەم شێوەیە (یعقوب) بە سوپایەکەوە بەرێدەکات بۆ ناوچەکانی کرمان، تادەگاتە (بم) کە سنوری یەکلاکەرەوەی نێوان (سجستان) و (کرمان)ە، داوای دەست بەسەر داگرتنی (کرمان)ی کرد، لەو کاتەش هەریەکە لە کەسایەتی (العباس بن الحسین بن قریش)ی برای (علی بن الحسین)و (احمد بن الليث الكردي) لە کرمان بوون، بەرەو شیراز بۆی دەرچوون، (یعقوب) توانی (علی) برای پێش بخات، تا گەیشتە (السیرجان ) شارێکە لە کرمان، بەرامبەر بەمە (احمد بن الليث الكردی) بۆ ڕووبەڕووبونەوەی سوپای سەفارییەکان بەرەو ڕوویان چوو، کوردێکی زۆری لەگەڵ هەندێك لە ڕەگەزی تر کۆکردەوەو خستیە نێو سوپاکەی و لە ڕێگادا ڕووبەڕووی (علی بن الصفار) بوویەوە، تیایدا (احمد بن الیث)هێرشی کردە سەر کۆمەڵێك لە یاوەرانی (یعقوب)، ئەوان داوای ڕێکەوتنیان کرد، بەڵام (احمد) هەندێکی لێ کوشتن و کۆمەڵێکیش هەلاتون، سەری کوژراوەکانی لەگەڵ خۆی هێنایەوە بۆ (فارس) ناردی بۆ (علی بن الحسین).بەم هەواڵ و شکستە (یعقوب) ئەم جارە خۆی بۆ دەست

---

([١]) وفيات الاعيان، ج٦، ص٤٠٥.

([٢]) وفيات الاعيان، ج٦،ص ص ٤٠٥_٤٠٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٨، ص٥٥؛ احمد عبد العزيز محمود، الكرد في كتابي اليعقوبي والطبرى، مديرية مطبعة الثقافة، (اربيل: ٢٠١٢)،ص٧٤.

گرتن بەسەر فارس ئامادەکردو بە سوپایەکەوە بەرەو کرمان و فارس هات، (علی بن الحسین) خۆی بۆ بەرگری کردن ئامادەکرد، سوپاکەی لە کوردو پێکهاتەی تر پێك هاتبوو، هەروەها (احمد بن اللیث الکردي)یش سوپاکەی خۆی ئامادەکردو هاتە پاڵ سوپای (علی بن الحسین)ی، سوپای (یعقوب) لە دەروازەی شیراز ڕووبەڕووی بەرگری کردنی سوپای (علی بن الحسین) بۆیەوە. لە ئەنجامدا سوپای (یعقوب) سەرکەوتنی تۆمارکرد و(علی بن الحسین)یش دەست گیرکرا[1].

(ابن خلکان) ئاماژەی بە گفتوگۆی نێوان (أحمد بن الحکم)و (یعقوب بن الصفار) دەکات (یعقوب) بە (احمد) دەڵێت: ئایا (علی بن الحسین) موسڵمانە، ئەویش وتی: بەڵێ، ئەی کەواتە بینیوتە موسڵمانێك کوردە بێباوڕەکان بێنێتە خاکی موسڵمانان و خەڵك بکوژن و ئافرەت وسەروەت و سامانی خەڵك بڕفێنن، ئایا نازانی (احمد بن اللیث الکردي) تەنها لە پێناو یەك خوێندا (٧٠٠) کەسی لە کرمان کوشت، جگە لەوەی ماڵ و نزیکەی هەزار ژنیان لەگەڵ خۆیان تالان کرد، موسڵمان بەمە ڕازی دەبێت؟ ئەویش لە وڵامدا وتی: (احمد) بە خۆی وای نەکردووە، بەڵکو بە فەرمانی کەسانی تر بووە[2] .

لە دوای مردنی (یعقوب بن اللیث)، (عمرو بن اللیث)ی برای، سوپایەك بەسەرکردایەتی (نصر بن احمد) دەنێرێت بۆ لە ناوبردنی (احمد بن اللیث)ی کوردی، لە

---

(1) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٦، ص ص٤٠٥_٤٠٦ ؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج٢٨، ص٥٥.(زرار صدیق توفیق) دەڵێت دوای ئەوەی (یعقوب) سەرکەوتنی تۆمار کرد، (احمد بن اللیث) بە شکستی گەڕایەوە بۆ فارس. الکورد في العصر العباسي حتی مجيء البویهیین، رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الی مجلس کلیة الاداب، جامعة صلاح الدین، (اربیل: ١٩٩٤ن)،ص٥٨.

(2) وفیات الاعیان، ج٦، ص٤٠٨.

دەرەنجامـدا (احمـد بـن الليـث) تووشـی شكسـت دەبێـت و دەسـتگیر دەكـرێ پاشـان دەيكوژن[١].

## تەوەرەی پێنجەم : پەردەدار :

بريتيه لەو كەسەی لە بەردەم دەرگـای فـەرمانڕەوا دەوسـتێت، ڕێگـرە لـە چـوونە ژوورەوەی خــەڵك بــۆ لای، وەكــو پەردەيــەك وايــە لــە نێــوان خــەڵك و فــەرمانڕەوا، دايدەبڕێنێت لەخەلك[٢]. ئەركەكەی ڕێكخستنی پەيوەندی نێوان فەرمانڕەوا و خەڵكە[٣]، وەكو سكرتێری ئێستا وايە[٤]. پەردەدار بەر پرسی خستنە ژوورەوەی خەڵكە بۆ لای فــەرمانڕەوا، لــە تواناشــی دايــە ئــەو كەســانە دوابخــات كــە دەيانــەوێ بچــنە لای پاشا[٥].هەرچەندە ئەم پيشەيە لە سەردەمی خيلافەی ڕاشدين نەبوو، هــەر كەسـێك لـە خاوەن پێداويستەكان بيان ويستايە خەليفـە ببيـنن، بـەبێ ئـەوەی كـەس لای دەرگـای خەليفە بێت، ياخود بەربەستێك هەبێت، دەچوونە ژوورەوە، بەڵام لە دوای تيرۆركردنی

---

(١) مؤلف مجهول، تاريخ سيستان،ص ٢٤٠.

(٢) ابن خلدون، تاريخ ابـن خلـدون، ج١، ص ص٢٩٧، ٢٩٩؛ سـالم بـن عبـدالله الخلـف، نظـم حكـم الأمويين ورسومهم في الاندلس، (المدينة المنورة: ٢٠٠٣)،ج١، ص٤١١.

(٣) فاروق عمر واخرون، النظم الاسلامية، ص٩٤.

(٤) محمــد رواس قلعجــی و حامــد صــادق، معجــم لغــة الفقهــاء، ط٢، دار النفــائس(بــيروت: ١٩٩٨م)،ص١٧٥.بەلام ( رمضان شريف الداودي) دەلێت ئەم پيشـەيە بەرامبـەر يـاخود وەكـو پيشـەی بەڕێوەبـەری تەشـريفاتی ئێسـتايە.لورسـتان الكـبرى، مؤسسـة موكريـانی، (اربيـل: ٢٠١٠)،ص١٠٧.

(٥) جواد علي، المفصل فی تـاريخ العـرب قبـل الإسـلام، ط٤، دار السـاقي، (بـيروت: ٢٠٠١م) ج٩، ص٢٨٥.

هەریەکە لە ئیمام (عمر)و (علی)...هتد، وای لە فەرمانڕەوایانی ئیسلام کرد، ئەم پۆستە دابنێن، بۆ پاراستنیان لە مەترسی کوشتنیان[1].

## ١) صلاح الدين الاربلي:

(صلاح الدين) ماوەیەك پەردەدار بووە، لەلای سوڵتان (مظفر الدين بن زين الدين)خاوەنی هەولێر، دواتر ماوەیەك زیندانی دەکرێ، هەرچەندە (ابن خلكان) ئاماژەی بە هۆکاری دەست گیرکردنەکەی نەکردووە، لە دوای ئازاد بوونی لە ساڵی(٦٠٣ك/١٢٠٦ن) کۆچ دەکات بۆ شام، لەوی خزمەتی (الملك المغيث ابن الملك العادل)دەکات[2]،

بەڵام (ابن المستوفي) هۆکاری زیندانییەکەی ئاماژە پێکردوەو دەی گەڕێنێتەوە بۆ ئەوە کە ویستوویەتی پۆستەکەی بۆ بەرژەوەندی خۆی ئستیغلال بکات. پێدەچێ ئەم زانیاریە (ابن خلكان) لە کتێبەکەی (ابن المستوفي)وەرگرتبێت، چونکە لێك چوون لە نێوان زانیاریەکان بەدی دەکرێ[3].

## ٢) عمر بن أبي بكر الدوني:

( عمر بن أبي بكر ابن يونس الدوني) باوکی (أبو عمرو ابن الحاجب)بووە، کەسایەتیەکی کوردی بووە[4]، (ابن خلكان) زانیاری کەمی لەسەر نووسیوە، لە

---

([1]) ابن الأزرق، بدائع السلك في طبائع الملك، تحقيق: علي سامي، وزارة الاعلام، عيراق، ص٢٦٩.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٤؛ محسن محمد حسين، هەولێر لەسەردەمی ئەتابەگیاندا، ل٣٥٤؛ اميد ابراهيم جوزەلی، الحياة العلمية في اربيل، ص١٥٩.

([3]) تاريخ اربل، ج٥، ص ص٣١٢_٣١٤.

([4]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٨؛ خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢١١.

سەرگوزشتەی (أبو عمرو ابن الحاجب)ی کوڕی باسی کردووەو دەڵێت: پەردەداری میر (عز الدين موسك الصلاحي)[١]بووە، زیاتر لەسەری نەدواوە[٢].

## تەوەرەی شەشەم :بەرپرسی قەلا (دزدار القلعة) :

دزدار: وشەیەکی فارسی یە، بەمانای پارێزەری قەلاّ دێت، بەو کەسە دەوترێت، کە ئەرکی پاراستنی قەلاّی لە ئەستۆدابوو، والّی بوو، کە پێی دەوترا (دزدار القلعة)، (دزە) لە فارسیدا بە واتای قەلاّ و (دار):بە پارێزەر دێت[٣]. ئەو کاتە قەلاّکان وەك ناوەندێکی گرنگ بوو، شوێنی کۆگاو گەنجینەی چەك و پێداویستیەکان بوو، لەلایەن سوپایەك بەسەر پەرشتی دزداری قەلاّ دەپارێزرا، دزدارەکەش دەبێت سیفاتی ئازایەتی و خاوەن عزم و تەدەبور بێت[٤] .لەم بارەیەوەش (ابن خلكان) تەنها ئاماژەی بەیەك دزداری کورد کردووە، کە ئەم پۆستەی پێسپێردرابێت، ئەویش:

---

(١) عز الدين موسك الصلاحي: لە زۆر لەسەرچاوەکان گەراین هیچ زانیاری تەواو لەسەر ئەم کەسایەتیە نەدراوە تەنها ئەوە نەبێت ئەمازەیان بەوە کردووە کەوا باوکی (ابن حاجب) ی سەربازێکی کوردبووە بۆتە پەردەداری (عز الدين موسك الصلاحي).الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ ابن الفرحون، الديباج المذهب في معرفة أعيان علماء المذهب، تحقيق: محمد الاحمدي، دار التراث، قاهرة، ج٢، ص٨٦.

(٢) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٨؛ خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢١١.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٢؛محمد أحمد دهمان، معجم الألفاظ التاريخية في العصر المملوكي، دار الفكر(دمشق: ١٩٩٠)،ص٧٥؛ سلام حسن خوشناو، جزيرة ابن عمر في القرنين السادس والسابع الهجريين، ص١٠١.تەنانەت (دوزي) لە کتێبەکەی دەڵێت: (دزدار) بەواتای فەرمانڕەوای هەرێمێك دێت.تكملة المعاجم العربية، نقله الى العربية وعلق عليه: محمد سليم واخرون، وزارة الثقافة والاعلام، (العراق: ٢٠٠٠)،ج٤، ص٣٤٧.

(٤) سلام حسن خوشناو، جزيرة ابن عمر في القرنين السادس والسابع الهجريين، ص١٠١.

**أیوب باوکی سوڵتان صلاح الدین الایوبی :**

(أبو الشکر أیوب بن شاذي بن مروان)ە، نازناوی (الملك الأفضل نجم الدین)ە، لە (دوین) هاتۆتە دونیاوە، بەڵام ساڵی لە دایکبوونی دیارنیە[1]، (ابن خلکان) باسی چۆنیەتی هاتنی بنەماڵەی ئەیوبی دەکات بۆ عیراق و دەڵێت: (المجاهد بهروز)[2] پێشتر لە (دوین) کەسێکی کاربەدەست بووە، زۆر هاوڕێی شادی بووە، پاشان تووشی کێشەیەك دەبێت، دوین بەجێدێلێت و بەرەو بەغدا دێت، لەوێش دەبێتە کاربەدەست لەلای سوڵتان (مسعود بن غیاث الدین محمد بن ملکشاه :م:٥١١ك/١١١٨ن)ی سەلجوقی، پاشان بەدوای شادی دەنێرێت، بەم شێوە شادی و هەردوو کوڕەکەی دێنە عیراق و ئەویش زۆر ڕێزیان لێ دەگرێ و پاراستنی قەڵای تکریت بە شادی سپاردووە، بەو هۆیەوە شادی لە تکریت گیرساوەتەوە، پاش ماوەیەك شادی دەمرێت[3]، دواتر (بهرۆز) بینی (نجم الدین) کەسێکی عاقل و ڕابردوو باشە (دزداری قەڵا)ی پێ دەسپێرێت[4].

بەم شێوە بووە جێنشینی باوکی، کە بەتەمەنتربوو، لە (اسدالدین)ی برای، (نجم الدین)یش بە باشترین شێوە بەڕێوەی برد و بە تەواوی کۆنترۆڵی کردو لەو

---

([1]) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج١، ص٢٦٠؛ السخاوي، التحفة اللطیفة في تاریخ المدینة الشریفة، دار الکتب العلمیە، (بیروت: ١٩٩٣م)،ج١، ص٢٠٩؛ ماجد عرسان الکیلاني، سەرهەڵدانەوەی نەوەی صلاح الدین وگەڕانەوەی قودس، و: صادق عوسمان، چاپخانەی نازە، (هەولێر: ٢٠٠١ن)،ل٢٩٢.

([2]) مجاهدین بهروز: کوری عبد الله أبو الحسن الغیاثي بوو، نازناوی(مجاهدین) بوو، رۆمێکی سپی پێست بووە، لەشاری دوین نیشتەجێ بووە پاشان بەهۆی هەندێك کێشەوە روویکردۆتە بەغدا، بۆ ماوەی (٣٠) سال پۆستی شەحنەی بەغدای بەدەستەوە بووە تا لەسالی (٥٤٠ك/١١٤٥ن) مردووە .ابن الجوزی، المنتظم، ج١٨، ص٤٦؛ ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج١، ٧، ص ص ١٤١، ٢٥٦.

([3]) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج١، ص٢٥٦؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٣١٩.

([4]) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٧، ص١٤٢.

سەروبەندانەدا کە (نەجمەدین) ببووە دزداری تکریت، ڕۆژێك لە ڕۆژان (نجم الدین)و (شیرکوه) پێکەوە بەناو شاری تکریت دا دەگەڕان، ئافرەتێك بە گریانەوە هانای بۆ هێنان، بە هۆی ئەوەی یەکێك لەسەر کردەکانی قەلا ویستبووی ئابرووی لەکەدار بکات، (شیرکوه)ش دەست بەجێ، تۆڵەی بۆ شەرەف و پیاوەتی کردەوەو یەکسەر

دەیکوژێت، (نجم الدین) وەك فەرمانداریکی خۆ نەبویرو ڕێ و شوێن زان (شیرکوه)ی برای خۆی کۆت و زنجیر کردوخستیە زیندان و کارەساتەکەشی چۆن دیبوو، ئاوای دەنامەیەکدا نووسی و بۆ (بهرۆز)ی نارد، چاوەڕێی فەرمانی ئەو بوو، (بهرۆز)یش هەرچەندە پێی ناخۆش بوو، دەریان بکات، بەلأم ناچاربوو، هاوخەمی خۆی بۆ دەربڕین و داوای لێکردن ناوچەکە بەجێبێلن[1] .

بەم شێوەیە، هەردوو برا کۆچیان کرد بۆ (موصل) و چوونە لای (عیماد الدین زنکی) کە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێکردن و دیاری و بەخششێکی زۆری پێدان. وەك پاداشتێك بۆ هەڵویستی دلسۆزانەیان کاتێ هەستان بە رزگارکردنی لە کوشتن و بەدیل گیرانی، ئەمەش لە کاتێکدا کە (عیمادالدین زنکی) لە نزیك (تکریت) ڕووبەڕووی سەلجوقیەکان بوویەوەو سوپاکەی لە بەرامبەر سولتانی سەلجوقیدا تێکشکاو لە کاتی پاشەکشەی بۆ (موصل) بە (تکریت) تێپەڕی و گیانی خۆی و سوپاکەی کەوتە دەست (نجم الدین ایوب). کە دەیتوانی بیانکوژێت یان رزگاریان بکات، بەلأم (نجم الدین) لەگەڵ براکەی چاکەی هەڵبژاردو هەستان بە یارمەتی دانی (عیمادالدین)و ڕێگەی رزگاربوونیان بۆ ئاسانکردن، تاوەکو گەیشتنەوە موصل، بەم شێوە (عیماد الدین) چاکەی دانەوەو

---

[1] ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١،ص ص٢٥٧ _ ٢٥٦؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٨٩؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٣١؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٢٩٠؛ماجد عرسان الكيلاني، سەرهەڵدانەوەی نەوەی صلاح الدین وگەرانەوەی قودس، ل٢٩٢.

زەوی پێدان، له خزمەت (عیمادالدین) بنەماڵەی ئەیوبیی گەشەی کرد، دوای ئەوەی (عیماد الدین) دەستی بەسەر (بعلبك)دا گرت و (نجم الدین)ی کردە دزداری ئەوێ[1]،

ماوەیەك پاش ئەوە (عیمادالدین) کوژرا و (نورالدین) کاروباری گرتە دەست، بەڵام (مجیرالدین)[2] هەستا بە گەمارۆدانی (نجم الدین) لە (بعلبك).دوای گەمارۆیەکی دوورو درێژ، هەردوولا سوڵحیان کرد و (نجم الدین) چووە (دیمەشق)، بوو بە یەکێك لە ئەمیرە گەورەکانی[3]،

پاشان دوای ئەوەی (نورالدین زنکی) دەستی بەسەر (دیمەشق) داگرت (نجم الدین)و (صلاح الدین)ی کوڕی بوونە خزمەت کارو کاربەدەست لای ئەو. دوای ئەوەی (صلاح الدین) دەسەڵاتی لە میسر جێگیر دەبێت و بەناوی (نورالدین) فەرمانڕەوایی میسری دەکرد، داوای لە (نورالدین) کرد کە (نجم الدین)ی باوکی ئیزن بدات بێتە لای ئەو، (نورالدین )یش ڕەزامەندی پیشانداو و (نجم الدین)ی بەرەو جگەر گۆشەکەی کە دەمێك بوو، بۆی بە پەرۆش بوو، بەرەو میسر بەڕێ کرد، ساڵی (٥٦٥ك/١١٦٩ن) (نجم الدین)

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٣؛ االصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٣١؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٩٠؛ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٣٦ ؛ابن خلدون، تاريخ ابن خلدون، ج٣، ص٦٢٥.

(2) مجير االدين أبق:کوری(بن محمد بن بوري بن أتابك طغتكين) ە، لە ساڵی(٥٦٤ك/١١٦٨ن) لە بەغدا کۆچی دوای کردووە.ابن أبي أصيبعة، عيون الأنباءفي طبقات الأطباء، ص٦١٥؛ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ٥، ص ص٢٩٧، ١٨٨.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٤٣؛ االصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٣١.

گەیشتە میسرو زۆر بەرێزو حورمەتەوە پێشوازی لێکرا، بەم شێوەیە کورو باوك بەیەکەوە شاد بوونەوە[١].

(ابن خلكان) دەڵێت: (ابن الاثير) لە کتێبەکەی باسی ڕۆڵ و ژیری (نجم الدين) دەکات، لە ئاسایبوونەوەی پەیوەندی نێوان (نورالدين زنكي)و (صلاح الدين)ی کوڕی، دوای ئەوەی (صلاح الدين) بە قسەی (نجم الدين)ی باوکی کردو نامەیەکی بۆ (نورالدين) نارد، تێیدا ملکەچی خۆی بۆ دووپات کردەوە، بەمەش پەیوەندییەکان ئاسایی بوونەوە[٢].

دوای گەڕان و بە دوا داچوونمان لە هەردوو کتێبەکەی (ابن الاثير) هەمان زانیاری باس کرابوو[٣]، (نجم الدين) بەم شێوەیە لە (قاهیرە) مایەوە تاوەکو ڕۆژی دووشەممەی(١٨)ی مانگی(ذي الحجة)ی ساڵی (٥٦٨ك/١١٧٢ز) لەسەر ئەسپەکەی هەڵدێراو نەخۆش کەوتوو، بە هۆیەوە لە ڕۆژی چوارشەممەی (٢٧)هەمان مانگ، کۆچی دوای کرد، لە قاهیرە بە خاك سپێردرا، پاشان لە ساڵی (٥٨٠ك/١١٨٤ز)ی هەردوو تەرمی (نجم الدين) و(اسدالدين)ی برای گواسترانەوە بۆ شاری (مەدینە)ی پیرۆز لەوێ نێژران[٤].

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص١٤٥، ١٥٥، ١٥٣، ١٥١؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٨٩؛ االصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٣١ ؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٩١؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٣٤١.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص١٦٣.

(٣) الكامل في التاريخ، ج٩، ص٣٦٨؛ التاريخ الباهر، ص١٥٨.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص٢٥٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٨٩؛ االصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص ص٣١_٣٢؛السخاوي، التحفة اللطيفة في تاريخ المدينة الشريفة، ج١، ص٢٠٩.

**لە ئەنجامی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لە نوسینەکانی (ابن خلکان) و بەراود کردنیان بە سەرچاوەکانی تر، دەتوانین گرنگترین ئاماژەکانی ئەم بەشە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا، کۆبکەینەوە.**

١) نووسەر زیاتر هەوڵیداوە سەرگوزشتەی ئەو فەرمانڕەواو کەسایەتیە سەربازییە کوردیانە بنووسێتەوە، کە سەردەمانێك لە نێوو ڕووداوە سیاسیەکانی جیهانی ئیسلامی، زۆر بەناو بانگ بوونە. لە نێوانیانیشدا زۆرتر جەختی لەسەر فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی ئەیوبیەکان کردۆتەوە، بەڕادەیەك بەشێکی زۆری لەسەر گوزشتەی کوردەکان، بۆ ئەیوبیەکان تەرخان کردووە.

٢) بە پێچەوانەی (ابن لاثیر)ەوە، کە سەرچاوەی سەرەکی گێرانەوەکانی نوسەر بووە، لەسەر بنەماڵەی ئەیوبییەکان، (ابن خلکان) هەوڵیداوە خۆی لەو ناکۆکییە سیاسیانە نەگلێنێت. کە لە نێوان زەنگییەکان و ئەیوبییەکاندا هەبووە، بێلایەنی نیشان بدات، هەرچەندە لە زۆربەی زۆری زانیاریەکانی لەمەڕ سەرەتاکانی مێژووی ئەیوبیەکان پشتی بە (ابن الاثیر)و (ابن شداد) بەستووە، کە وەك زانراوە (ابن الاثیر) سۆزدارو لایەنگیر بووە، بۆ زەنگیەکان. دەتوانین بڵێین (ابن خلکان) بەپێچەوانەی (ابن الاثیر) زیاتر سۆزی بۆ ئەیوبیەکان بەتایبەتی سوڵتان (صلاح الدین) هەبووە، ئەمەش شتێکی ئاسایی بووە، بۆ نووسەر، چونکە هاوسەردەمی ئەیوبیەکان بوو، نەك زەنگیەکان، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوەش نووسەر لەگەڵ ئەیوبیەکان خاوەن یەك ڕەچەڵەك بوونە، کە کوردە، لەگەڵ ئەوەش بە چاکە لەمەڕ زەنگیەکان بە تایبەت (نورالدین زەنگی) دواوە.

٣) نووسەر بەشێکی زۆری لە زانیاریەکانی لە مەڕ کەسایەتیە کوردیەکان لەسەرچاوەکانی پێش خۆی وەرگرتووە، بەڵام زیاتر جەختی لەسەر ئەو سەرچاوانە کردۆتەوە کە هاوسەردەمی کەسایەتیەکان و ڕووداوەکانی ئەو سەردەمە بوونە، بۆ نموونە بۆ سەردەمی میر(نصر الدولة)

پشتی بە(الفارقی) بەستووە، ئەوەش ئەوەمان بۆ دەردەخا کە نووسەر هەوڵی داوە زانیاریەکانی پشت ئەستور بکات، بە سەرچاوەی بڕواپێکراوی بەهێز، کە نزیک بن لە شوێن و زێدی کەسایەتیەکان، ئەمش بایەخێکی تر دەدا بە کتێبەکەی (ابن خلكان).

٤) (ابن خلكان) لەسەرگوزشتەی هەر میر و فەرمانڕەوایەکی کوردی دا، لایەنی شارستانی و ئابووری و کۆمەلایەتی فەرامۆش نەکردوە، تەنانەت باسی ژیانی تایبەتی وخولیاو ئارەزووەکانیشی کردووە.

٥) ئەگەر چی بەشێکی زۆر لە زانیاریەکانی نووسەر لەمەڕ کەسایەتیە سیاسی و سەربازییە کوردییەکان دووبارەیە و پشتی بەسەرچاوەی پێش خۆی بەستووە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا هەندێك زانیاری ناوازەو دەگمەنی ئاماژە پێکردووە، بەتایبەتی لەسەر ئەو فەرمانڕەوا ئەیوبیانەی کە هاوسەردەمی خۆی بوون، کە لە سەرچاوەکانی پێش خۆیدا بەرچاومان ناکەوێت. بەتایبەت کە نوسەر خۆی مەلیك (کامل)و (الاشرف)ی ئەیوبی بینیووە.

٦) لە نووسینەکانی نووسەر دا، ململاّنی سیاسی لە نێوو بنەماڵەی ئەیوبی ڕەنگدانەوەی هەیە، بەتایبەتی لە دوای مردنی سوڵتان (صلاح الدين) زیاتر تەشەنەی کردووە، بەڕادەیەك ململانێی نێو خۆی ئەیوبیەکان بەردەوام بووە، تاوەکو ڕوخانیان.

٧) بنەماڵەی ئەیوبیەکان ڕۆڵێکی کاراو کاریگەریان هەبووە، لە ڕووبەڕووبوونەوەی خاچپەرستەکان، لە هەندێك شوێندا، نووسەر ئاماژەی بە هاوکاری و هەماهەنگی نێوان مەلیکەکانی ئەیوبی کردووە، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی خاچ دروشمەکان.

٨) زانیارییەکانی نووسەر، لەمەڕ ئەو کەسایەتیە کوردییانەو پشتبەستن بەسەرچاوەی هاوسەردەمەکانیان و کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانە لەسەر چاوەی جۆراوجۆرە، لە چوار چێوەی یەك سەرگوزشتەی تایبەتدا، کتێبەکەی (ابن خلكان)ی کردووە، بە سەرچاوەی سەرەکی بۆ دەیان کتێبی دوای خۆی، کە پشتی پێ ببەستن و، هەمان زانیاری نووسەر دووبارە بکەنەوە، لە دیارترین سەرچاوەکانیش کە پشتیان

بە نووسەر بەستووە، بریتیین لە هەریەکە لە (الذهبي)و (ابن کثیر)و (الصفدی)و (ابن تغری بردی).

لە ژێننامەی زۆربەی ئەو کەسایەتیە کوردیانەی لە (وفیات الاعیان) باس کراون، نووسەر هەوڵی داوە، لە بنج و بنەوایان بکۆڵێتەوە، تەنانەت بنەچەی زۆربەیانی ئامـاژە پێکردوە، بەوەی دەگەڕێنەوە بۆ هۆزێکی کورد، یاخود کوردبوونە، یاخود خەڵکی چ گوندێك بووە. لە مەشدا ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کە نووسەر تاڕادەیەکی زۆر وردو پێداگر بووە، لەسەر یەك لاکردنەوەو زانینی نەژاد و زێدی ئەو کەسەیاتیە کوردیانەی کە باسی کردوون. ئەمەش سیفەتێك بووە، لە کەسایەتی خودی نووسەر، کە ڕەنگدانەوەی لە کتێبەکەیدا دەبینرێت، باشترین نموونەش بۆ پشت ڕاست کردنەوەی وتەی توێژەر، جەخت کردنەوەو وردبوونەوەو بەخەرج دانی هەوڵ و تەقەلای زۆری نووسەر بووە، بۆ یەکلایی کردنەوەی بنەچەی بنەماڵەی ئەیوبیەکان، کورد بوونی ئەو بنەماڵەی بەیەك جاری کۆتای پێهێناوە، بە پشت بەستن بە چەندین سەرچاوەی زارەکی و دەست نووسی مێژوویی .

# بەشی سێیەم :

## ژیننامەی کەسایەتییە کوردییەکان ورۆلی شارستانییەتیان لە بوارە زانستی وهزری ورۆشنبیرییەکاندا:

### تەوەرەی یەکەم : زانستە نەقلیەکان

یەکەم : زانستەکانی قورئان

دووەم : زانستی فەرموودە

سێیەم : زانستی شەرعناسی

چوارەم : زانستی زمانی عەرەبی ونەحوو سەرف

### تەوەرەی دووەم : زانستە عەقلییەکان

یەکەم : شیعرو ئەدەب و پەخشان

دووەم : زانستی مێژوو

سێیەم :دارشتن وخۆشنووسی

### تەوەری سێیەم : رۆلی کەسایەتییە کوردییەکان لە بواری بیناسازی وئاوەدانکاری وپەروەردەیی دا :

یەکەم :قوتابخانەکان

دووەم : خانەی فەرموودە

سێیەم : مزگەوتەکان

چوارەم : خانەقا وپەناگەو گۆشە ئاینیەکان

شەشەم: مامۆستا و وانەبێژانی کورد لە قوتابخانەو شوێنە زانستیەکاندا

پێنجەم :نەخۆشخانە (بیمارستان)

## بەشی سێیەم :

## ژیننامەی کەسایەتییە کوردییەکان و ڕۆڵی شارستانییەتیان لە بوارە زانستی وهزری ورۆشنبیرییەکاندا:

بە شێوەیەکی گشتی زانستەکان لە جیهانی ئیسلامیدا، دابەش دەکرێن بۆ دوو بەش: زانستە نەقڵیەکان و زانستە عەقڵیەکانە .

### تەوەری یەکەم : زانستە نەقڵیەکان:

ئەم زانستانە بەرهەم و زادەو هـزری کۆمەڵگای ئیسلامین، ڕاستەوخۆ بەستراونەتەوە بە قورئان و فەرموودە، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوێزرێتەوە. زانستە نەقڵیەکانیش ئەم زاستانە لەخۆ دەگرێت[1].

### یەکەم :زانستەکانی قورئان (علوم القران):

بایەخدارترین زانستە لای موسوڵمانان، لەبەرئەوەی بە سەرچاوەو بنەمای هەموو زانستە ئاینیەکان دادەنرێت، ئەمیش دەکرێت بەدووبەشەوە:

**أ) زانستی قورئان خوێندنەوە(علم القراءات):**

**لە ڕێگەی ئەم زانستەوە چۆنیەتی خوێندنەوەی پەیڤەکانی قورئان و گوتنەوەو دەربرینی بە دروستی دەزانرێت[1] .جا ئەگەر کەسێك بەزانستی خوێندنەوە ئاشنا**

---

([1]) حاجي خليفة، كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، ج١، ص٤٠؛ ڕەحیم ئەحمەد ئەمین، بەعەرەب بوون لە هەرێمە کورد نشینەکاندا، نامەیەکی بلاوئەکراوەیە پێشکەشی کۆلێجی زانستە مرۆڤایەتیەکان، زانکۆی سلیمانی کراوە، (سلیمانی: ٢٠٠٧)،ل٤٧.

نەبوایە و دەركی بە خوێندنەوە جۆراوجۆرەكان نەكردبا، بە قورئان خوێن هەژمار نەدەكرا[٢] . گرنگترین ئەو زانا كوردانەی كە بایەخیان دابوو، بە زانستی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، لەم بوارەدا بەهرەمەند بوون ئەمانەن:

١) **مكي الماكسيني النحوي**[٣]:

زانستی قورئان و قیرائات یەكێك بوو، لەو زانستانەی گرنگی پێداوە، دوای ئەوەی لە ماكسینی زێدی خۆی گەشتی بۆ (موصل) كردووە، لە سەرەتادا گرنكی بە زانستی قورئان و قیرائات داوە. پاشان گەشت بۆ بەغدا دەكات، لەلای چەندین زانا خوێندوویەتی[٤] . تاوەكو بۆتە زانا لە قیرائات[٥] .

ئەوەندە شارەزابووە، لە زانستی خوێندنەوەی قورئاندا، (یاقوت الحموی) لەم بارەیەوە دەڵێت: ((ئەو لە هەمووان باشتر قورئانی لە بەربووە و گوێزەرەوەی حەوت جۆرە قیرائەكەی قورئان بووە))[٦].

---

(١) السيوطي، الإتقان في علوم القرآن، تحقيق: محمد أبو الفضل إبراهيم، الهيئة المصرية العامة للكتاب، (القاهرة: ١٩٧٤، ج٤، ص٢١٥؛القنوجي، أبجد العلوم، دار ابن حزم، ٢٠٠٢، ص٣٣٧؛عبد القادر بن ملّا، بيان المعاني، مطبعة الترقي، (١٩٦٥: دمشق)،ص٤٧؛عبدالفتاح بن عبدالغني، البدور الزاهرة في القراءات العشر المتواترة من طريقي الشاطبية والدُّرة، دار الكتاب العربي، بيروت، ص٤٧؛ مناع بن خليل القطان، مباحث في علوم القرآن، ط٧، مكتبة وهبة، قاهرة، ص٣١٧؛عبدالقادر محمد، موسوعة علوم القرآن، دار القلم العربي، (حلب: ٢٠٠٢)،ص١٩٥.

(٢) قادر محمد حسن، اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية، ص٢١٤.بۆ زانیاری زیاتر لەسەر زانستی خوێندنەوەی قورئان بڕوانە. القنوجي، أبجد العلوم، ص٣٣٧.

(٣) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی بڕوانە بەشی سێیەم لاپەڕە(١٢٩)

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٧؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٦، ص٣٢.

(٥) ابن الجزري، غاية النهاية في طبقات القراء، مكتبة ابن تيمية، (القاهرة: ١٣٥١ك)،ج٢، ص٣٠٩.

(٦) معجم الادباء، ج٦، ص٢٧١٥.

**٢) أبو عمرو ابن الحاجب :**

(ابن الحاجب) كه پێشتر ئاماژەمان بۆ كردووه، هەر له منداڵيەوه له (قاهيره) خەريكى قورئانى پيرۆز بووه[١]، قورئانى لەبەر كردووه[٢]، گرنگى بە زانستى قيرائات داوه [٣] لاى چەندين زانا خوێندوويەتى[٤] .تاوەكو شارەزاييەكى باشى لەم زانستى قيرائات وەرگرتووه[٥].

**ب) زانستى لێكدانەوەى قورئان(علم التفسير):**

زانستێكه له قورئان دەكۆڵێتەوه، مەبەستى زانين و تێگەيشتنى هۆيەكانى هاتنەخوارەوەى ئايەتەكانى قورئانه بەگوێرەى تێگەيشتنى مرۆڤ و ڕێكخستنى مێژووى هاتنه خوارەوەيان كه ئايا ئايەتى (المكية) يان (المدنية)، واتا له شارى مەككه يان له مەدينه هاتونەته خوارەوه، بۆ تێگەيشتن و دەرخستنى ماناى وشەو دەستەواژەكان و

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٨؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢٢؛ ابن الجزرى، غاية النهاية في طبقات القراء، ج١، ص٥٠٨.

([٢]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٤٣٠؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢٢؛ابن تغري بردي، المنهل الصافي والمستوفى بعد الوافي، ج٧، ص٤٢١.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٩؛ ابن العماد، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، ج٧، ص٤٠٥.

([٤]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٤٣٠؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢٢.

([٥]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٩؛ ابن الجزرى، غاية النهاية في طبقات القراء، ج١، ص٥٠٨.

دەرهێنانی بنەما شەرعییەکان لێیان[١]. ئەم زانستەش یەکێك لە پایەبەرزترین وسودبەخشترین زانستی ئاینی دادەنرێت، چونکە تایبەتە بە لێکدانەوەی قورئان، کە قسەوگوتاری خوایە[٢]، ئەو زانا کوردانەی کە لەم بوارەدا بەهرەمەند بوونە ئەمانەن:

### ١) الشیخ الخضر بن نصر بن عقیل الإربلي:

یەکێك بووە لە زاناکانی هەولێرو لە زۆر بواری زانستە شەرعیەکاندا شارەزابووەو کتێب و نوسراوی هەبووە، لە بواری تەفسیریشدا نووسینی هەبووە و خزمەتی کردووە[٣].

(ابن خلکان) سەرسام بووە، بەلایەنی پارێزکاریی ئەو زانایە، بۆیە کاتێك وەسفی دەکان دەڵێت: ((پیاوێکی چاکخواز و پارێزکارو لە خواترس و زاهید بووە))[٤]. ئەم وەسفەی (ابن خلکان)ی لە (ابن عساکر)ی وەرگرتووەو[٥] دەستکاری کردووەو زیادی

---

(١) ابن عطیة، المحرر الوجیز في تفسیر الکتاب العزیز، تحقیق: عبد السلام عبد الشافي، دار الکتب العلمیة، (بیروت: ١٤٢٢)،ص ص٣_٤، مقدمة المحقیق؛الزرکشي، البرهان في علوم القرآن، تحقیق: محمد أبو الفضل إبراهیم، دار إحیاء الکتب العربیة(القاهرة: ١٩٥٧م)،ج١، ص ص١٣_١٤؛ حاجي خلیفة، کشف الظنون، ج١، ص١٤؛ الجرجاني، التعریفات، تحقیق: ضبطه وصححه جماعة من العلماء بإشراف الناشر، دار الکتب العلمیة، (بیروت: ١٩٨٣)،ص٦٣.

(٢) ابن ابي حاتم، تفسیر القرآن العظیم، تحقیق: أسعد محمد الطیب، مکتبة نزار مصطفی الباز، ط٣، (الریاض: ١٤١٩)،ص٥، مقدمة المؤلف؛ حاجي خلیفة، کشف الظنون، ج١، ص٤٢٧؛ قادر محمد حسن، اسهامات الکرد في الحضارة الاسلامیة، ص٢١٨.

(٣) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٢، ص٢٣٧؛الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٣٦٢؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٣، ص٢٠٩؛ابن کثیر، البدایة والنهایة، ج١٢، ص٣٥٣؛السبکي، طبقات الشافعیة الکبری، ج٧، ص٨٣.

(٤) وفیات الاعیان، ج٢، ص٢٣٧.

(٥) ابن عساکر، تاریخ دمشق، ج١٦، ص٤٤٩.

کردووە، لە دوای (ابن خلكان)یش (الصفدی)ئەم وەسفەی (ابـن خلكـان) پشـت ڕاسـت کردۆتەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی بڵێت لە (ابن خلكان)م وەرگرتووە[1].

٢) **تقی الدین ابن الصلاح :**

(تقی الدین) خاوەن پێگەیەکی بڵند بوو، لە نێو زاناکانی سەردەمی خۆی، لە بواری تەفسیرو زانستەکانی تردا[2].

### دووەم : زانستی فەرمووده(علم الحدیث) :

زانستی فەرمووده هەموو قسەو کردار و ڕەفتارو بڕیارەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لەخۆ دەگرێت، واتا گوتارو کردارەکانی و ئەوەی کە بنیویەتی و ڕەزامەندی خۆی لەسەر نیشانداوەو ڕەتی نەکردۆتەوە، ئەم زانستە گرنگی دەدات بە جۆرەکانی فەرمووده و ئەحکامەکانی و ژیانی فەرمووده ناسان و...هتد[3]، ئەم زانستەش بە زانستێکی پایە بەرز دادەنرێت، لە نێو زانستە ئاینیەکان، لە بەرئەوەی

---

(1) الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٢٠٩.

(2) ابن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٣، ص٢٤٣؛السيوطي، طبقـات الحفـاظ، ص٥٠٣.تەنانەت (ابـن الصـلاح) کۆمەڵێك قوتابی ناوداری پێگەیاند، لە بوارەکانی فەرموودەو شەرع وتەفسیر ومێژوودا، لەوانە، ئەبو شامە (م: ٦٦٥ك/١٢٦٦ز)،ئیبن خەلەکان(٦٨١ك/١٢٨٢ز)،و(ئیبن عەفیفی دیمەشقی(م: ٧٢٥ك/١٣٢٤ز)،ئیبن عەساکری دیمەشقی(م: ٦٩٩ك/١٢٩٩ز). احمد محمود خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٥٣.

(3) السخاوي، فتح المغيث بشرح الفية الحديث للعراقي، تحقيق: علي حسين علي، مكتبة السنة، (مصر: ٢٠٠٣)،ج١، ص٢٢؛السيوطي، تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي، تحقيق: ابو قتيبة نظر محمد، دار طيبة، الرياض، ج١، ص ص٢٥_٢٦؛ حسن ابراهيم حسن، تاريخ الاسلام، ج٢، ص٢٦٩.

دووەم سەرچاوەیە لەسەرچاوەکانی شەریعەتی ئیسلام لەدوای قورئان[١] .(ابن خلکان) ئاماژەی بەژمارەیەك لەو زانا کوردانە کردووە، کە بایەخیان بە زانستی فەرموودە داوەو سەرەڕای زانستەکانی تر شوێنکەوتوی ئەم زانستەش بوون ئەوانیش:

### ١) الشيخ الخصر بن عقيل الآربلي :

یەکێك بووە لە زاناکانی هەولێر، کە لە زۆر بواری زانستە شەرعیەکاندا شارەزابووەو کتێب و نوسراوی هەبووە، بەتایبەتی گرنگی زۆری بە زانستی فەرموودە داوە[٢] لەوانە کتێبێکی لە بواری فەرموودە نووسیوە، کە تیایدا باسی (٢٦)خوتبەی پێغەمبەر(محمد)(سەلامی خوای لەسەر بێت)کردووەو لەگەڵ لێکدانەوەی خاڵە گرینگەکان، گشت فەرموودەکانیشی دروستن.ئەمەش بۆتە

هۆی ئەوەی خەڵکانێکی زۆر بیخوێننەوەو سوودی لێببێنن[٣].

### ٢) شهدة بنت الإبري :

(فخر النساء شهدة بنت أبي نصر أحمد بن الفرج بن عمر الإبري) بە بنەچە خەڵکی شاری دەینەوەر بووە، لە بەغدا لە دایکبووەو ژیاوە[٤] .لەسەرچاوەی تردا بە(شهده

---

(١) السمعاني، أدب الاملاء والاستملاء، تحقيق: ماكس فايسفايلر، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٨١)،ص٣.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٢٧؛ الذهبي تاريخ، الاسلام، ج١٢، ص٣٦٢؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٢٠٩؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٢٥٣.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٢٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٦٢؛ ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص١٠.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٧٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٣٨؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٦، ص١١١؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان،ج٣، ص٣٠٢؛ القزويني،

بنت الآبری الآربلی)ناوی هاتووه[1].(ابن خلكان) ئاماژەی بە سالّی لە دایكبوونی نەكردووە[2].یەكێك بووە لە زاناكان، گوێی لە فەرموودە لەلای چەندین كەس گرتووە، لە حەدیس و ریوایەتدا ناسراوی بەغدا بووە و قوتابیان بە گەورەو بچووكەوە لە كۆڕی دەرسیدا كۆبوونەتەوەو بەهرەیان بردووە[3].

(ابن تیمیه الحرانی)[4]یەكێك بووە، لەو كەسانەی كە هاتۆتە خزمەتی و گوێی لە فەرموودە گرتووە[5] . تەنانەت لەسەرچاوەكان بە موسنەدی عیراقی ئەو سەردەمە

---

مشیخة القزوینی، تحقیق: عامر حسن، دار البشائر الاسلامیة، (بیروت: ٢٠٠٥م)،ص٤؛٢٠٥ ابن العماد، شذرات الذهب، ج٦، ص٤٤١٠خیر الدین الزركلي، الاعلام، ج٣، ص ص١٧٧_١٧٨.

(1) صلاح الدین العلائي، إثارة الفوائد المجموعة في الإشارة إلى الفرائد المسموعة، تحقیق: مرزق بن هیاس، مكتبة العلوم والحكم، (المدینة المنورة: ٢٠٠٤م)،ج١، ص٢٨٢.

(2) لەسەرچاوەكانی تریش ئاماژە بە سالی لەدایك بوونی نەكراوە.

(3) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٢، ص٤٧٧؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٥٢٨؛الصفدي، الوفي بالوفیات، ج١٦، ص١١١.(ابن خلكان) ئاماژەی بەناوی چەند زانایەك كردووە كە(شهدة) گوێی لێ گرتوون لەوانە(أبي الخطاب نصر بن أحمد بن البطر) و(أبي عبد الله الحسین ابن أحمد بن طلحة النعالي) و(طراد بن محمد الزینبي) هتوفیات الاعیان، ج٢، ص٤٧٧.

(4) ابن تیمیة: ابو عبد الله محمد بن أبي القاسم الخضر بن محمد بن الخضر بن علي بن عبد الله، بە(ابن تیمیة الحراني) ناسراوە، شەرعناس بووە، گەشتی زانستی بۆ بەغدا كردووە لەوێشەوە لەلای چەندین زانا خۆی پێگەیاندووە، زاناو ناوداری زانستەشەرعیەكان بووە شارەزای زۆری هەبووە لەمەزهەبی حەنبەلی كتێبێكی لەسەر ئەم مەزهەبە نووسیوە بەرادەیەك (ابن خلكان) دەلێت لە ئیمام حەنبەلی جوانتری نووسیوە، هەروەها خاوەنی دیوانی شعریش بووە لەسالی (٦٢١ك/١٢٢٤ز) هەر لە حران ی زێدی خۆی مردووە.بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە.ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٤، ص٣٨٧.

(5) ابن خلكان، وفیات الاعیان، ج٤، ص٢٨٦. جگە لەوەی چەندین زانای ترلەوخاتوونە زانایە فەرموودەیان گێراوەتەوە وەكو (ابن عساكر) و(ابن الجوزی) وهتالذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٢، ص٥٢٨.

ناویان هێناوه[1] .هاوسەرەکەی پیاوێکی زانای وێژەوانی خەڵکی بەغدا بووه، به ناوی (علی بن محمد بن یحیی)ناسراو به (ثقة الدولة ابن الأنباري)بووه، خزمەتی (أبا نصر أحمد بن الفرج الإبري)و (شهدة)ی خێزانی دەکرد، تاوەکو له ساڵی (٥٤٩ك/١١٥٤ن)( ثقة الدولة) دەمرێت، هەروەها (أبا نصر أحمد بن الفرج الإبري) باوکی (شهدة) له ساڵی(٥٠٦ك/١١١٢ن) له بەغدا مردووه و هەر لەوێش نێژراوه[2] .بەم شێوەیه (شهدة) له وانەوتنەوه بەردەوام بووه، تاوەکو له ساڵی (٥٧٤ك/١١٧٨ن) کۆچی دوای کردووەو کە ئەو کات تەمەنی نەوەد ساڵ و نیو بووه، هەر له بەغدا نێژراوه[3].

### ٣) مكي الماكسيني النحوي :

زانستی فەرمووده یەکێك بوو، لەو زانستانەی گرنگی پێداوه، (ابن خلكان) دەڵێت: (ابن المستوفي) له (تاريخ اربل) ئاماژەی به (مكي)کردووه، گوایه گەشتی زانستی بۆ بەغدا کردووه، لەم شارەش به خزمەت چەندین شێخ و زانای فەرمووده گەیشتووه، تاوەکو لەم بواره شارەزا بووەو زۆر فەرموودەی گێراوەتەوه[4] .

ئەو زانیاریه له کتێبی(تاريخ اربل)یش ئاماژەی پێنەکراوه، تەنانەت ئەم زانیاریه له نێوو بەشه تازه دۆزراوەکەی (ابن المستوفي)یش دانەبوو، بەمەش بۆمان به دەر دەکەوێت بەشێکی تر له زانیاری نێو کتێبی (تاريخ اربل) فەوتاوه پێویسته لێکۆڵینەوەو به دواداچوون بۆ ئەم زانیاریه لەناوچووانه بکرێ.

---

(1) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٣٨؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٦، ص١١١؛ابن العماد، شذرات الذهب، ج٦، ص٤١٠.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٧٨؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٣، ص١٧٨.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٧٧؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٣٨؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٦، ص١١١؛ ابن العماد، شذرات الذهب، ج٦، ص٤١١.

(4) وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨.

### ٤) تقي الدين ابن الصلاح :

(أبو عمرو عثمان بن عبد الرحمن بن عثمان بن موسى بن أبي نصر النصري الكردي الشهرزوري) به (ابن الصلاح) ناسراوه، (تقى الدين) نازناوى بوو[1]. گرنگى زۆرى به زانستى فەرموودە داوه، هەر لەم پێناوەشدا گەشتى زانستى بۆ (موصل) كردووه، لەوێش لەلای چەند زانایەك خوێندويەتی پاشان گەشت دەكات بۆ خوراسان، تاوەكو بە تەواوی زانستى فەرموودەی بەدەست هێناوه، ئینجا دەگەڕێتەوه بۆ شام لە (دیمەشق) خەریكی وانەوتنەوە دەبێت[2] .

(ابن خلكان) بەم شێوە ستایشى شێخ (تقى الدين) مامۆستاكەى دەكات و دەڵێت: (( یەكێك بوو لە زانا لێوەشاوەكانی سەردەمی خۆی، لە فەرموودەو شەرع (الفقه)و ناوی پیاوان و ئەوەی پەیوەندی بە زانستى فەرموودە هەبێت))[3] . تەنانەت لە زانستى فەرموودەدا خاوەنی كتێبێكی بەسود و بەناوبانگە[4] . ئەویش (معرفة انواع علوم الحديث)ە. كە بە (المقدمة) ناسراوه[5].

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٣٦٠؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦.بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی بڕوانە بەشی سێیەم لاپەڕە (١٢١).

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٣_٢٤٤؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦.

(٣) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ الذهبي، تذكرة الحفاظ، ج٤، ص١٤٩.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان،ج٤، ص٨٥؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٩٦؛ السيوطي، تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي، ج١، ص٥٩.

(٥) ابن الصلاح، معرفة انواع علوم الحديث، ص٩؛ مقدمة ابن الصلاح ومحاسن الاصطلاح، ص٢٦؛ الهروي، شرح نخبة الفكر في مصطلحات أهل الأثر، دار الأرقم، بيروت، ص٦٣٠؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢٠٧؛عبدالله بن فودي، منظومة مصباح الراوي في علم الحديث، تحقيق: محمد المنصور، ط٢، دار العلم للطباعة، (نيجيريا: ٢٠٠٥)،ص٢٧.

**سێیەم : زانستی شەرعناسی (علم الفقه):**

زانستی فیقهە یەکێکە لەو زانستانەی کە زۆرترین گرنگی پێدراوە لە جیهانی ئیسلامیدا، مەبەست لە (فقه) لە ڕووی زمانەوانیەوە، بە واتای زانینی شتێك و تێگەیشتنیەتی[1] . هەروەك چۆن لە قورئانی پیرۆزیشدا خوای گەورە دەفەرموێت:﴿قَالُوا يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِمَّا تَقُولُ﴾[2]. بە واتای تێگەیشتن لە قورئانی پیرۆز و هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییە کردارەکییەکان دێت، لە قورئان و فەرموودەو ئیجتهادکردن، لە ئەحکامەکان و کارئاسانی کردن و فەتوا دان بۆ خەڵك، بەپێی چوار مەزهەبە سوونیە سەرەکیەکان[3] .

ئیمامی غەزالی دەڵێت : هەر لە ڕێگەی ئەم زانستە، مرۆڤ بەپێی شەریعەتی ئیسلام، دەزانێت چ مافێکی هەیە، ئەو کارانەش چین، کە لەسەریەتی، بەمەش ڕێگە پێدراو (الحلال)و ڕێگە نەدراو (الحرام) لەیەك جیادەکاتەوە[4]. هەروەها (ابن خلدون)یش لە بارەی زانستی فیقهەوە وتویەتی:(( گەورەترین زانستی شەرعییە و لە هەموویان بە بایەخترە و سودی زیاترە)) [5]. لەم بوارەدا، کورد گەلێك زانای ناوداری هەبوون، کە خۆیان پێگەیاندوەو خزمەتی کاروانی زانستیان کردوە و لە کتێبی (وفيات الاعيان) ناویان هاتووە، ئەوانیش:

---

([1]) ابن منظور، لسان العرب، ج١٣، ص٥٢٢.

([2]) القران الكريم، سورة هود، ئاية: ٩١.

([3]) حاجي خليفة، كشف الظنون عن اسامي الكتب والفنون، ج٢، ص١٢٨٢.

([4]) إحياء علوم الدين، دار المعرفة، بيروت، ج١، ص١٤.

([5])تاريخ ابن حلدون، ج١، ص٥٧٣.هەروەها بڕوانە، عبدالكريم زيدان، الوجيز في اصول الفقه، مؤسسة الرسالة ناشرون، (دمشق:٢٠٠٩)، ص٩.

**١) أبو القاسم ابن كج القاضي[١]:**

**زانایەکی ڕێبازی شافعی بووە، بینین و خوێندنەوەی جوانی هەبووە، بۆ مەزهەبی شافعی، چەندین کتێبی لەسەر بەرهەم هێناوە، کە شەرعناسەکان سودیان لێ بینیوە[٢]. لە گرنگترین بەشداریکردنی شەرعناس (ابو القاسم) لە فیقهی ئیسلامیدا، دانانی کتێبی (مصنف التجرید في الفقه)ە[٣].**

**٢) ابن البزري :**

**(أبو القاسم عمر بن محمد بن أحمد بن عكرمة)ناسراو بە (ابن البزري الجزري)[٤]. (ابن خلكان) دەڵێت: پێیان وتووە (زین الدين جمال الإسلام) لە ساڵی(٤٧١ك/١٠٨٧ن لە دایکبووە، شەرعناسی شافیعی بووە، ئیمام و موفتی و فەقیهی (جزيرة ابن عمر)بووە[٥].**

**بە دواداچوونمان بۆ زۆر لەسەرچاوەکانی پێش نووسەر کرد، ئەم زانیاریەیان ئاماژە پێنەکردبوو، تەنانەت سەرچاوەکانی دوای (ابن خلکان) پشت ڕاستی ئەم**

---

(١) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی بڕوانە بەشی دووەم لاپەڕەی(٩٣).

(٢) خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٠.

(٣) ابن الغزي، ديوان الإسلام، ج٤، ص٨٧.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٤٤؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١٧٤؛ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج١، ص٣٢٠؛ابن حجر العسقلاني، تبصير المنتبه بتحرير المشتبه، ج١، ص١٣٧.

(٥) وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٤٤٤_٤٤٥؛هەروەها بڕوانە.السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٣١٠.

زانیاریانەیان کردۆتەوە، بەوەی لە (ابن خلکان) وەریان گرتووە[١]. خاوەن فتوای بەناوبانگ بووە[٢].

(ابن البزری) بۆ یەکەمجار خوێندنی لە زێدی خۆی (جزیرە)، لە خزمەت شێخ (أبی الغنائم محمد بن الفرج بن منصور بن إبراهیم بن الحسن السلمی الفارقی م:٤٨٣ك/١٠٩٠ز) دەستپێکرد و پاشان چوو بۆ بەغدا. لە کۆڕی دەرسی چەندین زانا بەشداری کردووە و بۆتە قوتابی لای ئەوان و بە هەرەی لێ وەرگرتوون، جگە لەوەی هاوڕێیەتی (ابوبکر الشاشی)[٣]خاوەنی کتێبی (المستظهري)و چەندین زانای تری کردووەو سودی لێان بینیوە. پاشان گەڕاوەتەوە بۆ (جزیرە)و خەریکی وانە وتنەوە بوو، لەسەر ڕێبازی خۆی.لایەنی زانستی و دینی لە ئاستێکی بەرز دابوو، زۆر گرنگی بە مەزهەبی شافیعی داوە، خەڵکێکی زۆر سودیان لێ بینیوە.تەنانەت لەم بوارەدا، کتێبێکی نووسیوە بە ناوی (الأسامي والعلل من كتاب المهذب). کە شەرحی کتێبی (المهذب)ی شێخ (أبی

(١) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١٧٤؛ ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج١، ص٣٢٠.

(٢) السيوطي، الأشباه والنظائر، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٠)،ص٢٥١؛زكريا الانصاري، أسني المطالب في شرح روض الطالب، تحقيق: محمد محمد تامر، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٠)،ج٤، ص١٦٢؛ابن الغزي، ديوان الاسلام، ج١، ص٣٤٨؛ الشربيني، الإقناع في حل ألفاظ أبي شجاع، دار الفكر، بيروت، ج١، ص١٨٠؛ الرملي، نهاية المحتاج إلى شرح المنهاج، دار الفكر، (بيروت: ١٩٩٨٤)،ج١، ص٢٩٢.

(٣) ابو بكر الشاشي: محمد بن احمد بن الحسين بن عمر، شەرعناسی شافیعی بووە، ئەشعەری بووە، سەرەتا لە میافارقین خوێندوویەتی پاشان گەشتی زانستی بۆ هەریەکە لەشارەکانی بەغداو مەککەو نیسابور کردووە، لای چەندین زانا ناودارەکانی ئەو کات خوێندوویەتی لەوانەش (شهدة) ی دەینەوەری بوە، خاوەنی چەندین بەرهەم بووە، لەدوای پێگەیشتنی بۆتە وانەبێژ لەقوتابخانەی (النظامية) تاوەکو لەسالی(٥٠٧ك/١١١٣ز) کۆچی دوای کردووە.الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١١، ص٩١.

إسحاق الشيرازى)كردووه. تا دوا كاتى ژيانى به دەرس گوتنەوەو و فتوادان بەسەربردوە، تا ئەوكاتەی له سالّی (٥٦٠ك/١١٦٤ز) له (جەزيره) كۆچى دواى كرد[1].

پێدەچێ نووسەر بەشێك له زانياريەكانى له هەريەكه له كتێبەكانى (ابن النقطة)و (ابن الصلاح) له بارەى ئەم زانايه وەرگرتبێت، هەرچەندە (ابن خلكان) ئاماژەى بەناوى ئەو سەرچاوانه لەمەڕ ئەو زانايه نەكردوە، بەلاّم هەندێك لێكچوون له نێوان زانياريەكانى نووسەر و دوو سەرچاوەكەى تر بەدى دەكرێت[2].

**٣) الشيخ الخضر بن نصر عقيل الإربلي :**

(أبو العباس الخضر بن نصر بن عقيل بن نصر الإربلي)، يەكێك بووە، له فەقيهەكانى شافيعى و شارەزا بووە، له مەزهەب و فەريزەو جياوازييەكان (الخلاف)دا، تەنانەت كتێب و نوسراوى له بوارى فيقهدا هەبووە، له سالّی (٥٧٨ك/١١٩١ز) له هەولێر له دايكبووە. ئەو له بەغدا لاى (ابو بكر الشاشى م:٥٠٧ك/١١١٣ز) و زاناو مامۆستاى تر خوێندوويەتى و پاشان گەڕاوەتەوە هەولێر[3].(ابن خلكان) لەمەڕ ئەم زانايە ئاماژەى بەقسەى (ابن عساكر) له (تاريخ دمشق)كردووە، كه ستايشى دەكات و دەڵێت: ماوەيەك

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٤٤٤_٤٤٥؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١٧٤؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٣١٢؛ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج١، ص ص٣٢٠_٣٢١.

(٢)بڕوانة: ابن النقطة، إكمال الإكمال، تحقيق: عبد القيوم عبد ريب النبي، جامعة ام القرى، (مكة: ١٤١٠)،ج١، ص٣٩٩؛ابن الصلاح، طبقات الفقهاء الشافعية، محيي الدين علي نجيب، دار البشائر الإسلامية، (بيروت: ١٩٩٢)،ج٢،ص٦٥٢.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٧؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٦٢؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٣، ص ص٢٠٨_٢٠٩؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٣٥٣.

چووتە (دیمەشق) و پاشان گەڕاوەتەوە بۆ هەولێر[١] .بە دوا داچوونمان بۆ ئەم زانیاریانە کرد، کە (ابن خلکان) لە (ابن عساکر)ی وەرگتووەو، (ابن عساکر) هەمان زانیاری لە کتێبەکەی باس کردووە[٢]، ئەمەش دەیسەلمێنێت کەوا (ابن خلکان) بە ئەمانەت و ڕاستگۆیانەوە زانیاریەکانی لەسەرچاوەکانی پێش خۆی تۆمارکردوەو ناویانی هێناوە. تەنانەت بەشێك لە زانیارییەکانی (ابن خلکان)ی دەربارەی شێخ (الخضر) ئاماژە پێکردوە، لە (ابن عساکر)ی وەرگرتووە، چونکە لێك چوونێکی تەواو لە نێوان هەردوو زانیارییەکە هەیە.

ئەوەی جێی ئاماژە پێکردنە زۆربەی زانایانی کورد بەمەبەستی خوێندن، لە زانستە شەرعیەکاندا، گەشتی زانستییان بۆشاری بەغدا ئەنجام داوەو لەوێ خوێندنیان تەواو کردوە، خۆیان پێگەیاندوەو ئینجا گەڕاونەتەوە بۆ زێدی خۆیان، هۆکارەکەشی ئەوە بوو، کە بەغدا وەکو ناوەندی زانستی و ڕۆشنبیری جیهانی ئیسلامی بووە، تەنانەت زۆر لە زانا بەناوبانگەکانی ئەوکات لە بەغدا نیشتەجێ ببوون و خەریکی وانەوتنەوە بوون.بۆیە هەرکەسێك بیویستایە لە ڕووی زانستییەوە بە باشی خۆی پێ بگەیەنێت، ئەوا (بەغدا) باشترین شوێن بوو، بۆ ئەوەی ڕووی تێ بکات، چونکە سەرەڕای ئەوەی ئەم شارە مەڵبەندێکی گرنگی مەعریفی بوو، زاناو فێرخوازان لە هەموو بەشەکانی جیهانی ئیسلامییەوە ڕوویان تێ دەکرد، بۆیە ببووە شوێنی بەریەك کەوتن و ئاڵوگۆڕە فکری ومەعریفییەکان.

(ابن خلکان) دەڵێت: پاش گەڕانەوەی ئەم زانایە لە (بەغدا) میر (سرفتکین بن عبد الله الزینی)[٣] جێگری خاوەنی هەولێر، لە ساڵی (٥٣٣ك/١١٣٨ز) قوتابخانەی قەلعەی بۆ

---

[١] وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٧.

[٢] ابن عساكر، تاريخ دمشق، تحقيق: عمرو بن غرامة، دار الفكر، ١٩٩٥، ج١٦، ص٤٤٩.

[٣] أبو منصور سرفتكين بن عبد الله الزيني: مەملوکی (زين الدين علي) ی خاوەنی هەولێر بووە، بەهۆی کەسایەتیەکی باشی هەبووە، (زين الدين) لەفەرمانڕەواییەکەی پشتی پێبەستووە،

وانەوتنەوە بنیات نا، بەم پێیەش بە قسەی (ابن خلكان ) ئەو یەكەم كەس بووە، كە دەرسی لە هەولێر وتووەتەوە[1]،

وا دیارە ئەم زانیاریە دەگمەنە، چونكە لە هیچ سەرچاوەیەكی پێش (ابن خلكان) ئامـاژەی پێنـەكراوەو نەكەوتۆتـە بەرچـاومان، تەنانـەت سەرچـاوەی تـریش ئـەو زانیاریانەیان پشت ڕاست كردۆتەوەو لە (ابن خلكان)یان وەرگرتووە[2]. هەرچەندە (ابن المستوفی) لە كتێبەكەی ئاماژە بەوە دەكات، كە گوایە شێخ (الخضر) وتوویەتی :(( یەكەم كەس لە هەولێر كە لە زانستی فیقهە پێگەیشتووبێت (محمد بن علی بن جامع)بووە، هەر خۆم هەندێك زانستی شەرعناسیم لای ئەو خوێند، بە ڕادەیەك هۆگری فێربوونی ئەم زانستە بووم و ڕووم كردە قوتابخانەی (النظامية)[3]،

---

تاوەكو بۆتە جێگری، چەندین كاری خێرخوازی كردووە لەوانەش دروست كردنی چەندین مزگەوت لە هەولێر ودەوروبەری، لەسالی(٥٥٩ك/١١٦٣ز) كۆچی دوای كردووە.ابن المستوفي، تاريخ اربل، ج٢، ص٤٤٥، محقيق ؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٧.

(1) وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٧.

(2) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٦٢؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٣٥٣؛بشار عواد معروف، التربية والتعليم في العراق حتى نهاية العباسي، مكتبة الامام الباري للنشر والتوزيع، (القاهرة:٢٠١٠م)ص١٩٦؛زبيربلال، من التراث الثقافي الكردي(علماء ومدارس في اربيل)،ص١٧؛محسن محمد حسين، هەولێر لەسەردەمی ئەتابەگیاندا، ٢٧٤؛ اميد ابراهيم جوزەلی، الحياة العلمية في اربيل، ص٩١؛ عثمان امين صالح، اربيل، ئاراس، (اربيل: ٢٠٠٩ز)،ص٢١؛رسول ابراهيم رسول، شوێنەوارەكانی لە شكركێشی هێزە بیانیەكان لەسەر كوردستان، نامەیەكە پێشكەش كراوە بە ئەنجومەنی كۆلیجی ئەدەبیاتی زانكۆی سەلاحەددین، (هەولێر: ٢٠١٠ز)،ل٦٥.

(3) تاريخ اربل، ج١، ص٢٧٠.

پێویسته لەم بارەیەوە لێکۆڵینەوەیەك بکرێت، لەسەر ئەوەی ئایا لەڕاستیدا شێخ (الخضر) یەکەم کەس بووە، کە وانەی لەم شارە داوەتەوە؟ بە مانایەکی تر، دەبێت یەکەم کەس کێ بێ، لە هەولێر ئەو خزمەتە گەورەی کردووەو دەرسی داوەتەوە ؟ لەوانەشە (محمد بن علي بن جامع) و چەندین مامۆستای تر هەبوونە وانەی زانستە شەرعیەکانیان لە هەندێك شوێنی هەولێر داوەتەوە، بەڵام پێدەچێ شێخ (الخضر) یەکەم کەس بێت، وانەی بە شێوەیەکی فەرمی لە هەولێر دابێتەوە، چونکە لەگەڵ هاتنی ئەو، بینای قوتابخانەیان بۆ دروست کردووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەر لەو زانایە، دیارە لە هەولێر هیچ قوتابخانەیەك نەبووە، بە نەبوونی قوتابخانەش واتا نەبوونی مامۆستاو زانای پێشکەوتوو وانەبێژی ڕەسمی لەم شارە، ماوەیەك لەم قوتابخانەیە خەریکی وانەوتنەوەو ڕاهێنانی قوتابیان بوون، تاوەکو لە سالی (٥٦٧ك/١١٧١ز) کۆچی دوای دەکات و هەر لە قوتابخانەکەی دەنێژرێ [1].

(ابن خلكان) دەڵێت: زۆرجار چوومەتە سەردانی گۆڕەکەی [2]. ئەوەی جێی ئامازەیە (ابن خلكان) لە هەندێك لەو کەسایەتیانەی کە لە کتێبەکەی ئامازەی پێکردوون. سەردانی گۆڕەکەی کردووە، ئەمەش سەرسامی (ابن خلكان) بۆ ئەم کەسایەتیانە بە دەردەخات. وەك ڕێزو وەفادارییەك بۆ پێگەی ئەو زاناو کەسایەتیانە چۆتە سەردانی گۆڕەکەیان.

---

(١) ابن خلكان،وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٨.هەروەها(الصفدي) ئامازەی بەهەمان زانیاری کردووە، بەبێ ئەوەی ئامازە بە ناوی (ابن خلكان) بکات.الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٢٠٩.

(٢) وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٨.(ابن كثير) یش دەڵێت (ابن خلكان) لە (وفيات) ەکەی ئامازەی بەوە کردووە کەوا چەندین جار سەردانی گۆڕەکەی کردووە.البداية والنهاية، ج١٢، ص٢٥٣.

**٤) السديد السلماسي :**

**( السديد محمد بن هبه الله بـن عبـد الله السلماسـي)[١]، شەرعناسـی شـافیعی بـووە. پێشەوای سەردەمەکەی خۆی بـوو[٢]. (ابـن خلكـان) ئامـاژەی بـە سـاڵی لـە دایکبـوونی نەکردووە [٣]، خەریکی وانە وتنەوە بووە، لە قوتابخانەی (نظامية) لە شاری بەغداد[٤].**

**(ابن خلكان) سەبارەت بە زانا (سلماسی) دەڵێت: شارەزا بووە لە چـەندین هونـەر. فەتواکانی زۆر ڕاست و جوان دەیپێکـا، بـە هـۆی ئـەم زانایـەوە ڕێبـازی شـریفی(طريقـة الشريف)[٥]لە عیراق گەشایەوەو پەرەی سەن تەنانەت ئەوەندە شارەزاو زیـرەك بـووە، باسـی (طريقـة الشـريف)و (الوسـيط)ی غـەزالی و ( المستصـفی)دەکـرد، بـەبێ ئـەوەی**

---

(١) السلماسي: دەگەڕێتەوە بۆ نـاوی (سـلماس) شـارێکە لـە ولاتـی (أذربيجـان) کەچـەندین زانـاو ناوداری لێ دەرچووە.ابن خلكان، وفيـات الاعيـان، ج٤، ص٢٣٧؛ اليـافعي، مـرآة الجنـان وعـبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٣.

(٢) وفيات الاعيان، ج٤، ص٢٣٧؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٤٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٥، ص١٠٤؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٣؛ ابن كـثير، طبقـات الشـافعيين، ص٧٠٥.

(٣) لەسەرچاوەکانی تریش ئاماژە بە ساڵی لەدایك بوونی نەکراوە.

(٤) ابـن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٤، ص٢٣٧؛ اليـافعي، مـرآة الجنـان وعـبرة اليقظـان، ج٣، ص٣٠٣.لەسەرچـاوەی تـر دەڵـێن (سلماسـی) موعيـد(معيـد) بـووە لـە قوتابخانـەی (النظاميـة).الـذهبي، العـبر في خـبر مـن غـبر، ج٣، ص٢٣٦؛ الصـفدي، الـوافي بالوفيـات، ج٥، ص١٠٤؛الداوودي،طبقات المفسرين، ج٢، ص٣٤٣.

(٥) طريقة الشريف: تەریقەی شەریفی دەگەڕێتەوە بۆ (شرف بن شاه بن ملكداد المراغـي)،نازنـاوی (شريف العباسی) بووە، سەرەتا لـە قوتابخانـەی (النظاميـة) پێگەیشـتووە، شەرعناسێکی زۆر ناوداربووە تـاوەکو بۆتـە خـاوەن ڕێبـازێکی فیقهـی بـەناوبانگ، شـارەزاییەکی زۆری هـەبوو لـە (خلاف) و (جدل)،لەساڵی(٥٤٣ك/١١٤٨ز) لە نیسابورکۆچـی دوای کـردووە. ابـن قاضـی شـهبة، طبقات الشافعية، ج١، ص ص٢١٦_٢١٧.

بگەڕێتەوە بۆ ئەم کتێبانە، خەڵکێکی زۆر لەولآتان و ناوچەکانی تر، هاتۆنەتە خزمەتی و سودیان لێ بینیوە. چەندین زاناو مامۆستاو نووسەر لە ژێر دەستی ئەم زانایە دەرچوونەو پێگەیشتون. لەوانەش هەر یەکە لە شێخ (عماد الدين محمد بن يونس)[1] و شێخ (كمال الدين موسى بن يونس )و چەندین ناوداری تر، ئەم زانایە تادوا ساتەکانی ژیانی لە بەغدا مایەوە، تاوەکو لە ساڵی(٥٧٤ك/١١٧٨ز) لەم شارە کۆچی دوای کرد[2]،

ئەم زانیاریانەی (ابن خلكان) لە بارەی (سلماسي)یەوە ئامـاژەی بۆ کـردون دەگمەنن، چونکە لە زۆرێك لە سەرچاوەکانی پێش خۆی گەراین، هیچمان دەست نەکەوت، تەنانەت سەرچاوەکانی دوای (ابن خلكان) هەمان زانیارییەکانی (ابن خلكان)یان پشت ڕاست و دووبارە کردۆتەوە، بەوەی لە نووسەریان وەرگرتۆتەوە[3]. ئەمەمش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە (ابن خلكان) سەردەمەکەی نزیك بووە، لەسەردەمی سەلماسی، پێدەچێ زانیاری ناوازەی لە بارەیەوە دەست کەوتبێت.

(1) عماد الدين محمد بن يونس بن محمد بن منعة بن مالك، شەرعناسی شافیعی و ئیمامی سەردەمەکەی بووە لە مەزهەب وئوسول وخیلاف دا خاوەنی چەندین بەرهەم بووە، بۆ ماوەیەکیش دادوەری موسڵی وەرگرتووە، لەچەندین قوتابخانەی موسل وانەی داوەتەوە، لەساڵی(٦٠٩ك/١٢١٢ز) کۆچی دوای کردووە.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٢٥٣؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٢٠٠.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٢٣٧؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٤٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٥، ص١٠٤؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٢؛ ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص١٩.

(3) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٤٥؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٠٥؛ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص١٨.

### ٥) الفقيه عيسى الهكاري :

يەكێك بووە لە فەقیهی و شەرعناسەکان[١]. هەرچەندە (ابن خلكان) بە تەواوی ئاماژەی بە ڕۆڵی (عیسی الهکاری) لە زانستی شەرعناسیدا نەکردووە، تەنها ئەوە نەبێت سەرەتا لە جەزیرە لای ئیمام (ابي القاسم عمر بن محمد بن البزري الجزری، م:٥٦٠ك/١١٦٤ز) کە شەرعناسێکی شافعی بە ناوبانگبووە، خوێندویەتی[٢]، پاشان خەریکی وتنەوەی وانەی شەرعناسی بووە، لە قوتابخانەیەك لە حلب[٣]. شەرعناس (عیسی الهکاری) لای چەندین زانای شام ومیسر زانستە شەرعیەکانی خوێندووە، تاوەکو شارەزای زۆری پەیداکردووە، بەوە ناسراوە کە ئیجتیهادی لەو بابەتانەدا کردووە کە موسڵمانان لەوکاتدا پێویستیان پێبووە[٤].

ئاماژە بەوە دەکرێ (عیسی الهکاری) زۆر دەمارگیری بۆ مەزهەبی شافعی هەبووە، بەڕادەیەك لە (حلب) وتارەکانی لە حەنەفیەوە بۆ شافعی گۆڕیووە، تەنانەت وتاربێژە حەنەفیەکانی لاداوەو شافعیەکانی لە جێیان داناوە[٥]. لێرەدا پێویستە بپرسین بۆچی (ابن خلكان) ئاماژەی بەو دەمارگیریەی (عیسی الهکاری)نەکردووە ؟ ئایا لەبەرئەوە نەبووە خودی (ابن خلكان)یش سۆزێکی زۆری بۆ مەزهەبی شافیعی هەبووە، بەڕادەیەك چاوپۆشی لەم زانیاریە کردووە. سەبارەت بە (ابو حفص عمر بن محمد بن عیسی بن محمد بن عیسی بن احمد الكردي)براشی، زانستە شەرعیەکانی لای چەندین زانای

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٧؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٢١.

(٢) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٤٥.

(٣) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٧.

(٤) المنذري، التكملة لوفيات النقلة، مج١، ص١٢٣؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص ص٧٢١_٧٢٢.

(٥) ابن العديم، بغية الطلب في تاريخ حلب، ص٣٩٦.

میسری خوێندووەو بۆتـە شـەرعناس لەسـەر مەزهـەبی شـافعی و مۆڵـەتی بـە چـەندین خەڵك داوە، یەکێك لەوانە (المنذري) خاوەنی کتێبی (التکملة لوفیات النقلة) بووە[1].

**٦) ضیاء الدین الماراني:[2]**

(ضـیاء الـدین) لـە منداڵیـەوە لـە هـەولێر لای شـێخ (أبـي العبـاس الخضـر بـن عقیل)خوێندویەتی، پاشان بۆ زیاتر دەوڵەمەندکردنی زانست و ڕۆشنبیری خـۆی کۆچـی کـردووە بـۆ (دیمەشـق) لـەوێ لای شـێخ (أبـی سـعد عبـد الله بـن أبـی عصـرون، م:٥٨٥ك/١١٩٠ز) زانستە شەرعیەکانی خوێندووە[3] .

شارەزاییەکی زۆر لـە مەزهـەب و بنچینەی فقهـی پەیدا دەکات، بەڕادەیـەك (ابن خلکان) دەڵێت: ئەوەندە بە جوانی شەرحی مەزهەبی کردووە، لـە بیسـت (٢٠) بەرگـدا، کە هـیچ کەسێك پێشتر وەکو ئـەو بـەم شێوەیە شـەرحی نـەکردووە، بـەڵام تـەواوی نەکردووە، ناوی لێناوە (الاستقصـاء لمـذاهب الفقهـاء )، هـەروەها شـەرحی (اللمـع ) لـە بنچـینەی فقهـی (أصـول الفقـە)ی شـێخ (أبـي إسـحاق الشـیرازي ) لـە دوو بەرگـدا کردووەو چەندین بەرهەمی تریشی هەبووە[4].

---

([1]) المنذري، التکملة لوفیات النقلة، مج ٣، ص٥١٨؛الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٤، ص٢٢١.

(٧) بۆ زیاتر زانیاری لەبارەی بڕوانە بەشی دووەم لاپەڕی (٩٤).

([3]) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٢٤٢؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٩، ص٣٣١؛السیوطي، حسن المحاضرة في تاریخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٠٨.

([4]) وفیات الاعیان، ج٣، ص٢٤٢.

ئـــەم زانیاریـــە لـــە دوای خۆشـــی لـــە هەنـــدێك لەسەرچـــاوە پشـــت ڕاســـت کراوەتەوە[1].شارەزاییەکی کەم وێنەی هەبووە، لە مەزهەبی شافعیدا، هەر بۆیە (ابن خلکان) لەم بارەیەوە دەلێت: ((زیرەکترین شەرعناسی مەزهەبی شافعی بووە، لەسەردەمی خۆیدا) ).[2] هەروەها هەندێك سەرچاوەی دوای (ابن خلكان)یش هەمان ئەو ستایشەیان دووبارە کردۆتەوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکەن، لە(ابن خلكان)یان وەرگرتووە[3].

---

(1) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٣١ ؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٣؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٣٠.

(2) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢.

(3) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٣١؛ اليافعي،مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٣؛ ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج٢، ص ٦٠؛السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٠٨.

### ٧) تقی الدین ابن الصلاح :

(أبو عمرو عثمان بن عبد الرحمن بن عثمان بن موسی بن أبي نصر النصري الكردي الشهرزوري) بە (ابن الصلاح) ناسراوە، (تقی الدین) نازناوی بوو. فەقیهی شافیعی بوو[1].لە ساڵی(٥٧٧ك/١١٨١ن) لە گوندی (شرخان)[2] لە دایکبووە[3] .

هیچ سەرچاوەیەك پێش (ابن خلكان)باسی (شرخان)ی نەکردووە، تەنانەت زۆربەی سەرچاوەکانی دوای خۆشی، ئاماژەیان بە شوێنی لە دایکبوونی کە گوندی(شرخان)ە نەکردووە، تەنها دەڵێن لە شارەزور لە ساڵی(٥٧٧ك/١١٨١ن) لە دایکبووە[4].

سەرەتای خوێندنی لای باوکی بووە، کە یەکێك بوو، لە شێخەکانی کورد، زانستی شەرعناسی (الفقە)ی لەسەر دەستی خوێندووەو باوکی چووەتە موسل و (تقی الدین)ی

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٣؛الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٣٦٠؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦؛العراقي، شرح التبصرة والتذكرة،تحقيق: عبداللطيف الهميم وماهر ياسين الفحل، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٢)،ج١، ص١١؛ عبدالحميد جعفر الفتاني، الامام الحافظ ابو عمروابن الصلاح وكتابه علوم الحديث الشهير بالمقدمة، رسالة الماجستير غير المنشورة مقدمة الى مجلس كلية الدعوة واصول الدين، جامعة ام القرى، (مكة المكرمة: ١٤٠٩)،ص٣٩.

(2) شرخان: گوندێکە سەر بەهەولێرە، لە نزیك شارەزوور.ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٥.ئیستا ناوی ئەم گوندە گۆراوە بۆ شیلەخان.عبد الكريم مدرس علماؤنا في خدمة الدين، ص٣٧٣.هەرخۆشمان مەیدانیەن سەردانیمان کر

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤؛ العراقي، شرح التبصرةوالتذكر، ج١، ص١١؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢٠٧؛ احمد محمود خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٥٢.

(4) بڕوانە: الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٣٦٠؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦؛البقاعي، النكت الوفية بما في شرح الألفية، تحقيق: ماهر ياسن الفحل، مكتبة الراشد ناشرون، ٢٠٠٧، ج١، ص٧١.

لەگەڵ خۆی بردوەو لەوێ کتێبی(المهذب)ی پێ گووتوە[١]. ئەم زانیاریە تەنها (ابن خلكان) ئاماژەی پێکردووە. لە دوای خۆشی پشت ڕاستی ئەم زانیاریە کراوەتەوە[٢].

(ابن خلكان) دەڵێت: (( (تقى الدين) یەکێك لە مامۆستاکانم بوو، کە زۆر سودمەند بووم لێی، پێی ڕاگەیاندم هێشتا ڕیشم بەدەرنەکەوتبوو، گشت کتێبی(المهذب)م تەواو کرد)) [٣] . ئەم زانیاریە لەلایەن سەرچاوەی تریش دووپات کراوەتەوە، بەوەی (ابن خلكان) ئاماژەی پێکردووە[٤] . دووبارە ئەم کتێبەی لای شێخ (عماد الدين ابى حامد ابن يونس) لە موسل خوێندووە، هەر بۆ خوێندن و زیاتر شارەزایی لە زانستەکانی ئیسلامی، گەشتی زانستی بۆ خوراسان دەکات. لەوێشەوە دەگەڕێتەوە بۆ شام و لە شاری( قودس) خەریکی وانە وتنەوە دەبێت، لە قوتابخانەی (الناصرية) ماوەیەك دەمێنێتەوەو خەلکێکی زۆر لێی سودمەند دەبن، پاشان لە (قودس) گەشت دەکات بۆ (دیمەشق) لەم شارە لە سێ شوێن لە یەك کاتدا خەریکی وانەوتنەوە دەبێت[٥] .

شێخ (تقى الدين) پێگەیەکی گەورەی لەلای (ابن خلكان) هەبووە، هەر بۆیە ستایشی (تقى الدين)ی مامۆستای دەکات و دەڵێت:(( یەکێك بوو، لە زانا لێوەشاوەکانی سەردەمی خۆی، لە تەفسیر و فەرموودەو شەرع و پیاو ناسیدا، ئەوەی پەیوەندی بە زانستی

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٣.

([٢]) بڕوانە: الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦؛ العراقي، شرح التبصرة والتذكرة، ج١، ص١١؛عبدالحميد جعفر الفتاني، الامام الحافظ ابو عمروابن الصلاح وكتابه علوم الحديث الشهير بالمقدمة، ص٤٦.

([٣]) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٣.

([٤]) الذهبي، تذكرة الحفاظ، ج٤، ص١٤٩؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦؛النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص١٦.

([٥]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٣_٢٤٤؛ ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص١٧١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، صص٢٦_٢٧.

فەرمووده هەبێت، بەشداری لە زۆر هونەردا هەبوو، لە فەتواکانیشدا بە باشی دەی پێکا))[1] .ئەو وەسف وستایشەی (ابن خلكان) لەمەڕ ئەم زانایە لەلایەن (الذهبي)یش ئاماژەی پێکراوە، بەوەی (ابن خلكان) وتوویەتی[2] . (تقی الدين) کتێب و نووسراوی بایەخداری زۆر داناوە، زیاتر لە بیست (٢٠) کتێب دەبێت[3].بە تایبەتی لە بواری فەرموودەو فیقهدا، بۆ نموونە کتێبی (مشكل الوسيط)ی لە بواری فیقهدا نووسیوە. هەروەها هەندێك لە هاوڕێکانی فتواکانیان لە بەرگێکدا کۆکردۆتەوە[4].

بەم شێوەیە شێخ (تقی الدین) بەردەوام بووە، لەسەر وانەوتنەوەو سودپێگەیاندنی خەڵك تاوەکو لە ساڵی(٦٤٣ك/١٢٤٥ن)لە (دیمەشق) کۆچی دوای دەکات و هەر لەوێش تەرمەکەی دەنێژرێ[5].

(ابن خلكان) هەر لە سەر گوزشتەی (تقی الدين)ی بە کورتی ئاماژەی بە ژیانی(عبد الرحمن )ی باوکی کردووەو دەڵێت: لە ساڵی(٥٣٩ك/١١٤٤ن) لە دایکبووە، لە شاری (حلب) خەریکی وانەوتنەوە بووە، تاوەکو لەساڵی(٦١٨ك/١٢٢١ن) کۆچی دوای کردووە[6].

---

(1) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٣؛ احمد محمود خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٥٢.

(2) الذهبي، تذكرة الحفاظ، ج٤، ص١٤٩.

(3) ابن الصلاح، معرفة انواع علوم الحديث، تحقيق: عبدالطيف الهميم وماهر ياسين، مقدمة، دار الكتب العلمية(بيروت: ٢٠٠٢)،ص٢٦.

(4) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان،ج٤، ص٨٥؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢٠٨؛مجموعة المؤلفين، الموسوعة الفقهية الكويتية، وزارة الأوقاف والشئون الإسلامية، دار السلاسل، (الكويت: ١٤٠٤) ج١، ص٣٣٠.سەبارەت بە فەتواکانی(ابن الصلاح) ی لە چوارچێوەی کتێبێك کۆکراوەتەوە کە بەو ناونیشانەیە .ابن الصلاح، فتاوى ابن الصلاح، تحقيق: موفق عبدالله، عالم الكتب، (بيروت: ١٤٠٧)،ص٩٥.

(5) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص٢٦، ٢٧؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص١٩٦.

(6) وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٤_٢٤٥؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٥٤٤؛السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٨، ص١٧٥؛عبدالحميد جعفر الفتاني، الامام الحافظ ابو عمروابن الصلاح وكتابه علوم الحديث الشهير بالمقدمة، ص ص٤٤_٤٥.

**گرنگترین تایبەتمەندییەکانی ئەم باسەی (ابن خلكان) لەبارەی (ابن صلاح) لەم خاڵانەی خوارەوە ئەیانخەینە ڕوو ئەمانەن:**

١) نووسەر ئاماژەی بە ناوی ئەو گوندە کردووە، کە (ابن صلاح) تیایدا لە دایکبووە، ئەویش گوندی شرخانە.

٢) نووسەر هەندێك باسی تایبەتی (ابن صلاح)ی باس کردووە، لە زاری (ابن صلاح)ەوە بیستوویەتی هەروەك (ابن خلكان) دەڵێت: ( پێی ڕاگەیاندم هێشتا ڕیشم بە دەرنەکەوتبوو، هەموو کتێبی (المهذب)م تەواو کرد).

٣) باوکی (ابن صلاح) یەکێك بوو، لە شێخەکانی کور ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە، لە پێگەیشتنی کوڕەکەی.

٤) (ابن صلاح) وانەبێژێکی ناوداری ئەوکات بوو، بەڕادەیەك لە (دیمەشق) لە سێ شوێن لە یەك کاتدا خەریکی وانەوتنەوە بووە.

٥) شێخ (تقی الدین) پێگەیەکی گەورەی لەلای (ابن خلكان) هەبووە، هەر بۆیە ستایشی (تقی الدین)ی مامۆستای دەکات و دەڵێت: ( یەکێك بوو، لە زانا لێوەشاوەکانی سەردەمی خۆی لە تەفسیر و فەرموودەو شەرعو پیاوناسیدا، و ئەوەی پەیوەندی بەزانستی فەرموودە هەبێت، بەشداری لە زۆر هونەردا هەبوو، لە فەتواکانیشدا بە باشی دەی پێکا).

٦) (ابن خلكان) زیاتر ڕۆڵی (ابن صلاح)ی لە بواری شەرعناسی و فەرموودەناسی بەدەرخستووە.

**٨) أبو عمرو ابن الحاجب :**

(أبو عمرو عثمان بن عمر بن أبي بكر ابن یونس الدوني المصري)، شەرعناسی مالیکی ناسراو بە (ابن الحاجب) نازناوی(جمال الدین)بوو، لە کۆتاییەکانی ساڵی

(٥٧٠ك/١١٧٤ن) لـە (أسـنا) كـە شارۆچـكەيەكە لـە (صـعيد)ی سـەروو، لـە ميسـر لـە دايكبووە، باوكی كورد بووەو پەردەداری مير (عز الدين موسك الصلاحی)بووە[1]،

لە زۆربەی سەرچاوەكان بە (الكردي) ناوی هـاتووە[2] . تەنانـەت (زركلـی) دەڵێـت: (ابن الحاجب) كوردی ڕەسەن بووە[3].

(ابن الحاجب)، دوای ئەوەی لە منداڵيەوە لە ( قاهيرە) خەريكی قورئانی پـيرۆز بـوو، دەستی كردووە، بە خوێندنی فيقهی ڕێبازی ئيمام ماليك و چەندين زانستی تر، خاوەنی چەندين كتێب و نووسينە، لە بواری زانستە شـەرعيەكاندا، لـە بـواری زانسـتی فقهيـدا شوێن دەستی ديارەو چەند كتێبێكی نووسيووە، لەوانـە (مختصـر الفقـە)ە[4] كـەناوی

---

([1]) ابـن خلكـان، وفيـات الاعيـان، ج٣، ص ص٢٤٨، ٢٥٠؛الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٤، ص٥٥١؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢٢؛ السيوطي، حسـن المحاضـرة في تـاريخ مصـر والقاهرة، ج١، ص٤٥٦؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، ج٧، ص٤٠٥.

([2]) الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٤٣٠؛الصفدي،الوافي بالوفيـات، ج١٩، ص٣٢٢؛السـيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٥٦؛ ابـن العمـاد الحنبلـي، شـذرات الـذهب في أخبار من ذهب، ج٧، ص٤٠٥.

([3]) الاعلام، ج٤، ص٢١١.

([4]) ابن خلكان، وفيـات الاعيـان، ج٣، ص ص٢٤٨_٢٤٩؛ الـذهبي، تـاريخ الاسـلام، ج١٤، ص٥٥١؛ الصفدي،الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢٢؛ ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار مـن ذهـب، ج٧، ص٤٠٦؛ السـيوطي، حسـن المحاضـرة في تـاريخ مصـر والقـاهرة، ج١، ص٤٥٦؛بابـە شـێخ مەردۆخی، مێژووی ناودارانی كورد، ب١، ل٨٩.

ناوه (جامع الأمهات) له فیقهی مەزهەبی مالیكیدا[١] .هەروەها (ابن خلكان) دەڵێت: خاوەن كتێبێیكی تره له (في أصول الفقه) دا[٢]،

كه له سەرچاوەی تر به (منتهى السول في علم الأصول) ناوی هاتووه[٣] . تەنانەت (ابن خلكان) ئەوەنده سەرسام بووه به زیرەكییەكەی، كه له بارەیەوه دەڵێت: ((باشترین زەین و ژیری هەبووه، له ناو دروستكراوەكانی خوادا))[٤] . هەندێك سەرچاوەی تریش ئاماژەیان بەم وتەی (ابن خلكان) له باری (ابن الحاجب) كردووه[٥].پاشان له (دیمەشق)ەوه گەڕاوەتەوه( قاهیره)و ماوەیەك لەوێ وانەی گوتووەوەو دواتر چووه بۆ ئەسكەندەریەو تا دوا ساتی ژیانی لەو شارەدا ماوەتەوه. تاوەكو له ساڵی(٦٤٦ك/١٢٤٨ز)گیانی سپارد[٦].

---

(١) خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢١١.

(٢) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٥٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١.(ابن حاجب)خاوەنی چەندین بەرهەمی تره لەسەر زانستە شەرعیەكان بۆ زانیاری بروانه.(خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢١١).

(٣) السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٥٦؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٤، ص٢١١؛احمد خليل، تاريخ الكرد في العهود الاسلامية، ص٣٥٦.

(٤) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٥٠.

(٥) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، ج٧، ص٤٠٦.

(٦) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ٢٥٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ج٧، ص٤٠٧.

**چوارەم : زانستی زمانی عەرەبی ونەحوو سەرف :**

زانستی زمانەوانی زانستێكی ئاینیە، لە چوارچێوەی ئەم زانستە، واتاو تێگەیشتنی پەیڤەكانی قورئان و سوننەت دەزانرێت[١]. هەرچی زانستی رێزمانە (النحو) لەلایەن (القلقشندي)بەم شێوەیە پێناسەی بۆ كراوە دەڵێت:((رێزمان (النحو) یاسای زمانی عەرەبی یە و تەرازووی پێ كێشانیەتی))[٢] . هەروەها زانستی سەرف (الصرف) لە ڕووی زمانەوانی یەوە بەواتای (گۆرانكاری دێت) لە ڕووی زاراوەشەوە بەمانای گواستنەوەو گۆڕانكاری بنچینەیی تاكە وشەیەك بۆ چەندین نموونەی جیاوازو واتای دیاریكراو[٣]. بە واتایەكی تر زانستێكی بنچینەییە كە لەباری بنچینەی ئەو وشانەی كە شیكردنەوە (اعراب)و بنچینەیان نیە دەكۆڵێتەوەو دەناسرێت، زانستی سەرف(صرف) دایكی زانستەكانەو نەحوش(النحو) بە باوكی زانستەكان دادەنرێت[٤] . هەریەكە لە زانستەكانی (الصرف)و (النحو)و (اللغە) دەكەوێتە چوارچێوەی زانستی شەرع[٥]. جگە لەوەی زانستەكانی زمانی عەرەبیش دابەش دەبێت بەسەر هەر یەكە لە زانستەكانی (متن اللغە)و (فقە اللغە)و (علم النحو)و (علم الصرف)[٦]لە دیارترین ئەو زانا كوردانەی كە لەم بوارەدا بەهرەمەند بوون، ئەمانەن:

---

(١) السيوطي، المزهر في علوم اللغة وأنواعها، تحقيق: فؤاد علي منصور، دار الكتب العلمية، (بيروت: ١٩٩٨)،ج٢، ص٢٦٠.هەروەها بڕوانە.القنوجي، البلغة إلى أصول اللغة، تحقيق: سهاد حمدان أحمد، رسالة ماجستير من كلية التربية للبنات، جامعة تكريت، تكريت، ص١٤٢.

(٢) صبح الأعشى في صناعة الإنشا، ج١، ص٢٠٤.

(٣)أحمد بن محمدالحملاوي، شذا العرف في فن الصرف، شرحه واعتنى به: عبدالحميد هنداوي، دار الكتب العلمية، (بيروت: ٢٠٠٤)،ص ص١٢_١٣.

(٤) التهانوي، موسوعة كشاف اصطلاحات الفنون والعلوم، تحقيق: علي دحروج، مكتبة لبنان ناشرون، (بيروت: ١٩٩٦)،ج١، ص ص٢٠_٢٣.

(٥) القنوجي، أبجد العلوم، ص٤٢٣.

(٦) محمود فهمي حجازي، علم اللغة العربية، دار غريب للطباعة والنشر، قاهرة، ص٧٢.

### ١) مكي الماكسيني النحوي :

زانستی نەحوو یەکێك بوو، لەو زانستانەی گرنگی پێداوە. تەنانەت بە (مكي الماكسيني النحوي) ناسراو بووە[1] . (ابن خلكان) دەڵێت: (ابن المستوفي) لە (تاريخ اربل) ئاماژەی بە (مكي) کردووە، گوایە گەشتی زانستی بۆ بەغدا کردووە، لەم شارەش بە خزمەت چەندین شێخ و زانای نەحوو زمان گەیشتووە، تاوەکو لەم بوارە شارەزا بووە[2]. (ابن الاثير) دەڵێت: ئەوەندە شارەزابووە، لە نەحوو زمان و قیرائات هیچ کەسێك بەقەد ئەو لەسەردەمەکەی شارەزانەبووە[3].ئەوەی جێی باس کردنە دەبینین زۆرێك لە زانا کوردییەکان تەنها گرنگیان بە بوارێکی زانستە شەرعیەکان نەداوە، بەڵکو پەرۆشی فێربوون بوونە، لە گشت زانستەکاندا بەڕادەیەك توانیوویانە لەیەك کاتدا شارەزاو زانا بن، لە زۆرێك لە زانستەکانی ئەوکات، تەنانەت بوونەتە مامۆستای یەکەم لە هەندێك بواری زانستدا .

### ٢) أبو عمرو ابن الحاجب :

(ابن الحاجب النحوي)، زانا بووە لە زۆربەی زانستە شەرعیەکاندا، بەتایبەت زانستی عەرەبی و سەرف و نەحودا، زۆر گرنگی بەم زانستی عەرەبی سەرف و نەحو داوە، لە هەندێك کێشەی نەحویدا بۆ خۆی خاوەن بیرورایەو ئیجتیهادی کردووە[4]،

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٧؛ الصفدي، نكث الهميان في نكت العميان، ص٢٨١.

(٢) وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨. گرنگترین ئەو زانایانەی کە (مكي) لەلایانی خوێندووە ئەوانیش(أبي محمد ابن الخشاب النحوي وعلى أبي الحسن ابن العطار وأبي البركات عبد الرحمن بن الأنباري) وهتدبووە.ياقوت الحموي، معجم الادباء، ج٦، ص٢٧١٥؛ ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨.

(٣) الكامل في التاريخ، ج١٠، ص٢٥١.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٩_٢٥٠؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ج٧، ص٤٠٦.

(ابن خلكان) دەڵێت: (( (ابن الحاجب) بۆ شایەتی دان چەند جار لە (قاهیرە) هات بۆ لام، چەندین پرسیارم دەربارەی بابەتی عەرەبی لێکردووە، وەلامی هەرە باشم بیستەوە بەشێوەیەك کە هەموو پرسیارێکی بە بەڵگە وەلام دەدایەوە))[١] . تەنانەت لە زانستی نەحوو سەرفیشدا خاوەن بەرهەم وکتێب بووە، لەم بوارەشدا نووسینی هەیە، هەرچەندە (ابن خلكان) تەنها ئاماژەی بەوە کردووەو دەڵێت: بۆ هەریەکە لە نەحوو سەرف دا پێشەکی و پوختەیەکی نوسیوە، بەبێ ئەوەی ناوی کتێبەکان بهێنێت[٢]،

بەلام (ابن العماد الحنبلي) کاتێك باسی (ابن الحاجب)ی کردووە، دەڵێت: (ابن خلكان) بەم شێوەیە باسی (ابن الحاجب)ی کردووە، بەوەی هەریەکە لە نەحوو سەرف دا پێشەکی و پوختەیەکی نوسیوەو ناویشی ناوە (الكافية) لە نەحوودا و(الشافية) لە سەرف دا، هەموو زانیاریەکانی (ابن خلكان)ی لە بارەی (ابن الحاجب)وەکو خۆی ئاماژە پێکردووە. لێرەدا لەوانەیە (ابن خلكان) ئاماژەی بە ناوی هەردوو کتێبی (الكافية)و (الشافية) کردووە. لەوانەیە لەلایەن نووسەرانەوە کتێبەکەی ڕەشکرابێتەوە، لێکۆلەر (محقيق)ی کتێبی(وفيات الاعيان) نەیبینیوە، بۆیە وتوویەتی بۆ هەریەکە لە نەحوو سەرف دا پێشەکی و پوختەیەکی نوسیوە، بەبێ ئەوەی ناویان بهێنێت[٣].

هەروەها لەسەرچاوەی تردا ئاماژەی پێ کراوە.ئەوانیش (الكافيه) لە نەحوودا و(الشافيه) لە سەرف دا[٤].

---

([١])وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٥٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩"ص٣٢٥؛ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٧، ص٤٠٧.

([٢]) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٩.

([٣]) شذرات الذهب، ج٧، ص٤٠٦.

([٤])السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ص٤٥٦؛حاجي خليفة، كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، ج٢، ص ص١٠٢١، ١٣٧٠؛.تەنانەت(الأستراباذي) لە سەر کتێبی(الشافية) ی(ابن حاجب) ی کتێبێکی نووسیوەوشیکردنەوەی بۆ کردووە. شرح شافية ابن الحاجب، تحقيق: عبد المقصود محمد، مكتبة الثقافة الدينية، ٢٠٠٤م، ج١، ص٥٤.

ئەوەندە بليمەت و زانابووە، بۆيە هەندێك لە مێژوو نووسان بە يەكێك لە زيرەكەكانى جيهان هەژماريان كردووە[1].

**تەوەرەی دووەم : زانستی هزرییەکان (عەقلییەکان):**

ئەم زانستانە بەرهەمی توێژینەوەو لێکدانەوەی هزرن [2]، ئەو بوارانەی کەسایەتیە کوردیەکان تێیدا بەناوبانگ بوونە بریتین لە:

**یەکەم :شیعرو ئەدەب وپەخشان :**

ئەدەب بریتی یە لە هونەری هۆنینەوەو دارشتنی جوان و ئەو بەرهەمانەی ئەو هونەرەی تێیدا دەردەکەوێت، وێنەی کۆمەڵگایە و گوزارشتە لە عەقل و هەستی نووسەرەکە و بارودۆخی[3]. هەڵبەست گوتن (شیعر) بە یەکێك لە زانستە تایبەتیەکان هەژماردەکرێت، کە هەموو کەسێك ناتوانێت لەم زانستەدا بەهەرەمەند بێت، تەنیا ئەوانە نەبێت کە خولیایەکی تایبەتیان بۆی هەیە، هەڵبەست (شعر)خزمەتێکی زۆری شارستانیەتی ئیسلامیان کردووە و پێگەیەکی گرنگیشی لە نێو زانستە ئیسلامیەکاندا هەبووە[4]، هەندێك لە شاعیرەکان جگە لەوەی وەکو خولیایەك خەریکی نووسینی شیعر بوون، لە هەمان کاتدا کەسانێك هەبوون، بەهۆی هۆنینەوەی شیعر ستایش و پێهەڵدانیان بەسەر کاربەدەستان دەکرد، بەم هۆیەوە دەستکەوتی ماددی باشیان بۆ

---

(١) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢٢.

(٢) حاجي خليفة، كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، ج١، ص٤٠.

(٣) چرا محمود حسن، بزاڤ زانستی دینەوەر، ل١٠٦.

(٤) حمزە کاکە یاسین، کورد لە کتێبی (مسالك الابصار في ممالك الامصار)،تێزی دکتۆرای بلاونەکراوە پێشکەش بە ئەنجومەنی کۆلیژی ئەدەبیات کراوە، زانکۆی سەلاحەددین، (هەولێر: ٢٠١٤)،ل٢٠٦.

ڕەخساوە[1]. کۆمەڵێك لە زاناو هەندێك لە پاشایانی ئەیوبی لەم بوارەدا خزمەتیان کردووەو ناویان لە (وفیات الاعیان)هاتووە ئەوانیش:

### ١) تاج الملوك بوري :

(تاج الملوك الايوبی)شاعیر و ئەدیب بووە، خاوەنی دیوانێکی شیعری بووە، (ابن خلكان) ئامـاژەی بە چەند شیعری (تاج ملوك) کردووە، کە (عماد الدين الكاتب الأصبهاني) لە کتێبی (الخريدة) هێناویەتی:

يا حياتي حين يرضى ... ومماتي حين يسخط

آه من ورد على خد ... يك بالمسك منقط

بين أجفانك سلطا ... ن على ضعفي مسلط

قد تصبرت وإن بر ... ح بي الشوق وأفرط

فلعل الدهر يوماً ... بالتلاقي منك بغلط.[2]

(چ ژینێکم دەبێت ئەگەر ئەو لێم ڕازی بێت، وە ژیانم وەك مردنە ئەگەر لێم تورە بێت

ئای لەوگوڵەی لەسەردوو کوڵم...کە بەعەتری میسك خاڵخاڵکراوە

لەنێوانی دووپێزی برژانتدا پا...شایەك دەسەڵاتی بەسەرلاوازی مندا سەپاندووە

بەڕاستی ئارامم گرتووە هەرچەند دەمێکە خۆشەویستیم هەیە و زیادەڕەویم تێداکردووە

زەمانە ڕۆژێك هەردێنێتەپێش ... بەهەڵەش بێت کەتیایداپێت بگەم)

---

(1) وفيات الاعيان، ج٧، ص ص٢١١_٢١٢؛ احمد احمد بدوي، الحياة الادبية في عصر الحروب الصليبية بمصر والشام، ط٢، دار النهضة، (القاهرة: ٢٠٠٣)،ص٢٥.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ص ص٢٩٠_٢٩١؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٦٢٥؛ الصفدی، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص٢٠١.

دوای بەدواداچون بۆ ئەم شیعرەی (تاج الملوك)، لە كتێبەكەی (الأصبهاني) وەك خۆی بە هەمان شێوە هاتبوو ئامـاژەی پێكـراوە[1]، شیعرەكانی (تـاج الملـوك) لـە ئاستێكی باش بووە، هەروەكو (الأصبهاني) دەڵێت: ((خاوەنی هۆنینەوەی باش بـووە، هەر بۆ خۆشی بۆی نووسیمە))[2].

**٢) البحراني الشاعر:**

(أبو عبد الله محمد بن يوسف بن محمد بن قائد) نازنـاوی (موفق الدين) بـووە، هەولێری ڕەسەن بووە، باوكی (موفق الدين) بازرگانێكی ناسراوی هەولێر بوو، بۆ چەندین جار گەشتی بازرگانی لە نێوان هەولێر و بەحرێن ئەنجام داوە، وە لە كـاتی بازرگانی كردن لە ولاتی بەحرێن (موفق الدين)ی كوڕی لەوێ لە دایك دەبێت، بۆیەش بە (البحراني)ناسراوە، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ هەولێر، شاعیرێكی نـاودار بـووە، شارەزای تەواوی لە جۆرەكانی شیعر و عـروز و قافیە بـووە، هەر لە منداڵیەوە شیعری ڕێكخستووەو وتویەتی: خاوەنی دیوانی شیعری بووە (ابـن المستوفي) یـەكێك بـوو، لـەو كەسانە بۆ ماوەیەك لەلای (موفق الدين) خەریكی فێربوونی شیعر بـووە. (موفـق الـدين) بۆ ماوەیەكیش لە شارەزور ژیاوە، پاشان گەشت دەكات بۆ (دیمەشق) و لەوێشەوە بە قەسیدەیەكی درێژ ستایشی سوڵتان (صلاح الدين) دەكـات، پاشـان گەڕاوەتـەوە بۆ هەولێر، هەر لەم شارە لە ساڵی(٥٨٥ك/١١٨٩ز) كۆچی دوای كردووە، هەروەها بە شیعر ستایشی (زين الدين ابا المظفر يوسف بن زين الدين ) خاوەنی هەولێری كـردووەو دەڵێت:

---

[1] ) خريدة القصر وجريدة العصر،ق: شعراء بني ايوب، تحقيق: شكري فيصل، المطبعة الهاشمية، (دمشق: ١٩٦٨)، ص١٣٦.

[2] ) بۆ زیاتر زانیاری لەسەر شیعرەكانی بڕوانە،خريدة القصر وجريدة العصر، شعراء بني ايوب، ص ص١٣٥_١٣٩.

رب دار بالغضا طال بلاها ... عكف الركب عليها فبكاها

درست إلا بقايا أسطر ... سمح الدهر بها ثم محاها.[١]

(ئەی خوایە ماڵێك لە (الغضا) نەهامەتیەكانی درێژەی كێشاند...چۆك دانان وگریان باڵی بەسەر داكێشاوە.

لێكۆڵینەوەم كرد تەنها لە پاشكۆی دێرەكان نەبێت...ڕۆژگار ڕێپێداو ڕەشی كردەوە)

ئەوەی جێی ئاماژەیە ئەو زانیاریانەی (ابن خلكان)ی لە كتێبەكەی (ابن المستوفي) ئاماژەی پێ نەكراوە، تەنها ئەوە نەبێت (ابن المستوفي) لە سەر گوزشتەی كەسایەتیەك، ناوی (موفق الدين الاربلی) هێناوەو ئاماژەی بە دێرە شعرێكی كردووەو بەمامۆستای خۆی داناوە.[٢]

### ٣) مكي الماكسيني النحوي :

(أبو الحرم مكی بن ريان بن شبه بن صالح) نازناوی (صائن الدين)بوو[٣]، لە (ماكسين) لە دایكبووە، لە (موسل) ژیاوە، باوكی لە (ماكسين) خەریكی كاركردن بوو، پاشان باوكی دەمرێت، بەبێ ئەوەی هیچ شتێك لە دوای خۆی بەجێبێلێت.بەم شێوەیە (مكي) و دایكی و خوشكەكەی لە ژیانێكی هەژاری دەژیان بەڕادەیەك دایكی لەسەر ئەم

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص ص١٠_١١؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٨٠٨؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٥، ص١٦٤؛ اميد ابراهيم جوزەلی، الحياة العلمية في اربيل، ص١٥٥.

([٢]) تاريخ اربل، ج١، ص٦٦.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٧؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٦، ص٣٢؛ السيوطي، بغية الوعاة في طبقات اللغويين والنحاة، تحقيق: محمد ابراهيم، المكتبة العصرية، صيدا، ج٢، ص٢٩٩.

ژیانە گرانە تاسەر ئارام ناگرێت، بۆیە ناتوانێ بەجوانی مافی (مکي) بدات و بەجێدێلێت، بۆیە (مکي) شارەکەی خۆی جێهێشت و بەرەو (موصل) گەشت دەکات.[1] لەموسل خەریکی زانستی ئەدەب دەبێت وگرنگی پێدەدات، پاشان گەشت بۆ بەغداد دەکات و لەگەڵ ئەدیبەکان کۆدەبێتەوەوسودمەند دەبێت لێیان.دوای پێگەیشتنی لە بواری ئەدەبیدا دەگەڕێتەوە بۆ (موصل) لەم شارە خەڵکێکی زۆر ڕووی تێدەکەن و سودی لێدەبینن[2].

(ابن خلكان) دەڵێت: (ابن المستوفي) لە (تاريخ اربل) باسی (مكي)كردووەو بە کۆکەرەوەی هونەری ئەدەب ناوی هێناوە، مامۆستای (ابن المستوفي)بووە، شیعریشی بۆ وتووە.

سئمت من الحياة فلم أردها ... تسالمني وتشجيني بريقي

عدوي لا يقصر في أذائي ... ويفعل مثل ذلك بي صديقي

(لەژیان بێزار بووم و نەم ویست ئەویش ئاشتەوایی لەگەڵ کردم و بریسکەی منی خستەڕوو دوژمنەکەم کەمتەرخەمی نەکردووە لە ئازاردانم هاوڕێشم هەروەك ئەوی لەگەڵ کردووم)

هەروەها(ابن خلكان) لەسەر زاری (ابن المستوفي) دەڵێت ( مكي ) لە تەمەنی هەشت، نۆ ساڵی کوێر بووە، دەمارگیری و سۆزی بۆ (أبي العلاء المعري)بووە، کاتێك شیعرەکانی ئەویان بۆ خوێندووتەوە دڵخۆش بووە، هۆکارەکەشی ئەوە بووە، کە هەردووکیان نابیناو ئەدیب بوون، لە هەمانکاتدا، تەنانەت( مكي) لە پێرەوی (النظم)شیعرەکانیدا لەسەر ڕێگەی ئەو ڕۆیشتووە[3]. بە دواداچوونمان بۆ ئەم زانیاریانە کرد، کە نووسەر لە (ابن المستوفي)وەرگرتووە، ئەم زانیاریانە لە کتێبی (تاريخ

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٥، ص٢٧٨؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٦، ص ص٣٢_٣٣.

([3]) وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٢٧٨_٢٧٩؛ السيوطي، بغية الوعاة طبقات اللغويين والنحاة، ج٢، ص٢٩٩.

اربل)بوونی نەبوو، تەنها ئەوە نەبێت (ابن المستوفي) لەسەر گوزشتەی زانایەك دا، ئاماژەی بەناوی (مكي الماكسيني) کردووە بە مامۆستای خۆی ناوی هێناوە[1].تەنانەت لە بەشە دۆزراوەکەش گەڕاین لەم بارەیەوە هیچمان دەست نەکەوت، بەمەش بۆمان بەدەردەکەوێ هێشتا بەشێکی تر لە کتێبی (تاريخ اربل) لەناوچووەو فەوتاوە. (ابن خلكان) دەڵێت: (مكي) پەرۆش دەبێت بۆ شارەکەی، بۆیە دەگەڕێتەوە بۆ زێدی خۆی، خەڵکی شارەکەی خۆشحاڵ بوون، بە هاتنەوەی و سەردانیان کردووە. پاشان دەگەڕێتەوە بۆ موسل و لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا بەرەو شام هەنگاو دەنێت و زیارەتی (بيت المقدس)دەکات دواتر دەگەڕێتەوە بۆ موسل[2].

لە ساڵی (٦٠٣ك/١٢٠٦) لە (موسل) کۆچی دوای دەکات، دەگوترێت لەلایەن (نور الدين ارسلان شاه) خاوەنی موسلەوە ژەهراوی کراوە.[3]. نازانرێت (ابن خلكان) هەواڵی ئەم ژەهراوی کردنەی لە کوێ وەرگرتووە، دەکرێ تەنها بیستوویێتی هەرچەندە (مكي) کاتێك مردووە (ابن خلكان) هێشتا لە دایکنەبووە، بەڵام چەند ساڵێك دواتر (ابن خلكان) لە دایك دەبێت و پاشان گەشت دەکات بۆ موسل. دەکرێ لە خەڵکی موسلەوە هەواڵی ژەهراوی کردنەوەکەی بیستوویێت، چونکەلەسەرچاوەی تر ئاماژە بە ژەهراوی کردنی نەکراوە، تەنها دەڵێن لەساڵی(٦٠٣ك/١٢٠٦ز)مردووە[4].

---

(1) تاريخ اربل، ج١، ص٣٠٢.

(2) وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٢٧٩_٢٨٠.

(3) وفيات الاعيان، ج٥، ص ص٢٧٩_٢٨٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٧؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٦، ص٣٢.

(4) ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج١٠، ص٢٥٠؛ ابن الدبيثي، ذيل تاريخ مدينة السلام، ج٥، ص٥٧.

**٤) الملك الأفضل ابن صلاح الدين:**

(ابن خلكان) دەڵێت: مەليك (الافضل) خاوەن فەزل و ڕۆشنبیری و نووسین و شیعر بوو، زۆر زانایانی خۆشویستووەو ڕێزی لێ گرتوون، کاتێك (ملك العزيز) و (ملك عادل) هێرشیان کردە سەری و (دیمەشق)یان لێ وەرگرتەوە، ئەویش لە ڕێگەی شیعرەوە گلەیی و نارەزایی و خەمی خۆی بۆ خەلیفە( الناصر لدين الله :م٦٢٢ك/١٢٢٥) دەنێرێت، دەڵێت:

**مولاي إن أبا بكر وصاحبه ... عثمان قد غصبا بالسيف حق علي**

**وهو الذي كان قد ولاه والده ... عليهما فاستقام الأمر حين ولي**

**فخالفاه وحلا عقد بيعته ... والأمر بينهما والنص فيه جلي**

**فانظر إلى حظ هذا الاسم كيف لقي ... من الأواخر ما لقي من الأول.[1]**

(گەورەم، ئەبوبەکر و عوسمانی هاوەڵی بە ڕاستی مافی عەلی یان بەشمشێر زەوتکردووە ئەو ئەوکەسە بوو، کە باوکی لەجێی خۆیی دانابوو.
وەخستبوویە پێش ئەوان، وە کار جێبەجێ بوو، کاتێك فەرمانڕەوایی گرتەدەس، بەڵام ئەودوانە پێچەوانەی ئەویان کرد، وەئەوپەیمانەی-بەیعەتەی- دابویان هەڵیانوەشاندەوە
ئەو بابەتەی نێوانیان و ئەودەقەی هاتووە دەربارەیان ڕون و ئاشکرایە
بۆیە بنوارە ئەو بەشەی ئەم ناوەهەڵی دەگرێ، چۆن لە کۆتاییەکانی دەستکەوتووە وەك ئەوەی لەسەرەتاکانی دەستکەوتووە).

پێدەچێ (ابن خلكان) هەموو ئەم زانیاریانەی لەمەڕ مەلیك (الافضل) لە کتێبەکەی (سبط ابن الجوزي) وەرگرتووە، چونکە هەمان زانیاری دووبارە کراوەتەوە.[1] لەم

---

(١) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٢٠؛ ابن العبري، تاريخ مختصر الدول، ص٢٣٧؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٣٥؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٤٢.

شیعرەش ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کەوا مەلیك (الافضل) بڕوای وایە هەریەکە لە خەلیفە (ابو بکر)و (عوسمان) (خوایان لێ ڕازی بێت) مافی خەلیفە (عەلی)یان لە پۆستی خیلافەت خواردووە، ئەمەش جێی تێبینیە، بۆچی وا بیری کردۆتەوە، لە کاتێکدا ئەو لە بنەماڵەی ئەیوبیەکانە، کە بنەماڵەیەکی سوننە مەزهەب بوونەو سۆزێکی زۆریشیان بۆ ئەم مەزهەبە هەبووە، لەلای سوننەکانیش ڕوونە کەوا هەریەکە لە (ابوبکر)و (عوسمان) بە مافی خۆیان هەڵبژێردراون و بوونەتە خەلیفە، بەبێ ئەوەی هیچ نادادیە دەرهەق بە ئیمامی (علی)(خوای لێ رازیبێت) کرابێت.

### ٥) مەلیك المعظم ابن العادل :

مەلیك (المعظم شرف الدین عیسی) جگە لەوەی فەرمانڕەوای (دیمەشق) بووە، زانا و شاعیرانی زۆر خۆش ویستووە، حەزی لە هونەرو ئەدەب کردووە. شاعیران زۆر ستایشیان کردووەو شیعریان پیاهەڵداوە، بۆ خۆشی جارو بار شیعری گوتووە.(ابن خلکان) ئاماژەی بەوە کردووە، کەوا گوێی لە هەندێك لە شیعرەکانی مەلیك (المعظم)بووە[٢].

ئەم زانیارییە تەنها (ابن خلکان) باسی کردووەو تەنانەت لە دوای خۆشی پشت ڕاست کراوەتەوە، بەوەی لە (ابن خلکان)وەرگیراوە[٣] . خاوەن دیوانی شیعریش بووە[٤].(ابن خلکان) دەلێت پاڵپشتی زانایانی کردووە، تەنانەت (١٠٠) دیناری وەکو

---

(١) مراة الزمان في تاريخ الاعيان، ج٢٢، ص ص٢٧٦_٢٧٧.

(٢) وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٤٩٤_٤٩٥.

(٣) اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٤٦.

(٤) سبط ابن الجوزي، مراة الزمان في تاريخ الاعيان، ج٢٢، ص٢٨٥؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٧٧٧؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢٦٧؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج٥، ص١٠٨؛عمر بن رضا،معجم المؤلفين، ج٨، ص٢٢.

بەخشیش دەدا بەو کەسانەی کە کتێبی (المفصل)ی(زمخشري)یان لەبەرکردووە. بەم هۆیەوە کۆمەڵێك لەبەریان کردووە، (ابن خلکان) دەڵێت: خۆم هەندێك کەسم لە (دیمەشق) بینی ئەم کتێبەیان لەبەر کردبوو، هۆکارەکەشیان دەگەڕاندەوە بۆ هاوکاری مەلیك (المعظم)، هەروەها (ابن خلکان) دەڵێت: کۆمەڵێك لە کەسانی (شرف الدین ابن عنین)ی شاعیر، بۆیان گێڕاوەتەوە کاتێك (ابن عنین) نەخۆش دەکەوێت، مەلیك (المعظم) شیعری بەسەردا وتووەو دەڵێت:

انظر إلي بعين مولىً لم يزل ... يولي الندى وتلاف قبل تلافي

أنا كالذي أحتاج ما تحتاجه ... فاغنم ثوابي والثناء الوافي.[1]

(بەچاوی گەورەیەکەوە تەماشام بکە، کە بەردەوام پیاوەتیەیەك لە دواییەکی

ئەتکێنێتەوە، وەبم گەرێ—فریامکەوە – پێش ئەوەی بفەوتێم

من وەك ئەوەم کە پێویستی، بەپێویستی تۆ هەیە

بۆیە تۆش پاداشتی من و سوپاسی زۆرم دەسخۆت بخە)

ئەمەش گەواهی ئەوە ئەدا، کە ئەم پاشایە چەندە پەرۆش بووە، بۆ زانست و زانایان، ئەم زانیاریانە تەنها (ابن خلکان) ئامـاژەی پێکردووە، ڕاستەوخۆ هەر خۆی زانیاریەکانی لە خەڵك وەرگرتووە، زانیاری دەگمەن و پڕ بەهان، تەنانەت هەندێك لەسەرچاوەی دوای خۆشی پشت ڕاستی هەمان زانیاریان کردۆتەوە، بەوەی لە (ابن خلکان)یان وەرگرتووە[2].

(1) وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٤٩٥_٤٩٦.

(2) اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص ص٤٦_٤٤٧القرشي، الجواهر المضية في طبقات الحنفية،ج١، ص٤٠٣.

**٦) مەلیك الأمجد:**

ئەدیب و شاعیربووە[١]، كەسێكی شكۆدار بوو، خاوەن دیوانێكی شیعری بووە[٢]، شیعرەكانی بەناوبانگ بوونە[٣].نموونەیەك لە شیعرەكانی:

لَكُم في فؤادي شاهدٌ لَيسَ يَكْذِبُ ... وَمِنْ دَمْعِ عيني صامتٌ وَهُوَ مُعْرِبُ

وَلِيَ مِنْ شُهُود الوَجْدِ خدٌّ مُخَدَّد ... وقلبٌ على نَارِ الغَرَام يُقَلَّبُ.[٤]

(چەندەها شاهێد لە دڵم دایە كە درۆناكەن

وەچەندەها فرمێسكی چاوم كەبە بێ دەنگی باس لە حاڵی من دەكەن

وەشاهێدم هەیە لە جۆری ویژدان ئەویش كوڵمێكی خاڵخاڵە-كونجكونجە-

وە دڵێكم هەیە بەسەر ئاگری خۆشەویستییەوە ئەم دیو دیوی پێدەكرێت)

**٧) صلاح الدین الاربلي:**

شاعیرو ئەدیب بووە، شاعیرێكی دیاربووە، خاوەنی دیوانی شیعری و(دوبیات)[٥]ە،[٦] (ابن خلكان)دەڵێت: پێی ڕاگەیاندم، كە (الخلاصة)ی ئیمامی غەزالی

---

(١) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٥٣؛ الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص٢٢٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص١٩٠.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٥٣؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص٢٤٣؛ الكتبي، فوات الوفيات، ج١، ص٢٢٦. الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٠، ص١٩٠.

(٣) أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص١٤٧؛ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٨١١.

(٤) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٨٥٣.

(٥) الدوبیت: دەستەواژەیەكی كوردی و فارسی و عەرەبیلێكدراوە، واتە: دوو دێرە شیعر، وەهەروەهابەچوارینەپێناسەدەكرێت، چونكە لە چوار نیوە دێڕ پێكهاتووە، وەدەستەیەك لەمانە پێیدەوترێت چوارینە.قادر محمد حسن، اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية، ص٢٨٣.

(٦) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج١، ١٨٥؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص٤٠؛خير الدين الزركلي، الاعلام، ج١، ص١٥٠.

لەبەرکردووە، دوای زیندانی کردنی بۆ ماوەی (٥)ساڵ، لەلایەن مەلیك(الكامل)، پاشان دوبیاتی شیعری بۆ کەسێك دەنووسێت، ئەوکەسەش ئەو دوبەیتە شیعرەی بە گۆرانی بۆ مەلیك (الكامل)دەڵێت : مەلیك(الكامل)یش دەڵێت: ئەمە هی کێیە؟ ئەویش دەڵێت هی (صلاح الدين الاربلي)ە، یەکسەر ئازادی دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ هەمان دەسەلآت و پێگەی خۆی[١]. (الذهبي) لە بارەیەوە دەڵێت: زاناو شاعیرو ئەدیب و زمان پاراو بووە[٢]. ئەمەش دوبیاتەکەی کە بۆ مەلیك(الكامل)ی نووسی:

اصنع ما شئت أنت أنت المحبوب ... ما لي ذنب، بلى كما قلت ذنوب

هل تسمح بالوصال في ليلتنا ... تجلو صدأ القلب وتعفو وأتوب، [٣]

(هەرچیدەکەی بیکە تۆ هەر تۆی خۆشەویستی.هیچ تاوانێکم نیە بەڵکو وەك وتت–وتم– کۆمەڵە تاوانە

ئایا ڕێ بەپێك گەشتنێکمان–ژوان– دەدەی لەشەوەکەماندا؟..بۆی ژەنگی دڵ لێبێتەوە و ببوریت و بگەڕێمەوە–تەوبە بکەم)

## دووەم :زانستی مێژوو:

وشەی مێژوو لە ڕووی زمانەوانیەوە بەمانای (پێناسەی کات) دێت، زانستی مێژوو لە ڕووداوەکانی ڕابردوی گەلان، بەسەرهاتی پێغەمبەران و پاشایان و کاربەدەستان، شاعیرو زانا و ناودارن و ڕەچەڵەکیان و نەریت و حەز و گۆڕانکاریە سروشتیەکانی کۆمەڵگەکان دەکۆڵێتەوە. بە مەبەستی تێگەیشتنی ئەمڕۆو پەندو سود وەرگرتن بۆ ئاییندە[٤]. (ابن خلدون) لە پێشەکیەکەی دا بەم شێوە پێناسەی مێژوو دەکات و دەڵێت:

---

([١]) وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٥.هەروەها بڕوانە. الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص ص٤٠_٤١.

([٢]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٣٤.

([٣]) ابن خلكان،وفيات الاعيان، ج١، ص١٨٥.بۆزانیاری زیاتر لەسەر شیعرەکانی بڕوانە(الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٧، ص٤١).

([٤]) حاجي خليفة، كشف الظنون، ج١، ص٢٧١.

مێــژوو بــە واتــای:(( ســەرنج و لێووردبوونــەوە و ســاغکردنەوەیە لەســەر رووداوو بوونەوەرەکانی گەردوون))[1]. نووسینەوەی مێژوو بەچەند قۆناغ و گۆڕانکاری تێپەری، مێژوو نووسانی دوای سەردەمی (طبري) کەوتنە بارێکەوە، تەنها پشتیان بە گێڕانـەوەو هەواڵەکان نەدەبەست، بەڵکو هـەوڵیان دەدا بۆ سەرچـاوەی زانیارییـەکان بگەڕێنـەوە، لەگـەل ئـارەزووی بـە کارهێنـانی ئـاوەز لـە ڕەخنـەگرتن، لـە هـەواڵ و لێکدانەوەکانـدا. ئەوەی بووە مایەی پێشکەوتنی بیری مێژوو، لەلای موسوڵمانەکان، بە هـۆی ژمارەیـەك مێژوو نووسـی ئـەم قۆناغـەبوو، کـە کاربەدەسـتی دەوڵـەت بـوون، زانیارییـەکانیان لـە بەڵگەو دیکۆمێنتە فەرمیەکانەوە وەردەگرت، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ[2].

## ١) الملك المنصور :

مەلیك (ناصر الدین أبو المعالي محمد بن عمر بـن نـور الدولـة شاهنشـاه بـن أیـوب) فەرمانڕەوای (حمـاة)[3]، هەرچـەندە (ابـن خلکـان) زانیـاری تـەواوی لەسـەر ژیـانی ئـەم پاشایە ئاماژە پێنەکردووە، بەلاّم لەسەرچاوەی تردا گرنگی زۆر بەم کەسایەتیە دراوە، وتراوە زانابووە، لە زانستی مێژوو و ژینامەدا[4].

---

(1) تاریخ ابن خلدون، ج١، ص٦.

(2) هاشم یەحیا ئەلمەلاح، دەروازەیەك لە فەلسەفەی مێژوو، وە: دەوەن حەسەن، چ٢، چاپخانەی رۆژهەلات، (هەولێر: ٢٠١٣)،ل١١٩.

(3) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٥٧؛الـذهبي، تـاریخ الاسـلام، ج١٣، ص٥٢٨؛ سـیر اعـلام النبلاء، ج١٦، ص١٣٨؛ الکتبي، فـوات الوفیـات، ج٤، ص١٢؛ الصـفدي، الـوافي بالوفیـات، ج٤، ص١٨٣.

(4) الحموي، تلخیص الکشف والبیان في حوادث الزمان، تحقیـق: أبـو العبـد دودو، مطبعـة الحجـاز، دمشق، ص٩٠.

زانایانی زۆر خۆش ویستووەو زۆر لە زانایان و شەرعناس و نووسەرەکان لە دەوری کۆبوونەتەوە، کتێبخانەیەکی گەورەی هەبوو، خوێندنەوەی زۆر بووە، خاوەن کتێبێکی مێژووییە بەناوی (مضمار الحقائق في سر الخلائق)[1].

## سێیەم :دارشتن وخۆشنووسی (الانشاء والخطاط):

خۆشنووسی یەکێك بوو، لەو هونەرانەی لە شارستانیەتی ئیسلامیدا گرنگی پێدراوە .(ابن خلکان) لە بواری دارشتن و خۆشنووسی دا ئامارژەی بە یەك زانای ئافرەت وپاشایەك کردووە کەبەهرەمەند بوونە لەم دارشتن وخۆشنووسی دا:

### ١) شهدة بنت الإبري :

(شهدة بنت أبي نصر أحمد بن الفرج بن عمر الإبري) دەینەوەری رەسەن بووە، یەکێك بووە، لە زاناکان لە بەغدا ژیاوە[2]، نووسەرو خاوەن خەتێکی جوان بووە، بە

---

[1] ابن شاهنشاه ،مضمار الحقائق وسر الخلائق، تحقيق: حسن حبشي، عالم الكتب، القاهرة، ص١؛سبط ابن الجوزي، مراة الزمان في تاريخ الاعيان، ج٢٢، ص٢٥٥؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٥٢٨؛ الذهبي، سير اعلام النبلاء، ج١٦، ص١٣٨؛ الكتبي، فوات الوفيات، ج٤، ص١٢؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٤، ص١٨٣.

[2] ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٧٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٣٨؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٦، ص١١١؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان،ج٣، ص٣٠٣؛ ابن ناصرالدين، توضيح المشتبه في ضبط أسماء الرواة وأنسابهم وكناهم، تحقيق: محمد نعيم، مؤسسة الرسالة، (بيروت: ١٩٩٣)،ج١، ص١١٩، ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٦، ص٤١٠.

خەتێکی جوان ئەینووسی[1]، بەڕادەیەك (الصفدي) دەڵێت: هیچ کەسێك لەسەردەمی ئەو بەو خەتە جوانەی ئەو نەیدەنووسی[2].

٢) مەلیك الأفضل ابن صلاح الدین:

(أبو الحسن علیابن السلطان صلاح الدین یوسف بن أیوب)ە، نازناوی (الملك الأفضل نور الدین)بوو[3] لەلای چەندین زانای میسری و شامی خوێندووەو ئیجازەی وەرگرتووە، (ابن خلکان) دەڵێت: خاوەن خەتێکی جوان بووە، بەخەتێکی جوان دەینووسی[4].

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٤٧٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٣٨؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٦، ص١١١؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٢.

(٢) الوافي بالوفيات، ج١٦، ص١١١.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٩؛ أبو الفداء، المختصر في أخبار البشر، ج٣، ص٨٦؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٤٢؛ الفاسي، شفاء الغرام بأخبار البلد الحرام، دار الكتب العلمية(بيروت: ٢٠٠٠م)،ج١، ص٤٣٥؛بابە شێخی مەردۆخ ڕۆحانی، مێژووی ناودارانی کورد، ب٣، ل١٦٩.

(٤)وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٩؛بابە شێخی مەردۆخ، مێژووی ناودارانی کورد، ب٣، ل١٦٩.

## تەوەرەی سێیەم : ڕۆڵی کەسایەتییە کوردییەکان لە بواری بیناسازی و ئاوەدانکاری و پەروەردەیی دا:

### یەکەم : قوتابخانەکان(المدارس):

قوتابخانە (المدرسة)، بەمانای شوێنی خوێندنی وانەو قورئان و کتێب دێت[1]. قوتابخانەکان ڕۆڵێکی گرنگیان گێڕا لە بوژانەوەی ڕۆشنبیری و زانستی لە گشت ناوچەکانی جیهانی ئیسلامیدا[2]. ئەم قوتابخانە ئیسلامیانە، بە شێوەیەکی ڕێکخراو دامەزرا بوون، بەڕادەیەك هەر قوتابخانەیەك لە چەند پێکهاتەیەکی گرنگ پێك هاتبوو، ئەوانیش بریتی بوون لە (مامۆستا (المدرس)و معیدو ئیمام و قورئان خوێن (القارىء)و بانگبێژ (المؤذن)و چاودێر (الناظر)و خزمەتگوزاری (الخدم)و فەرمانبەری کتێبخانەو قوتابی. جگە لەوەی هۆڵەکانی خوێندن، شوێنی خەوتنی قوتابیان و حەمام و کتێبخانەو شوێنی نوێژکردن و نەخۆشخانەی تیابووە[3]. ئەم قوتابخانانە ڕۆڵێکی گەورەیان بینیوە، لە بڵاوکردنەوەی هەر چوار مەزهەبە سونیەکەو پێگەیاندنی سەدان زانا، لە زانستە شەرعیەکاندا، لە دیارترین ئەو قوتابخانانەی کە لەلایەن کەسایەتیە کوردەکانەوە دروست کراون، کە لە کتێبی (وفیات الاعیان) هاتووە ئەمانەن:

---

(١) الزبيدی، تاج العروس، ج١٦، ص٧٠.

(٢) احمد عبدالرزاق احمد، الحضارة الاسلامية في العصور الوسطى، دار الفكر العربي، (القاهرة: ١٩٩١)،ص٢٧.

(٣) ايمن شاهين سلام، المدارس الاسلامية في مصر في العصر الايوبي و دورها في نشرالمذهب السني، رسالة الماجستير غير المنشورة مقدمت الى مجلس الكلية الاداب، جامعة طنطا، ١٩٩٩، ص ص٨_٩.

**١) قوتابخانەی شافیعی العادلیة (الشافعیة):**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (عادل بن السلار)ی کوردی، لەشاری ئەسکەندەریە لە میسر بۆ شافیعیەکان دروست کراوە[١]. (ابن خلکان) دەڵێت: (عادل بن السلار) کاتێك والی بوو لە شاری ئەسکەندەرییە، کەسایەتی (الحافظ أبو طاهر السلفي)[٢] هاتۆتە ئەم شارە، (عادل) دەمارگیر و سۆزی زۆر بووە، بۆ مەزهەبی سونە، زۆر خۆشحاڵ بووە، بەهاتنی ئەم زانایە، زۆر ڕێزی گرتووەو قوتابخانەیەکی تایبەتی بۆ بنیات ناوە، بۆ بلاو کردنەوەی مەزهەبی شافیعی، کە تائێستا بە ناوی ئەو ناسراوە[٣].

وا دیارە (ابن خلکان) ئەم زانیاریەی لە کتێبی (ابو شامة) وەرگرتووە، چونکە ئەو ئاماژەی بەم زانیاریە کردووە، (ابن خلکان) کەمێك زانیاریەکەی لەم بارەیەوە فراوان کردووە[٤].

تەنانەت (ابن خلکان) دەڵێت: هیچ قوتابخانەیەکی شافیعیم لە ئەسکەندەریە نەبینیوە، جگە لەم قوتابخانە شافیعیە[٥]، هەروەها (الصفدي) لە کتێبەکەیدا ئاماژە بەناوی ئەم قوتابخانەیە دەکات، کە بە قوتابخانەی (العادلیة)ناوی هێناوە[١].

---

(١) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤١٧؛ الذهبي، سیر اعلام النبلاء، ج١٥، ص٢٧٩؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج٢١، ص٩٤.

(٢) الحافظ أبو طاهر السلفي: (احمد بن محمد بن أحمد الحافظ، أبو طاهر، السلفي)،شێخی ئیسلام بووە، گوێ گرتووە لەلای چەندین زانای وەك (ابن البطر) و(خلائق) وهتد، تەمەنێکی درێژی هەبووە سەرەوەی سەد سال بووە، لەسالی (٥٧٦ك/١١٨٠ز) کۆچی دوای کردووە.الذهبي، أسماء من عاش ثمانین سنة بعد شیخه أو بعد سماعه، تحقیق: عواد الخلف، مؤسسة الریان، (بیروت: ١٩٩٧م)،ص٨٤.

(٣) وفیات الاعیان، ج٣، ص٤١٧.هەروەها (ابن کثیر) یش هەمان زانیاری باس کردووە بەوەی له(ابن خلکان) ی وەرگرتووە.، البدایة والنهایة، ج١٢، ص٣٧٧.

(٤) عیون الروضتین، ج١، ص٢٩٢.

(٥) وفیات الاعیان، ج٣، ص٤١٧.

**٢) قوتابخانەی ئەلئەسەدییە(الاسدية):**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (أسد الدين شيركوه بن شاذي)ی مامی (صلاح الدين الايوبي) لە شاری (حلب) دروست كراوە[٢]، مێژووی بونیات نانی دیار نیە[٣]، كەوتۆتە نێو گەڕەكی (باب قنسرين)[٤] . بە پێی سەرچاوەكان (اسدالدين شيركوه) قوتابخانەیەكی تریشی لە شاری (دیمەشق) هەر بەناوی (الاسدية) بونیات ناوە[٥] . هەروەها بەهەمان شێوە لە شاری (تعز)ی ولأتی (یەمەن ) قوتابخانەی (الاسدية)هەیە[٦]، بەلأم (ابن خلكان) تەنها ئاماژەی بە قوتابخانەی (الاسدية)ی (حلب) كردووە، بەبێ ئەوەی زانیاری تەواو لەسەر ئەم قوتابخانەیە بدات[٧]، ئەم قوتابخانانە بۆ هەردوو مەزهەبی شافیعی و حەنەفی بووە [٨].

---

([١]) الوافي بالوفيات، ج٢١، ص٩٤.

([٢]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٥٤؛الصفدي،أعيان العصر وأعوان النصر، ج٥، ص٣١٢؛ كرد علي، خطط الشام، ج٦، ص١٠٤؛ احمد رضا احمد، المدارس في بلاد الشام في العصر الايوبي، رسالة الماجستير غير المنشورة مقدمة الى مجلس كلية التربية، جامعة الموصل، (موصل: ٢٠٠٨)،ص٤٤.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٥٤؛ ابن العجمي، كنوز الذهب في تاريخ حلب، ج١، ص٣٠١.

([٤]) ابن العجمي، كنوز الذهب في تاريخ حلب، ج١، ص٣٠١؛ كرد علي، خطط الشام، ج٦، ص١٠٤.

([٥]) ابو شامة، عيون الروضتين، ج٢، ص١١٤؛النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص١١٤.

([٦]) الجندي، السلوك في طبقات العلماء والملوك، ج١، ص٤٤٥؛الخزرجي، العقود اللؤلؤية في تاريخ الدولة الرسولية، ج١،ص١٩١.

([٧]) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٥٤.

([٨]) النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص١١٤؛كرد علي، خطط الشام، ج٦، ص١٠٤؛ احمد رضا احمد، المدارس في بلاد الشام في العصر الايوبي، ص٤٤.

٣) قوتابخانەی ناسرییە(الناصرية):

ئەم قوتابخانەیە لە شاری (قودس) لەلایەن مەلیك (ناصر صلاح الدين يوسف بن ايوب) دامەزراوە[1] . لە هەندێك سەرچاوەدا بەناوی قوتابخانەی (الصلاحية) لە قودس هاتووە[2] .

تەنانەت (النعيمي) لە کتێبەکەی بەناوی (الصلاحية الناصرية) هێناویەتی[3]، هەروەها قوتابخانەیەکی تریش هەر بەناوی (الناصرية الجوانية)لە شاری (دیمەشق) هەبووە[4] .

٤) قوتابخانەی ناسرییە(الناصرية الصلاحية) یاخود(زين التجار):

ئەم قوتابخانەیە لە ولآتی میسر بۆ مەزهەبی شافیعیەکان لەلایەن (صلاح الدين الايوبی) بنیات نراوە، بەلآم بەناوی قوتابخانەی (زين التجار)[5] ناسراوە[6] . کەوتۆتە

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٤٢؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٤، ص٨٥؛ بدرالدين العينى، عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، ج١، ص٢٢٤.

(2) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦١٣؛كرد علي، خطط الشام، ج٦، ص٨٤.

(3) الدارس في تاريخ المدراس، ج١، ص٦٢.هەرچەندە ئەم قوتابخانەیە لەلایەن مەلیك (ناصر) لە سالی(٥٨٣ك/١١٨٧ز) بریاری دامەزراندنی درا، بەلام بەشێوەیەکی فەرمی لە سالی(٥٨٨ك/١١٩٢ز) کرایەوەو وانە وتنەوەی تیایدا ئەنجام درا. احمد رضا احمد، المدراس في بلاد الشام في العصر الايوبي، ص٥٠.

(4) اليونيني، ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٤٧٢؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٣٥٠.

(5) زين التجار: أبو العباس أحمد بن المظفر بن الحسين الدمشقيَکە بە(زين التجار) ناسراوە، یەکێك بووە لە زانا ناودارەکانی شافیعی، بۆ ماوەیەکی زۆر خەریکی وانەووتنەوە بوو لە قوتابخانەی (الناصرية) لە میسرتاوەکو لە سالی(٥٩١ك/١١٩٤ز) کۆچی دوای دەکات.الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٩٥٦؛المقريزى، المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والاثار، ج٤، ص٢٠٠.

(6) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص٢٠٦_٢٠٧؛ ابن تغري بردى، النجوم الزاهرة، ج٦، ص ص٥٥_٥٦.

تەنیشت مزگەوتی (العتیق)[١] . سەرەتا ئەم قوتابخانەیە بە (الناصریة الصلاحیة) ناسراوە، پاشان بەناوی وانەبێژ (زین التجار)کراوە[٢] . لە دوای مردنی مامۆستا (زین التجار)، ئەم قوتابخانەیە بە (الشریفة) ناسراوە[٣].

**٥) قوتابخانەی سلاحییە( الصلاحیة):**

ئەم قوتابخانەیە هەرچەندە ناوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (صلاح الدین الایوبی) بەڵام لەلایەن (نورالدین محمود)ەوە دروست کراوە[٤] . کە مەزهەبی شافیعی تیادا دەخوێنرا، بۆیەش بەناوی (صلاحییة) کراوە، چونکە (صلاح الدین) ڕووبەرەکەی فراوان کردووە، وەقفی زیاتری بۆ کردووە[٥].

**٦) قوتابخانەی شافیعی :**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن مەلیك (صلاح الدین الایوبی) لە شاری (قاهیرە ) لە ناوچەی (القرافة الصغری) لە تەنیشت گۆڕی ئیمامی شافیعی(م:٢٠٤ك/٨١٩ن) دروست کرابوو، بە قوتابخانەی شافیعی ناسراوە[٦] .

---

([١]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٩٥٦؛السبكي، طبقات الشافعية، ج٦، ص٦٤.

([٢]) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٩٥٦؛السبكي، طبقات الشافعية، ج٦، ص٦٤؛المقريزي، المواعظ والاعتبار، ج٤، ص٢٠٠.

([٣]) المقريزي، المواعظ والاعتبار، ج٤، ص٢٠٠.

([٤]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٠٧؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٦ ؛النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٢٥٠.

([٥]) احمد رضا احمد، المدراس في بلاد الشام في العصر الايوبي، ص٤٩.

([٦]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص ٢٠٦_٢٠٧؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٦٠؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٣٢٧؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٥؛ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب، ج٨، ص٤٣٧؛احمد رضا احمد، المدارس في بلاد الشام، ص٤٨.

ئەوەی تێبینی دەکرێ (ایمن شاهین) کە یەکێکە لە توێژەران ڕەخنەی لە (ابن خلکان) گرتووە، بەوەی لە باسی هەردوو قوتابخانەی (شافیعی)و (زین التجار)، تێکەلأوی کردووە و زیاتر شتەکانی لەبارەی ئەم دوو قوتابخانەیە بە ناڕونی بەجێهێشتووە، (ایمن شاهین) دەڵێت: لە ئەسڵدا قوتابخانەی شافیعی، قوتابخانەی ناسرییەی دووەمە، قوتابخانەی (زین التجار) مەبەست لێی قوتابخانەی ناسرییەی یەکەمە[1] .

ئەوەی ڕاستی بێت (ابن خلکان) تێکەڵی نەکردووە، چونکە هەرخودی (ابن خلکان) دەڵێت: خەڵکی میسر بەوقوتابخانەی کە( صلاح الدین) لە لە تەنیشت گۆڕی ئیمامی شافیعی دروستی کردوو، تەنها دەیان ووت قوتابخانەی شافیعی، هەر بەوناوە بەناوبانگ بووە[2] . نەك بەناوی (صلاح الدین) یاخود ناسرییەی دووەم بێت، هەروەکو(ایمن شاهین) ئامارەی پێکردووە، هەروەها بە قوتابخانەکەی تریش کە لەلایەن (صلاح الدین) بینات نرا بوو، تەنها دەیان ووت قوتابخانەی (زین التجار) نەك ناوی تر[3]، دوای گەڕانمان لەسەرچاوەکانی تر هەمان زانیاریەکانی (ابن خلکان) لەمەڕ ئەم دوو قوتابخانەیە پشت ڕاست کراوەتەوە[4] . پێدەچێ دوای (ابن خلکان) لەلایەن هەندێك سەرچاوەی تر، بەم دوو ناوەی (ناسرییەی یەکەم ودووەم )هاتبێت.

---

(1) المدارس الاسلامية في مصر في العصر الايوبي و دورها في نشرالمذهب السني، ص٧٦.

(2) وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٠٧.

(3) وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٠٧.

(4) الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٦٠ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص ص٥٥_٥٦.

### ٧) قوتابخانەی مەشهەد حوسەینی (المشهد الحسيني):

یەکێك لەو قوتابخانانە بوو، کە لە شاری (قاهیرە) لە تەنیشت ئەو مەشهەدەی کە دەگەڕێتەوە بۆ (حسین بن علی)(خوای لێ رازیبێت) لەلایەن (صلاح الدين الايوبى) بنیات نراوە، هەرچەندە لەلایەن (صلاح الدين الايوبى) دامەزراوە، بەڵام بە قوتابخانەی (المشهد) ناسراوە[1].

ئەوەی تێبینی دەکرێ، تەنها (ابن خلكان) ئاماژەی بە دروست کردنی ئەم قوتابخانەیە داوە، لەسەرچاوەی پێش خۆی باس نەکراوە، تەنانەت سەرچاوەی دوای (ابن خلكان)یش ئاماژەیان، بەم قوتابخانە کردووە بەوەی لە (ابن خلكان) یان وەرگرتووە، نازانرێت بۆ کام مەزهەبیش بووە[2] .

### ٨) قوتابخانەی سیوفیە (السيوفية):

دوای ئەوەی (صلاح الدين الايوبى) بووە فەرمانڕەوای میسر، چەندین قوتابخانەی دروست کرد، یەکێك لەوانەش ماڵی هەریەکە لە (عباس)[3] و (عادل بن السلار)ی لە (قاهیرە) کردە قوتابخانە بۆ مەزهەبی حەنەفی، کە بە قوتابخانەی سیوفیە (السيوفية)

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص ٢٠٦_٢٠٧. هەروەها (الصفدى) هەمان زانیاری (ابن خلكان) ی بەبێ زیادە دووبارەی کردۆتەوە بە بێ ئەوەی ئاماژە بەناوی (ابن خلكان) ی کردبێت، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٦٠.

([2]) ابن تغری بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٥؛ ايمن شاهين سلام، المدارس الاسلامية في مصر في العصر الايوبي ودورها في نشر المذهب السني، ص٩٠.

([3]) عباس: ناوی (المأمون ابو عبدالله ابن البطائحي) بووە لەدوای کوژرانی (الافضل) لەساڵی(٥١٠ك/١١١٦ز) شوێنی گرتۆتەوەو بۆتە وەزیری میسر، لەساڵی(٥١٩ك/١١٢٥ز) مردووە.الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١١، ص٣٠٤.

ناسـراوە[١]، بۆیـەش بـە نـاوی (السـیوفیة)كـراوە، چـونكە ئـەو قوتابخانەیـە ئـەو كاتـە لەبەردەم دەرگای بازاری (السیوفیة)بوو[٢] .

### ٩) قوتابخانەی مالیكیە (المالكية):

ئەم قوتابخانەیە لە لایەن مەلیك (صلاح الدين الايوبى) لە میسر بنیات نراوە[٣]، (ابن خلكـان) دەڵێـت: (( هەریەكـە لـە قوتابخانـەكانی (الشـافیعی)و (المشـهد)و(المـالیكی)و (السیوفیة) لەلایەن مەلیك (صلاح الـدین الایـوبی) ەوە دروسـت كـراوە، بـەڵام هـیچ كـام لەمانــە بــەناوی خۆیــەوە نــەبووە، كەچــی بــەناوی تــرەوە ناســراوە، ئــەوەی جێــی سەرسورهێنەرە تـەنها قوتابخانـەی (الصـلاحیة) لـە (دیمەشـق) لەلایـەن (صـلاح الـدین الایوبی) دروست نەكراوە، كەچی ناوەكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئـەو[٤].هـەروەها (ابـن تغـری بردی) پشت ڕاستی ئەم زانیاریەی كردۆتەوە بەوەی لە (ابن خلكان)ی وەریگرتووە))[٥].

لێـرەدا سـادەیی و ناوبـانگ نەویسـتی خـودی (صـلاح الـدین الایـوبی)مـان بـۆ بەدەردەكەوێ، سەرەڕای ئەمەش تـەنها وەك سـەركردەیەكی سـەربازی شـارەزا ڕۆڵـی نەبینیوە، بەڵكو كەسایەتیەكی لێهاتوو بـووە، لـە چۆنیەتی هەڵسوكەوتكردنی لەگـەڵ لایەنی ڕۆشنبیری و زانستی خەڵكی میسر، تەنانـەت پەیوەندییـەكی زۆر بتـەوی لەگـەڵ چینی زانایان و ڕۆشنبیران هەبووە، سەركەوتوو بـوو لـە بڵاوكردنـەوەی مەزهەبـەكانی (شافیعی و مالیكی و حەنەفی) و دروستكردنی گیـانی جیهـاد و تیكۆشـان لـەلای خـەڵك.

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص ٢٠٦_٢٠٧؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٦٠؛ المقريزي، المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار، ج٤، ص٢٠٤.

(٢) المقريزي، المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار، ج٤، ص٢٠٤.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص ص ٢٠٦_٢٠٧؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٦.

(٤) وفيات الاعيان، ج٧، ص ص ٢٠٦_٢٠٧.

(٥) النجوم الزاهرة، ج٦، ص ص٥٥_٥٦.

هەرچەندە (صلاح الدین) شافیعی مەزهەب بوو، بەلأم بەبێ جیاوازی کاری بۆ بلأوکردنەوەی گشت مەزهەبەکاندەکر ئەم سیاسەتەشی سەرکەوتوو بوو، لە لاوازکردن و نەهێشتنی مەزهەبی شیعە، بە بەرنامەو پلانێکی تۆکمەوە، چەندین قوتابخانەی لە میسر کردەوە، بەمەبەستی گەیشتنی بە ئامانجەکەی، ئەویش بریتی بوو لە کۆتایهێنان بە دەوڵەتێکی شیعە مەزهەب و دامەزراندنی دەسەلأتێکی سوننە مەزهەب، لەسەر بناغەیەکی محکوم بنیاد نرابێ.

**١٠)قوتابخانەی عەزراوییە (العذراوية):**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (عذرا ) کچی (شاهنشاه بن أیوب) لە شاری (دیمەشق) لەناو (باب النصر) دروست کراوە، ناوەکەشی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە[1] . مێژووی دروست کردنەکەی بۆ ساڵی (٥٨٠ك/١١٨٤ز) دەگەڕێتەوە، بۆ هەردوو مەزهەبی (شافیعی و حەنەفی) بووە[2] . لەدوای کۆچی دوایی کردنی (عذرا)لە ساڵی (٥٩٣ك/١١٩٦ز) تەرمەکەی هەر لە نێوو ئەم قوتابخانەیە نێژراوە[3].

**١١)قوتابخانەی (منازل العز):**

(تقي الدین بن شاهنشاه بن ایوب)ی برازای سوڵتان (صلاح الدین الایوبی)، چاکەوخزمەتێکی زۆری بە زانایان کردووە، چەندین قوتابخانەی بۆیان دروست کردووە، لەوانەش خانووی عز (منازل العز) لە میسر کە خۆی لەم خانووەدا نیشتەجێ ببوو،

---

(1) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٥٣؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٣، ص٦٩؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٢٨٣.

(2) النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٢٨٣؛ احمد رضا احمد، المدارس في بلاد الشام، ص٨٩.

(3) الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١٠٠٢؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٢٨٣.

وەقفی کرد، تاوەکو کردوویەتی بە قوتابخانە[1] . (شهاب الدين الطوسي م:٥٩٦ك/١١٩٩ز) یەکێك بوو لە مامۆستایانی ئەم قوتابخانەیە خەریکی وانەوتنەوەبوو تیایدا[2]، هەروەها(تقي الدين بن شاهنشاه) دوو قوتابخانەی (شافیعی و مالیکی) دامەزراند، جگە لەوەی کاتێك لە ناوچەکانی ڕۆژهەلأت فەرمانڕەوا بوو، قوتابخانەیەکی لەشاری (روها) دروست کرد[3] .

**١٢)قوتابخانەی شامییەی ئەلجوانییە (الشامية الجوانية):**

ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (ست الشام زمرد خاتون بنت أيوب) خوشکی (شمس الدولة توران شاه بن أيوب)، لە نێو ئەو ناوچەیەی کە بیمارستانی نووری لێیە لە شاری (دیمەشق) دروست کراوە[4] . هەرچەندە (ابن خلكان) ئامارژەی بەناوی قوتابخانەکە نەکردووە، بەلأم لەسەرچاوەی تردا ئامارژەی پێکراوە، بە قوتابخانەی (الشامية الجوانية)و (الحسامية)ەوە ناسراوە[5].

---

(1) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٥٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٢، ص٢٩٩؛ ابن تغري بردى، النجوم الزاهرة، ج٥، ص٣٨٦.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٢٢٤؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص٣٠.لەهەندێك سەرچاوەی پێش (ابن خلكان) ی ئامارژەیان بەوە کردووە، لەسەرەتادا (تقي الدين بن شاهنشاه) خانووی ئەلعزی کریوە (منازل العز) پاشان کردوویەتی بە قوتابخانە بۆ شافیعیەکان.ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ج٩، ص٣٢٦؛ ابو شامة، عيون الروضتين، ج٢، ص١٨٢.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٥٦؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٢، ص٢٩٩؛عبد القادر بدران، منادمة الأطلال ومسامرة الخيال، ص٩٢.

(4) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤؛ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص ص١٠٠_١٠١؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٢٢٧.

(5) ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص ص١٠٠_١٠١؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٢٢٧؛ ناصر محمد علي الحازمي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي، رسالة ماجستير

هەروەها (ابن خلكان) ئاماژەی بە دروست كردنی قوتابخانەیەكی تر لە دەرەوەی شاری (دیمەشق) لەلایەن (ست الشام)ی كردووە، بەبێ ئەوەی ناوی قوتابخانەكە بهێنێت[1] .لێرەدا بۆمان بەدەردەكەوێ ژنانی نێو بنەماڵەی ئەیوبی شان بەشانی پیاوانی ئەیوبی ڕۆڵی كاریگەریان بینیوە، لە خزمەت كردنی شارستانیەتی ئیسلامیدا.

**دووەم :خانەی فەرمووده (دار الحديث):**

ئەگەر قوتابخانەكان تایبەت بوویێ بە فیقهە و زانستە شەرعیەكان، بەپێی مەزهەبەكانیش خانەكانی فەرمووده پێگەیەكی تایبەتیان هەبووە، لە بایەخ دان بە زانستی فەرمووده، بەڕادەیەك ئەم خانەی فەرموودانە پێشبڕكێی قوتابخانەكانی ئەو كاتیان دەكرد[2] . لە دیارترین ئەو خانەی فەرموودانە كە لەلایەن ئەیوبیەكانەوە دروست كراون، (ابن خلكان) ئاماژەی پێكردووە، ئەمانەن:

---

غير المنشورة مقدمت الى مجلس كلية الشريعةوالدراسات الاسلامية، جامعة ام القرى، مكة المكرمة، ج١، ص٢٨٠.

(1) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤.لەسەرچاوەی تر ئاماژە بەناوی ئەم قوتابخانەیە كراوە بەناوی (الشامية البرانية) ناسراوە تەنانەت بەیەكێك لەقوتابخانە گەورەكان دادەنرێت. ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٣، ص ص١٠١_١٣٦؛النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص٢٠٨؛ ناصر محمد علي الحازمي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي، ص٢٧٨.

(2) ناصر محمد علي الحازمي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي، ص٢٤٤.

**١) خانەی فەرموودەی ئەشرەفیە(دار الحدیث الإشرفیة):**

ئەم خانەی فەرموودیە لەلایەن مەلیك (الاشرف )ی کوڕی (عادل بن ایوب)ی لە شاری (دیمەشق) دروست کرا، خەڵکانێك بە مەبەستی فێربوونی زانستی فەرموودە ڕوویان تێدەکرد[١]، کە بەناوی ((دار الحدیث الإشرفیة)ناسراوە[٢] .

**٢) خانەی فەرموودەی کامیلیە (دار الحدیث الکاملیة):**

یەکێکی ترە لەو خانانەی فەرموودە کە لەلایەن مەلیك (کامل الایوبی) لەشاری ( قاهیرە ) بۆ زانستی فەرموودە دروست کراوە[٣]، کە بەناوی (دار الحدیث الکاملیة)هاتووە[٤] .(المقریزی) ئاماژە بەوە دەکات کەوا بەهۆی ئارەزوی مەلیك( کامل) لە زانست و گوێ گرتنی لە فەرموودە، بۆیە ئەم خانەی فەرموودەیەی بونیات ناوە، تەنانەت مەلیك (کامل)دیبیەتی زانایانی دەکرد و لە بواری زۆر نامۆ لە شەرعناسی ونەحوو تاقی دەکردنەوە، ئەوەی وەڵامەکەی بپێکابایە، چانسی باشی پێدەدرا[٥] .

---

(١) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٢٤٤؛ ابن تغري بردی، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢٨٠؛ السیوطي، تاریخ الخلفاء، ص٣٢٦.لەهەندێك لەسەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکرێ گوایە لە سەرەتادا ئەم خانە فەرموودەیە خانووی میر(صارم الدین قایماز ابن عبد الله النجي) بووە، پاشان لەلایەن مەلیك(الاشرف) کڕاوە، خانەی فەرموودەی ئەشرەفیەی لێ ئاوەدان کردوە.ابن کثیر، البدایة والنهایة، ج١٣، ص٢٩؛ النعیمي، الدارس في تاریخ مدارس، ج١، ص١٥.هەروەها (الذهبي) ئاماژەی بە(أبو بكر) کردووە، کە شێخێکی کورد بووە لەم خانەفەرموودەی ئەشرەفیە موقیم بووە تاوەکو مردنی لەسالی(٦٩٨ك/١٢٩٨ز).تاریخ الاسلام، ج١٥، ص٨٩٠.

(٢) الیونیني، ذیل مرآة الزمان، ج٣، ص٢٨٨؛ابن تغري بردی، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٢٨٠ ؛النعیمي، الدارس في تاریخ مدارس، ج١، ص١٥؛ ابن طولون، مفاکهة الخلان في حوادث الزمان، دار الکتب العلمیة، (بیروت: ١٩٩٨)،ص١٣٣.

(٣) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٤٥٠؛الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٤، ص١٨٥.

(٤) الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٤، ص٤٠١.

(٥) المقریزی، المواعظ والاعتبار بذکر الخطط والاثار، ج٤، ص٢٢٣.

## سێیەم : مزگەوتەکان:

لە ڕووی زمانەوانییەوە مزگەوت (المسجد) بەمانای ئەو شوێنە دێت کە کڕنوشی (السجود) تێدا بۆ دەبرێ [١]، لەلای خوای گەورە مزگەوت بە پیرۆزترین و پاکترین شوێنی سەر زەوی دادەنرێت، کە نوێژو پەرستەکانی تیا ئەنجام دەدرێت [٢] . دیارترین ئەو کەسایەتیە کوردانەی کە ( ابن خلكان) ناوی هێناون کە ڕۆڵیان بینیوە لە دروست کردن و ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکان ئەمانەن:

(عادل بن السلار)ی کوردی زۆر لە مزگەوتەکانی (قاهیرە)ی نۆژەن وئاوەدان کردەوە [٣]، جگە لەوەی مزگەوتێکی لە دەرەوەی شاری (بلبیس) دروست کرد، کە هەر بەناوی خۆیەوە بووە [٤] .

هەروەها(ابن خلكان) دەڵێت: ((نجم الدين ايوب، دەستی خێرو چاکەی زۆربووە، یەکێك لەو چاکانەی کە کردوویەتی لە دەرەوەی شاری (قاهیرە) و(باب النصر)دا دروستکردنی مزگەوتێکە لەگەڵ ئاوەدانکردنەوەی حەوزێکی ناوازە، تەنانەت (ابن خلكان) دەڵێت: هەرخۆم مێژووی دروست کردنی حەوزەکەم لە ڕووی بەردێك بینی کە بەروارەکەی ساڵی (٥٦٦ك/١١٧٠ن)بووە)) [٥] .

---

(١) ابن المنظور، لسان العرب، ج٣، ص٢٠٤؛الزبيدی، تاج العروس، مادة: سجد، ج٨، ص١٧٢؛صالح بن ناصر، وظيفة المسجد في المجتمع، وزارة الشئون الإسلامية والأوقاف والدعوة والإرشاد، (السعوديا: ١٤١٩)،ص٤.

(٢) عبد الله بن معتق السهلي، القول الأحمد في أحكام في حرمة المسجد، ط٣٦، الجامعة الإسلامية، (المدينة المنورة: ٢٠٠٤)،عدد: ١٢٥، ص٣٦٨.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦.هەروەها (العمري) ئاماژەی بەهەمان زانیاری کردووە بەوەی لە (ابن خلكان) ی وەرگتووە.المسالك الابصار، ج١١، ص٢٦٧.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤١٦.

(٥) وفيات الاعيان، ج١، ص٢٦١.

ئـەوەی جێـی ئاماژەیـە (ابـن خلكـان) بـەرواری دروسـت کردنـی حەوزەکـەی بـۆ پاراستوین، وە مێژووەکەی دەری دەخات دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای هاتنی ئەیوبیەکانە بۆ میسر، هێشتا دەوڵەتی ئەیوبی دانەمەزرابوو، بەڵکو سـەردەم سـەردەمی فاتمیـەکان بوو، تەنانەت لەوکاتە سوڵتان (صـلاح الـدين)ی ئـەیوبی وەزیـری فاتمیـەکان بـوو، (ابـن خلكان) دەڵێت: (( (نجم الدين ايوب) لە ساڵی (٥٦٥ك/١١٦٩ز) گەیشتۆتە میسر[1]،

ئەمەش گەواهی ئەوەدەدات (نجم الـدين) لـە ماوەیـەکی کـەمی نزیکـەی سـاڵێك لـە هاتنی بۆ میسر شوێن پەنجەی خۆی دیار کردووە، دەستی کردووە بـە خـەزمـەتگوزاری وئاوەدانکاری .

## چوارەم : خانەقا وپەناگەو گۆشە ئاينيەکان (الخانقاه)و(الربط)و(الزوايا):

خانەقا(الخانقاه) وشەیەکی فارسی یە لە بنچینەدا پێی وتراوە (الخانكاه)، بە مانای ماڵی سۆفییەکان دێت[2] . هەروەها بە (ربـاط)ی سـۆفیەکان وتـراوە (خوانـق) کـە کـۆی خانەقایـە[3] . تەنانـەت (النعيمـي)دەڵێـت: هـیچ جیاوازییـەك لـە نێـوان خانـەقا لەگـەڵ پەناگەو گۆشـە(الربـاط والزاويـا)نیـە، هـەموویان شـوێنی خواپەرستی بوونـە[4]. گۆشـە

---

([1]) وفيات الاعيان، ج٧، ص١٥٣.

([2]) النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج٢، ص١٢٥؛عبد القادر بـدران، منادمـة الأطـلال ومسـامرة الخيال، ص٢٧٢؛كرد علي، خطط الشام، ج٦، ص١٢٧.

([3]) الحميري، الروض المعطار في خبر الأقطار، ص٢٤٠؛ عبد القادر بدران، منـادمة الأطـلال ومسـامرة الخيال، ص٢٧٢.

([4]) الدارس في تاريخ المدارس، ج٢، ص١٥٢.هەروەها بڕوانە:مصطفى جواد، الربط البغداديـة واثرهـا في الثقافة الاسلامية، مجلة سومر، ١٩٥٤، مج١، ج٢، ص ص٢١٩_٢٢٠.

(الزاويا) شوێنی سۆفیەکان بووە، بۆ خواپەرستی وخەڵوەت گرتن، جگە لەوەی لەم خانەقایانە خواردن و پێداویستی بەو هەژارانە دەدرا کە ڕوویان تێدەکرد[1] .

### ١) خانەقای نەجمییە (النجمیة) :

ئەم خانەقایە لەلایەن (نجم الدین)ی باوکی سوڵتان (صلاح الدین الایوبی) لە (بعلبك) بۆ سۆفیەکان ئاوەدان و دروست کراوە، پێی وتراوە (النجمیية) کەناوەکەی بۆ (نجم الدین ) دەگەڕێتەوە[2] . (ابن خلکان) دەڵێت: لە شاری (بعلبك) خانەقایەکی زۆر جوان و ڕێك و پێکم بینی بە ناوی (النجمیة) کە لەلایەن (نجم الدین) دروست کرابوو، پرسیم لە خەڵکی ئەو شارە، لە بارەی هۆکاری دروست کردنی ئەم خانەقایە ، وتیان، ئەوکاتەی (بعلبك) بە (نجم الدین بن ایوب) درا، دروستی کرد[3] .

---

(1) کرد علي، خطط الشام، ج٦، ص١٦٠.بەشێوەیەکی گشتی خانەقا بەمانای(دار العبادة) دێت.علی طنطاوی، الجامع الاموي في دمشق، مطبعة الحکومة، دمشق، ص٢٣.

(2) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج١، ص٢٥٧.هەروەها ئەم سەرچاوانە هەمان زانیاری (ابن خلکان) یان دووبارە کردۆتەوە.الیافعي، مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ج٣، ص٢٩٠؛ عبد القادر بدران، منادمة الأطلال ومسامرة الخیال، ص٢٨٧؛کرد علي، خطط الشام، ج٦، ص١٢٧.

(3) وفیات الاعیان، ج١، ص٢٦١.هەروەهاخانەقایەکی تر هەر بەهەمان ناوی (النجمیة) لەدەرەوەی قاهیرە لەلایەن (نجم الدین بن ایوب) ەوە بنیات نراوە، (ابن خلکان) ئاماژەی پێنەکردووە، و لەسەرچاوەی تردا ناوی هاتووە.ابن قاضی شهبة، طبقات الشافعیة، ج٣، ص٧٣؛النعیمي، الدارس في تاریخ مدارس، ج٢، ص١٣٦؛ عبد القادر بدران، منادمة الأطلال ومسامرة الخیال، ص٢٨٧.

**٢) خانەقای سەعید سوعەدا(خانقاه سعيد السعداء):**

دوای ئەوەی (صلاح الدين الايوبی) بووە فەرمانڕەوای لە میسر، خانووی (سعيد اليسعداء)ی میسری لە شاری (قاهیرە) کردە خانەقا بۆ سۆفییەکان[١]، بەبێ ئەوەی بە ناوی خۆی بکات، هەر بەناوی خانەقای سەعید سوعەدا ناسراوە[٢] .

هەروەها (ابن خلكان) ئاماژەی بەدروست کردنی خانەقایەك لە شاری ( قودس) لەلایەن سوڵتان (صلاح الدين الايوبی)یەوە کردووە، بەبێ ئەوەی ناوو مێژووی دروست بوونەکەی باس بکات[٣] . هەروەها (ابن تغري بردي) هەمان زانیاری دووپات کردۆتەوە و بەوەی لە (ابن خلكان)ی وەرگرتووە[٤].

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ص ص٢٠٦_٢٠٧؛ ابن تغري بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٥؛ السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج٢، ص٢٦٠.

([٢]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ص ص٢٠٦_٢٠٧؛الحنبلي، ذيل طبقات الحنابلة، تحقيق: عبدالرحمن سليمان، مكتبة العبيكان، (الرياض: ٢٠٠٥)،ج٤، ص١٤٤؛ابن تغرى بردي، النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٦؛ السيوطي، حسن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج٢، ص٢٦٠؛ابن مفلح، المقصد الأرشد في ذكر أصحاب الإمام أحمد، تحقيق: عبدالرحمن سليمان، مكتبة الراشد، (الرياض: ١٩٩٠)،ج٢، ص٣٣٤؛ الجبرتي، تاريخ عجائب الآثار في التراجم والأخبار، دار الجيل، بيروت، ج١، ص٥٧٤.

([٣]) وفيات الاعيان، ج٧، ص٢٠٧.

([٤]) النجوم الزاهرة، ج٥، ص٥٥.

## پێنجەم:نەخۆشخانە(بیمارستان)[1] :

(ابـن خلكـان) لـە بـواری دروسـت كردنـی نەخۆشـخانەدا، ئامـاژەی بـە ڕۆڵـی یـەك كەسایەتی كوردی كردووە، ئەویش (صلاح الدین الایـوبی)بـووە، كـە بیمارسـتان یـاخود نەخۆشخانەیەكی لە نێو كۆشك لە شاری (قاهیرە) دروست كردووە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بەناوو مێژووی دروست كردنی بیمارستانەكە بكات[2]، بەڵام (المقریزي) ئاماژەی بـەناوی ئەم نەخۆشخانەیە كردووە، كە بە بیمارستانی(العتیق)ناسراوە[3] .

هەروەها (ابن جبیر) لە گەشتەكەی ئاماژەی بـەم نەخۆشـخانە كـردووە، كـە خـۆی بینیویەتی و دەڵێت: ((خزمەتگوزاریەكانی ئەم نەخۆشخانەیە بۆ نەخۆش بـێ بەرامبـەر بـوو، شـەوو ڕۆژ چارەسـەری نەخۆشـی تیـادەكرا، جگـە لـەوەی شـوێنی تایبـەتیش بۆچارەسەری ئافرەتان دانرابوو))[4] .

---

([1]) بیمارسـتان: وشـەیەكی فارسـیە لـە بیمـار(نـەخۆش) و سـتان(شـوێن) پێـك هـاتووە، بـەواتای (نەخۆشخانە) (دار المرضـی) دێـت، بـە تـوركیش پـێ وتـراوە(خسـتەخانە). رینهارتـان دوزي، تكملـة المعـاجم العربيـة، نقلـه إلى العربيـة وعلـق عليـه: جمـال الخيـاط، وزارة الثقافـة والإعـلام، (العـراق: ٢٠٠٠)،ج١٠، ص٩؛أحمـد مختـار عبـد الحميـد، معجـم اللغـة العربيـة المعاصـرة، عـالم الكتـب(بـيروت: ٢٠٠٨م)،ج٣، ص٢٠٦٠؛السـيد ادى شـير، الالفـاظ الفارسـية المعربـة، المطبعـة الكاثوليكية للاباء اليسوعيين، (بيروت: ١٩٠٨)،ص٣٢.بۆ زانیاری زیاتر لەسـەر (بیمارسـتان) ی بڕوانە: احمد عيسى بك، تاريخ البيمارستانات في الاسلام، (بيروت:١٩٨١).

([2]) وفيـات الاعيـان، ج٧، ص٢٠٧.هـەروەها(ابـن تغـري بـردي) هـەمان ئـەو زانیاریـەی دووبـارە كردۆتەوە بەوەی لە (ابن خلكان) ی وەرگرتووە.النجوم الزاهرة، ج٦، ص٥٥.

([3]) المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثـار، ج٢، ص٢٨٧.هـەروەها بڕوانـە:خالـدة سـلمان ابـراهيم، الحياة الاجتماعية في مصر خلال العصر الايوبي، رسالة الماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية التربية، جامعة زاخو، (زاخو:٢٠١١م)، ص١٥٢.

([4]) رحلة ابن جبير، دار ومكتبة الهلال، بيروت، ص٢٤.

**شەشەم:مامۆستاو وانە بێژانی کورد لە قوتابخانەو شوێنە زانستیەکاندا:**

وانەبێژی بە یەکێك لە کارە ئاینیە بایەخدارەکان دادەنرا، لە خوێندنگاکانیش زانستە شەرعیەکان و ئەوەی پابەندە بە ئاینی ئیسلام دەخوێنرا، هەروەکو (القلقشندي) ئاماژەی بە زانستەکانی هەریەکە لە شەرعناسی(الفقه)و فەرموودەو تەفسیر و ڕێزمان(النحو)و زمانەوانی (اللغة)کردووە، کە لە قوتابخانە ئیسلامیەکان دەخوێنرا، ئەو کەسانەش کە تەرخان دەکران بۆ وانەتنەوە، دەبوایە لە ڕووی زانستی و ئاینیەوە ئاست بەرز بن[1] .(ابن خلكان) لە كتێبەكەی ئاماژەی بە زۆر لە وانەبێژانی کورد کردووە، کە خەریکی وانەوتنەوە بوونە لە خوێندنگاکاندا، ئەوانیش:

١) **أبو القاسم ابن كج القاضي :**

زانایەکی ڕێبازی شافعی بووە، بینین و خوێندنەوەی جوانی هەبووە، بۆ مەزهەبی شافعی، چەندین کتێبی لەسەری بەرهەم هێناوە، کە شەرعناسەکان سودیان لێ بینیوە[2] .

شەرعناس و زانایەکی ئەوەندە گەورە بووە، بەڕادەیەك، (ابن خلكان) دەڵێت: (السمعاني م:٥٦٢ك/١١٦٦ز )وتوویەتی: کاتێ کە (أبو علي الحسين بن شعيب السنجي)[3] لە خزمەتی شێخ (أبي حامد الإسفرايني م:٤٠٦ك/١٠١٥ز) گەڕاوەتەوە، لە

(1) صبح الاعشى، ج٤، ص٤٠؛قادر محمد حسن، اسهامات الكرد في الحضارة الاسلامية، ص١٨٩.

(2) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٠.

(3)حسين بن شعيب : ابو علي المروزي السنجي، شەرعناسی شافیعی بووە، زانای شاری (مرو) بووە، لە بەغدا لەسەردەستی شێخ(ابی حامد)پێگەیشتووە، یەکەم کەس بووە لەمەزهەبێك ڕێگای (طريقة)خوراسانی وعیراقی بەیەکەوە کۆبکاتەوە، لەسالی(٤٣٠ك/١٠٣٨ز)کۆچی دوای کردووە.الذهبي، تاريخ الاسلام، ج٩، ص٤٧٤؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٢، ص ص٢٣٤_٢٣٥.

دینەوەر چاوی بە (أبو القاسم ابن كج) کەوتووەو بە دەریای بێ بنی زانست و فەزڵی ئەوی زانیوە، گوتویەتی: مامۆستا زانیاری زۆر و زەبەند لای تۆیە و ناوو ناوبانگ هی شێخ (أبي حامد الإسفرايني)ە، (ابو القاسم ) وەڵامی داوەتەوە: ئەو بەغدا ناوی بەرز کردۆتەوە و ئەمنیش دینەوەر، ئاوا کەس نەناس هێشتوومیەتیەوە[1] . هەرچەندە (ابن خلکان) ئاماژەی بە ناوی کتێبەکەی (السمعانی) نەکردووە، کە ئەو زانیاریەی لێ وەرگرتووە، بە دوا داچوونمان بۆ چەند کتێبێکی (السمعانی)کرد، بە تایبەتی (الانساب) کە کتێبێکی ناوازەیە، هەمان زانیاریەی تیا بوو[2] .

٢) ابن البزری :

شەرعناسی شافیعی بووە، ئیمام وموفتی و فقهی (جزیره ابن عمر)بوو، لە (جزیرە) خەریکی وانە وتنەوە بوو، لەسەر ڕێبازی خۆی.لایەنی زانست و دینی لە ئاستێکی بەرز دابوو، زۆر گرنگی بە مەزهەبی شافیعی داوە، خەڵکێکی زۆر سودیان لێ بینیوە. تادوا کاتی ژیانی بە دەرس گوتنەوەو و فتوادان بەسەربرد[3] .

---

(1) وفيات الاعيان، ج٧، ص٦٥؛الذهبي، سير أعلام النبلاء، ج١٣، ص٨؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٩، ص٤٠؛ ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب في أخبار من ذهب، ج٥، ص ص٣٥_ ٣٦؛بابە شێخی مەردۆخ رۆحانی، مێژووی ناودارانی کورد، ب١، ل٢٧.

(2) الأنساب، تحقيق: عبد الله عمر البارودي، دار الجنان، ١٩٨٨، ج٥، ص٣٦.

(3) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٤٤٤_٤٤٥؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١٧٤؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٣١٢؛ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج١، ص ص٣٢٠_٣٢١.

(ابـن خلكـان) دەڵێـت: کـەس وەکـو ئـەو قوتابیـەکی زۆری لـەدوای خـۆی بـەجێ نەهێشتووە[1].وا دیـارە ئـەم وتەیـەی (ابـن خلكـان) لـە بـارەی زۆری قوتابیـەکانی(ابـن البزري) لەکتێبی (تقي الدين ابن الصلاح)ی مامۆستاکەی خـۆی وەری گرتبێـت، چـونکە (ابـن الصـلاح) لەیـەکێك لـە کتێبـەکانی ئامـاژەی بـەم زانیارییـە کـردووە، کـە (ابـن خلكان)باسی کردووە[2].(الفقيه عيسى بن محمد الهكاري)یەکێك بووە لە وانـەی لای ئـەو خوێندوویەتی[3]. هەروەها یەکێك لـە مامۆسـتاکانی( عبـدالرحمن بـن عثمـان )ی بـاوکی (تقي الدين ابن الصلاح الشهرزوري) بووە، کە لەلای (ابن البزري) خوێندوویەتی[4] .

**٣) الشيخ الخضر بن عقيل الإربلي :**

دوای پێگەیشـتنی لـە بەغـداوە گەڕاوەتـەوە هـەولێر، پاشـان مـیر (أبـو منصـور سـرفتكين بـن عبـد الله الـزيني م:٥٥٩ك/١١٦٣ز) جێگـری خـاوەنی هـەولێر، لـە سـاڵی

---

(١) وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٤٥؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص١٧٤؛ ابن قاضي شهبة، طبقات الشافعية، ج١، ص٣٢١.

(٢) طبقات الفقهـاء الشـافعية، تحقيـق: محـي الـدين علـي نجيـب، دار البشـائر الاسـلامية، (بـيروت: ١٩٩٢)،ج٢، ص٦٨٥.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٤٥؛ السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٢٥٥؛ ابن حجر العسقلاني، رفع الإصر عن قضاة مصر، ص٢٩٤.

(٤) ابـن الصـلاح وسـراج الـدين، مقدمـة ابـن الصـلاح ومحاسـن الاصـطلاح، تحقيـق: د عائشـة عبـد الرحمن، دار المعارف، القاهرة، ص١٤.جگە لەمە چەندین خەلکی ناوبانگ بۆ فێربوونی زانسـت هاتۆنەتە خزمەتی (أبو شجاع الفقيـه الـواعظ الصـوفي) یـەکێك بـوو لـەو خوێندکارانـەی هاتۆتـە جەزیرەی ئیبن عومەرلەلای(ابن البزری) پێگەیشتووەوخوێندوویەتی. ابـن الـدبيثي، ذيـل تـاريخ مدينة السلام، تحقيق: بشار عواد، دار الغرب الاسلامي، ٢٠٠٦، ج٢، ص١١٧.

(٥٣٣ك/١١٣٨ز) قوتابخانەی قەلعەی بۆ دەرس گوتنـەوەی مامۆسـتا (الخصـر) بنيـات ناوە ئەو یەکەم کەس بوو، کە دەرسی لە هەولێر داوەتەوە[١] .

(ابن خلكان) دەڵێت: زۆر کەس لە ژێـر دەسـتی ئـەم مامۆسـتایە خوێنـدنیان تـەواو کردووە، لە وانەش (ضياء الدين أبو عمرو عثمان بن عيسىابن درباس الهذباني)و( عـز الدين أبو القاسم نصـر بـن عقيـل ابـن نصـر )کـە بـرازای خـۆی بـووە[٢] . ماوەیـەك لـەم قوتابخانەیـە خـەریکی وانەوتنـەوەو ڕاهێنـانی قوتابیـان بـوو، تـاوەکو لـە سـاڵی (٥٦٧ك/١١٧١ز) کۆچـی دوای دەکـات و هـەر لـە قوتابخانەکـەی دەنێـژرێ[٣] . لـە دوای خۆی ( عز الدين أبو القاسم)ی برازای ئـەرکی بـەڕێوەبردنی قوتابخانەکـەی لـە ئەسـتۆ گرتووەو دەرسی تێدا وتووەتەوە، (ابن خلکان) دەڵێت: (( کەسێکی خاوەن فەزل بووە، هـەر لـە هـەولێر لـە سـاڵی (٥٣٤ك/١١٣٩ز) لـە دایکبـووە، بـەڵام دوای ماوەیـەك لـە وانەوتنەوە لەلایەن (مظفر الدين كوكبري) خاوەنی هەولێر لە سـاڵی (٦٠٢ك/١٢٠٥ز) یـان (٦٠٣ك/١٢٠٦ز) دەردەکـرێ ڕوودەکاتـە شـاری (موصـل) هـەر لـەم شـارە لـە سـاڵی (٦١٩ك/١٢٢٢ز)کۆچی دوای دەکات[٤] .

---

([١]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٧؛ ابن كثير، البداية والنهاية، ج١٢، ص٢٥٣؛السبكي، طبقات الشافعية الكبرى، ج٧، ص٨٣

([٢]) وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٧؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٢٠٩؛ محسن محمد حسين، اربيل دراسة تاريخية، دار اراس، (اربيل: ٢٠١٢)،ص٤٨؛ اميد ابراهيم جوزەلی، الحياة العلمية في اربيل، ص٩١.

([٣]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٢٣٨؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٦٢؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج١٣، ص٢٠٩.

([٤]) وفيات الاعيان، ج٢، ص ص٢٣٨_٢٣٩؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٣٦٢.

**٤) شهدة بنت الإبري :**

یەکێك بووە لە زاناکان، لە فەرموودە و ڕەوایەتدا، کەسێکی ناسراوی بەغدا بووە و قوتابیان بە گەورەو بچووکەوە لە کۆڕی دەرسیدا کۆبوونەتەوەو بەهرەیان بردووە، تاوەکو لە ساڵی (٥٧٤ك/١١٧٨ن) کۆچی دوای کردووە[١] .

**٥) السدید السلماسي:**

شەرعناسی شافیعی بووە. ئیمامی سەردەمەکەی خۆی بوو[٢]. خەریکی وانە وتنەوە بووە لە قوتابخانەی (نظامیة)لە شاری بەغداد[٣] . (ابن خلكان) سەبارەت بە زانا (سلماسي) دەڵێت: شارەزا بووە لە چەندین هونەر. فەتواکانی زۆر ڕاست و جوان دەیپێکا، خەڵکێکی زۆر لەوڵاتان و ناوچەکانی ترەوە هاتۆنەتە خزمەتی و سودیان لێ بینیوە.چەندین زاناو مامۆستاو خاوەن کتێبەکان لە ژێر دەستی ئەم زانایە دەرچوونەو پێگەیشتونە[٤] .

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٢، ص٤٧٧؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٣٨؛الصفدي، الافي بالوفيات، ج١٦، ص١١١.

(٢) وفيات الاعيان، ج٤، ص٢٣٧؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٤٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٥، ص١٠٤؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٣؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٠٥.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٢٣٧؛ اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٣.لەسەرچاوەی تر دەڵێن (سلماسی) موعید(معيد) بووە لە قوتابخانەی (النظامية).الذهبي، العبر في خبر من غبر، ج٣، ص٢٣٦؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٥، ص١٠٤؛الداوودي،طبقات المفسرين، ج٢، ص٣٤٣.

(٤) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص٢٣٧؛الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٢، ص٥٤٥؛ الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٥، ص١٠٤؛اليافعي، مرآة الجنان وعبرة اليقظان، ج٣، ص٣٠٣.

**٦) الفقيه عيسى الهكاري :**

یەکێك بووە لە فـەقێ و شەرعناسـەکان[١]، خـەریکی وانـەی وتنـەوەی شەرعناسـی بووە، لە قوتابخانەی (الزجاجية)[٢] لە شاری حلب[٣] . بەوە ناسراوە کە ئیجتیهادی لـەو بابەتانە کردووەکە موسڵمانان لەوکات پێویستیان پێبووە[٤] .

**٧) ضياء الدين الماراني :**

ئەم زانایەشارەزاییەکی کەم وێنەی هەبووە لـە مەزهـەبی شـافعی، هـەر بۆیـە (ابـن خلكان) لەم بارەیـەوە دەڵێـت: ((زیـرەکترین شەرعناسـی مەزهـەبی شـافعی بـووە لـەو کات))[٥] .

پاشـان دوور خرایتـەوە لـە پۆسـتەکەی. لـە دواییـدا مـیر (جمـال الـدين خشـترين الهكـاري م:٦١٩ك/١٢٢٢ز) قوتابخانەیـەکی لـەنێو کۆشـکی (قـاهیرە) دروسـت کردبـوو،

---

(١) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ض٤٩٧؛ ابن كثير، طبقات الشافعيين، ص٧٢١.

(٢) (الزجاجية) : ئەم قوتابخانەیە لەلایەن(بدر الدولة أبو الربيع سليمان بن عبد بن ارتـق) خـاوەنی حلب، لەحلب لەگەڕەکی (الجلوم) بونيات نراوە، هەر لەم گەڕەکـە کارگەیـەکی شوشـە دروسـت کردنی تيابوو، هەربۆیە بەوناوە (الزجاجية) ناسـراوە، بـۆ مەهـەبی شـافیعیەکان بووکـە تیایـدا زانا(شرف الدين أبو طالب عبد الرحمن ابن العجمي) بۆ یەکەم جار وانەی تیایدا داوەتـەوە. ابـن شداد، الاعلاق الخطيرة، ج١، ص٢٤٢؛الذهبي، الكاشف في معرفة مـن لـه روايـة في الكتـب السـتة، تحقيق: محمد عوامة أحمد، مؤسسة علوم القرآن، (جدة: ١٩٩٢)،ص٩٣.

(٣) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص٤٩٧.

(٤) المنـذري، التكملـة لوفيـات النقلـة، مـج١، ص١٢٣؛ ابـن كـثير، طبقـات الشـافعيين، ص ص٧٢١_٧٢٢.

(٥) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٢؛اليافعي،مرآة الجنان وعبرة اليقظـان، ج٤، ص٣؛السـيوطي، حسـن المحاضرة في تاريخ مصر والقاهرة، ج١، ٤٠٨.

ئەرکی بەڕێوەبردنی ئەم قوتابخانەیەی بە قازی (ضیاء الدین المارانی) سپارد، ئەویش دەستی کرد بەوانە وتنەوە تیایدا[١].

٨) مکي الماکسیني النحوي:

ئەم زانایە لە زێدی خۆی گەشتی زانستی بۆ (موصل) دەکات، لە (موصل) خەریکی زانستی ئەدەب دەبێت و گرنگی پێدەدات، پاشان گەشت بۆ بەغداد دەکات، لەگەڵ ئەدیبەکان کۆدەبێتەوەو سودمەند دەبێت. دوای پێگەیشتنی لە بواری ئەدەبیدا دەگەڕێتەوە بۆ (موصل)، لەم شارە خەڵکێکی زۆر ڕووی تێدەکەن و سودی لێدەبینن[٢].

٩) عبد الرحمن بن عثمان بن موسی الشهرزوري:

(عبد الرحمن ) باوکی (ابن الصلاح الشهرزوري)بوو، زاناو وانەبێژێکی تری کورد بوو، لە دوای پێگەیشتنی لە زانستە شەرعیەکاندا، دەستی کرد بە وانەوتنەوە لە قوتابخانەی (الاسدیة)[٣]لە شاری (حلب) بەردەوام بوو، لە مامۆستایەتی ئەم قوتابخانەیە تاوەکو لە ساڵی(٦١٨/١٢٢١ز) کۆچی دوایی کردووە[٤] .

(١) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص٢٤٢؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج١٩، ص٣٣١؛الیافعي،مرآة الجنان وعبرة الیقظان، ج٤، ص٣.

(٢) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٥، ص٢٧٨؛ الصفدي، الوافي بالوفیات، ج٢٦، ص ص٣٢_٣٣.

(٣) هەمان ئەو قوتابخانەیە کە (اسد الدین شیرکۆ) دروستی کردووە.کەپێشتر ئاماژەمان پێ کردووە.

(٤) ابن خلکان، وفیات الاعیان، ج٣، ص ص٢٤٤_٢٤٥؛ الذهبي، تاریخ الاسلام، ج١٣، ص٥٤٤؛ السبکي، طبقات الشافعیة الکبری، ج٨، ص١٧٥؛ عبدالحمید جعفر الفتاني، الامام الحافظ ابو عمروابن الصلاح وکتابه علوم الحدیث الشهیر بالمقدمة، ص ص٤٤_٤٥.

**١٠) تقى الدين ابن الصلاح :**

(ابن الصلاح) يەكێك لەو مامۆستاو وانەبێژانی کورد بووە، کە تەمەنێکی زۆری بۆ وانەوتنەوە لە قوتابخانەو شوێنە زانستیەکاندا تەرخان کرد، بۆ نموونە لە شاری (قودس) لە قوتابخانەی (الناصرية) خەریکی وانە وتنەوە دەبێت، ماوەیەك دەمێنێتەوە، خەلکێکی زۆر لێی سودمەند دەبن، پاشان لە (قودس) گەشت دەکات بۆ (دیمەشق) لەم شارە لە سێ شوێن لە یەك کاتدا خەریکی وانەوتنەوە دەبێت، ئەوانیش قوتابخانەکانی (الرواحية)[١] و (الشامية الجوانية/ست الشام)و لەگەڵ (دار الحديث)ی مەلیك (الاشرف) دا[٢] .

(ابن خلكان) دەڵێت: (( لە هەرسێ شوێنەکە بەبێ دابڕان بە کاروبارەکان هەڵدەسا مەگەر عوزرێکی پێویستی هەبووایە، پیاوێکی خاوەن دین و زانست بوو، لە ساڵی (٦٣٢ك/١٢٣٤ن)چوومەتە لای لە (دیمەشق) بۆ ماوەی یەك ساڵ دەرسم لەلای خوێند))[٣] .بەم پێیە دەردەکەوێ کە (تقی الدین ابن الصلاح) زانایەکی زۆر لێهاتوو شارەزابووە، بە تایبەتی لە زانستی فەرموودەو شەرعناسیدا زۆر کارامە بووە، بەڕادەیەك توانیویەتی لە چەندین قوتابخانەدا بەسەرکەوتوویی وانە بڵێتەوە.

---

(١) الرواحية: ئەم قوتابخانەیە لەلایەن (زكي الدين ابو القاسم هبة الله) کەبە (ابن رواحة) ناسراوە دامەزراوە، هەربەناوی خۆی بووە، وەقفی کردووە، کتێبخانەیەکیشی تیابووە.وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤؛ابن شداد، الاعلاق الخطيرة، ج١، ص٢٥٥؛ النعيمي، الدارس في تاريخ المدارس، ج١، ص١٩٩؛ناصر محمد علي الحازمي، الحياة العلمية في دمشق في العصر الايوبي، ص٢٨١.

(٢) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٣_٢٤٤؛ ابن الوردي، تاريخ ابن الوردي، ج٢، ص١٧١؛الصفدي، الوافي بالوفيات، ج٢٠، ص ص٢٦_٢٧؛ النعيمي، الدارس في تاريخ مدارس، ج١، ص١٦.

(٣) وفيات الاعيان، ج٣، ص٢٤٤.هەروەها(الذهبي) یش ئاماژەی بەم زانیاریە کردووە بەوەی لە(ابن خلكان) ی وەرگرتووە، تذكرة الحفاظ، ج٤، ص١٤٩.

**١١)أبو عمرو ابن الحاجب :**

(ابن الحاجب)، دوای ئەوەی لە منداڵیەوە لە (قاهیرە) خەریکی قورئانی پیرۆز بوو، دەستی کردووە بە خوێندنی فیقهی ڕێبازی ئیمام مالیکی و چەندین زانستی تر، پاشان چووە بۆ (دیمەشق) و لە قوتابخانەیەکی تایبەت بە مامۆستایانی مالیکی، کۆڕێکی وانەدانەوەی دامەزراند و لە ماوەیەکی کەمدا ناوو ناوبانگی بەدەرکەوت و قوتابیان لە هەموو لایەکەوە ڕوویان کردە قوتابخانەکەی[1] .

پاشان لە (دیمەشق)ەوە گەڕاوە (قاهیرە)و ماوەیەك لەوێ وانەی گوتەوەو دواتر چوو بۆ ئەسکەندەریەو تا دوا ساتی ژیانی لەو شارەدا مایەوە[2].

**ئەوەی لەم بەشەدا تێبینیمان کردبێت، لەسەر چۆنیەتی و شێوازی هەڵسوکەوت کردنی (ابن خلکان) لەگەڵ ناساندنی کەسایەتیە کوردییەکان، بەم شێوەیە بووە:**

١) لەنووسینەوەی ژیننامەی زانایان تەنیا گرنگی بەو کەسایەتیانە داوە کە زۆر بە ناوبانگ وناسراو بوونە لە جیهانی ئیسلامیدا، بەڕادەیەك زۆربەیان خاوەنی پلەو پۆست بوونە، لە ڕووی ئیداری و ڕۆشنبیری وسیاسی دا .

٢) زۆربەی زۆری ئەو زانایانەی کە نووسەر گرنگی پێداون، لەسەرگوزشتەی تایبەت ئاماژەی پێکردون، شافیعی مەزهەب بوونە. لێرەدا جگە لەوەی سۆزی نووسەر بۆ ئەم مەزهەبە بە ڕوونی بۆمان بەدەردەکەوێ، لەلایەکی ترەوە تێبینی ئەوە دەکرێ،

---

([1]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ص٢٤٨_٢٤٩؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ الصفدي،الوافي بالوفيات، ج١٩، ص٣٢٢؛ ابن العمادالحنبلي، شذرات الذهب في اخبار من ذهب، ج٧، ص٤٠٦؛بابە شێخ مەردۆخی، مێژووی ناودارانی کورد، ب١، ل٨٩.

([2]) ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٣، ص ٢٥٠؛ الذهبي، تاريخ الاسلام، ج١٤، ص٥٥١؛ابن العماد الحنبلي، شذرات الذهب، ج٧، ص٤٠٧.

زۆربەی زۆری فەرمانڕەوایانی ئەیوبیی و زانا کوردیەکانی ئەو سەردەمیش سۆزی زۆریان بۆ مەزهەبی شافیعی هەبووە، بەڕادەیەك بەشێکی زۆریان شەرعناسی شافیعی بە ناوبانگی سەردەمەکەیان بوون.

٣) نووسەر بەشی زۆری کتێبەکەی تایبەت کردووە بەژیننامەی کەسە زانستیەکاندا، زۆر لەو زانایانەی لەناوچەکانی ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای جیهانی ئیسلامی ناساندووە کە یەکێك لە بوارەکاندا خزمەتی پێشکەش بە شارستانیەتی ئیسلامی کردووە، سەبارەت بە زاناو ناودارانی کوردیش ناوبراو ئاماژەی بە زۆرێك لەو کەسایەتیە کوردییانە داوە تاڕادەیەك دەتوانین

بڵێین لە نێوان (٨٪) بۆ(١٠٪)ی کتێبەکەی تەرخان کردووە بۆ ژیننامەی کەسایەتییە کوردییەکان، ئەمەش ڕێژەیەکی تاڕادەیەك باشە بەبەراورد بە ڕێژەی کۆی گشتی نەتەوەکانی تردا.

٤) نووسەر زیاتر جەختی لەسەر ئەو زانا کوردیانە کردۆتەوە، جگە لەوەی شەرعناسی بەناوبانگ بوونە لە جیهانی ئیسلامی، ڕۆڵی وانەبێژیان بینیوە لە قوتابخانە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەم، وەك لە قوتابخانەکانی (النظامية)و (الناصرية)و (الرواحية)... هت مامۆستاو وانەبێژ بوونە.

بەشێك لەو کەسایەتی و زانا کوردانەی کە نووسەر لەکتێبەکەی ناوی هێناون و سەرگوزشتەی نووسیون هاوسەردەمی (ابن خلكان) بوونە و لەنێوانیاندا پەیوەندی بوونی هەبووە، ئەمەش هۆکارێکی سەرەکی بووە لەوەی نووسەر هەندێك زانیاری ناوازەو دەگمەن لەسەریان بزانێت ولە کتێبەکەی تۆماریان بکات، کە هیچ سەرچاوەیەك پێش ئەو پەی پێنەبردووەو ئاماژەی پێنەکردوە، تەنانەت زۆرجار مێژوونووسانی دوای خۆشی هەریەکە لە (الذهبي)و(الكتبي)و(الصفدي)و(ابن كثير)و(ابن تغري بردي)و(زركلي)...هت ئاماژەو جەختیان لەسەر ئەو زانیاریە دەگمەنانە کردۆتەوە، بەوەی (ابن خلكان) ئاماژەی پێکردووە لەویان وەرگرتووە.

# ئەنجام

لە کۆتاییی توێژینەوەکەماندا دەتوانین بگەینە کۆمەڵێك ئەنجام کە هەوڵمان داوە لەم چەند خاڵەی خوارەوە کۆیان بکەمەوە:

**یەکەم** : (ابن خلكان) یەکێکە لە کەسایەتیە دیاروبەرچاوەکانی ماڵباتی خەلەکانیەکان.خانەوادەی خەلەکانیەکان لە بنچینەدا کوردی زرزاریین، ئەگەرچی هەندێك لەسەرچاوەکان وانیشان دەدەن کەوا ڕەچەڵەکی (ابن خلكان) دەگەرێتەوە بۆ (بەرمەکیەکان) بەلأم لەڕاستیدا هیچ پەیوەندییەکی ڕەچەڵەکی لە نێوان بنەماڵەی خەلەکانیەکان وبەرمەکیەکان بەدی ناکرێت، چونکە لە ڕووی نەتەوەیی یەوە بەرمەکیەکان لە بنچینەدا دەگەرێنەوە بۆ پاشایانی پێشووی فارس، لە بەرامبەردا خەلەکانیەکان کوردن و لە ڕووی شوێنی جوگرافیاشەوە بەرمەکیەکان دەگەرێنەوە بۆ شاری (بلخ) لە خوراسان بەپێچەوانەوەش، خەلەکانیەکان دەگەڕێنەوە بۆ گوندی خەلەکانی دەوروبەری چیاکانی هەولێر.

**دووەم**:کتێبی (وفيات الاعيان) بەیەکێك لە سەرچاوەمێژوویی وئەدەبیەکان دادەنرێت، بەتایبەتی لەهونەری بەسەرهات و ژیننامە نووسیندا، لە ڕاستیدا ئەم کتێبە گەنجینەیەکی گەورەی لێکۆلینەوەی مێژوو و ئەدەبیات وکۆمەڵناسی و زمانەوانیە، دانەرەکەی کاکڵێکی پوختی ژیانی زانایانی پێش خۆی لە پیاو و ژن کۆکردۆتەوەو لەناوچوون رزگاریکردوون، جگە لەوەش ئەوەی خۆی بیستوویەتی و لە هاوچەرخەکانی خۆی زانیوە بەدەستپاکی تۆماری کردووە، بەگرنگترین سەرچاوە دادەنرێت لە نێو ژیاننامەکان ومێژووی ئەدەبیدا چاکترین بەڵگەش زۆریی و بەربلأوی کتێبەکەیە لەهەموو جیهانی ئیسلامیدا، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کەلایەنی جوگرافیاشی فەرامۆش نەکردووە،

بەڕادەیەك لەسەرگوزشتەی هەرکەسایەتیەك وەسفی جوگرافیاوشوێنی لەدایکبوونی کەسەکەی کردووە.

**سێیەم :** یەکێك لە لایەنەگرنگەکانی ئەم کتێبە ئەو داهێنانەیە کە لە بواری کۆکردنەوەی ژیاننامەکاندا کردوویەتی، هەروەکو(ابن کثیر)لەم بارەیەوە دەڵێت: ((زۆرترین داهێنانی تێدایە))ئەمەش بەهۆی ئەوەی چاکترین ڕێکخستنی بۆ کردوە، ئەو ناودارانەی ئەو لەسەری نووسیوون هەمە کارو هەمەجۆرن و لەهەمانکاتدا سەر بە شوێن و سەردەمی جیاوازبوونە، هەربۆیە بەجوانترین نموونە لە جۆری کتێبە ژیاننامەکاندا لەڕۆژهەلات دادەنرێت، کەبەزمانێکی عەرەبی ڕەوان نووسراوەتەوە، بۆتە مایەی بایەخپێدانی زۆر نووسەری دیکە، لەسەر ڕێوشوێنی ئەو، کتێبیان داناوە، تەنانەت بەهۆی ئەم بەرهەمەوە دەتوانرێ لە زۆر ڕووی گرنگی ژیانی سیاسی وئابووری وڕوناکبیری جیهانی ئیسلامی لەسەدەکانی ناوەراستدا بگەین.

**چوارەم :**(ابن خلکان) گرنگییەکی تایبەتی داوە بە باسی ئەیوبییەکان و کەسایەتیە کوردەکان، لە ڕێی ئەم کتێبەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بنەماڵەی ئەیوبیەکان ڕۆڵێکی کارایان گێراوە لەڕووبەڕووبوونەوەی خاچیەکان بەدرێژای دەیان ساڵ لەتەمەنی دەوڵەتەکەیان.کەسنورێکی بەرفراوانی لەولاتی میسروشام وحیجازویەمەن وولاتی نەوبە (بلاد النوبة) وبەشێك لەکوردستانی لەخۆگرتبوو، وێرای خەریك بوونیان بەکاری رامیاری وسەربازی، لەهەمانکاتدا لایەنی زانستیشیان پشتگوێ نەخستبوو، گرنگی زۆریانداوە بەزانایان وڕۆشنبیران، بگرە لەوەش زیات رزۆرێك لەئەندامانی ئەوبنەماڵەیەخۆیان کەسانی زاناوئەدیب و هونەرومێژوونووس بوونە.

**پێنجەم:**ئەیوبیەکان گرنگێکی زۆریان داوە بە بواری بیناسازی وئاوەدانکاری و پەروەردەیی، بەدەیان قوتابخانەوخانەی فەرموودەو مزگەوت وخانەقاونەخۆشخانەو

خزمەتگوزاری تر لەلایەن ئەو بنەماڵەیە ئاوەدان کراوەتەوە، تەنانەت ژنانی نێو بنەماڵەی ئەیوبی شان بەشانی پیاوانی ئەیوبی ڕۆڵیان گێراوە لەدروست کردنی شوێنە خزمەتگوزارییەکاندا.

**شەشەم**:بەشێکی زۆر لە زانایانی کورد لەسەردەمی ئەیوبی ومەملوکیدا پۆستی دادوەری و قازیقوزاتیان(قاضي القضاة) پێسپێردرابوو، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر شارەزایی ئەو زانایانە لە زانستی شەرعناسی وئاینیدا .

**حەوتەم** :زۆر لە زانایانی کورد بە هۆی پێگەیشتن وزیرەکی وشارەزایی یان لە زانستە شەرعیەکاندا، لە قوتابخانەو شوێنە زانستیەکاندا خەریکی وانەوتنەوە بوون. بەڕادەیەك هەندێك جار لەبەر زانایەکی کورد قوتابخانەیەك ئاوەدان کراوەتەوە، ئەرکی بەڕێوەبردن ووانەبێژی پێسپێردراوە.تەنانەت هەندێك لە زانای کورد لە شاری بەغداوە کە ئەو کات ناوەندی ڕۆشنبیری جیهانی ئیسلامی بوو، ئەرکی وانەوتنەوەیان پێسپێردرابوو، وە زۆرێك لە زانایانی دیاری جیهانی ئیسلامی کەکورد نەبوونە لە ژێردەستی دەیان مامۆستای کوردی وەکو (ابن الصلاح شەهرەزوری) و(ابن الحاجب نەحوی) و(مکی الماکسینی)... هتد، پێگەیشتون.

**هەشتەم** :زۆربەی زۆری ئەو کەسایەتیە کوردانەی کە لەلایەن (ابن خلکان) سەرگوزشتەیان نووسراوەوباسکراون شافیعی مەزهەب بوونە.

**نۆیەم**:بەشێکی زۆر لە زانایانی کورد لەسەردەمی ئەیوبی ومەملوکیدا لە زێدی خۆیان کۆچیان بۆ شام ومیسر کردووە، هەرلەوێش خزمەتیان کردووە، تاوەکو کۆچی دوایی یان کردووە

# ليستى سەرچاوەكان


**القرآن الكريم**

**يەكەم: بەلگەنامەكان (المخطوطات) :**

**الاشعري:عبدالرحمن بن جوهر احمد العربي:**

١) مختصر وفيات الاعيان لابن خلكان، معهد المخطوطات في القاهرة، تحت رقم(٧٠)

**هروي:عبدالرحمن فامى:(ت:٥٤٦هـ/١١٥١م):**

٢) تـاريخ هـرات، دستنوشسـتى نويافتـه، مركـز پژوهشـى، مـيراث مكتـوب، (تهران:١٣٨٧)

**دووەم :سەرچاوە ڕەسەنەكان (المصادر الاولية):**

**ا) سەرچاوە بنەڕەتیەكان بە زمانی عەرەبی ( المصادر الاصلية العربية):**

**ابن الأثير :عز الدين أبي الحسن علي بن محمد بن محمد الجزري (ت ٦٣٠هـ/١٢٣٢م):**

١- أسد الغابة في معرفة الصحابة، دارالفكر(بيروت:١٩٨٩م)

٢- لتـاريخ البـاهر في الدولـة الاتابكيـة، تحقيـق:عبـد القـادر احمـد، دار الكتـب الحديثـة، القاهرة، (ت)

٣- الكامل في التاريخ، تحقيـق: عمر عبـد السـلام تـدمري، دار الكتـاب العربـي، (بـيروت :١٩٩٧م).

**الادريسي : محمد بن محمد بن عبد الله(ت:٥٦٠هـ/١١٦٥م)**

٤- نزهة المشتاق في اختراق الآفاق، عالم الكتب، (بيروت:١٤٠٩ك)

**ابن الأزرق الاندلسي:ابو عبد الله محمد(ت:٨٩٦هـ/١٦٧٩م)**

٥- بدائع السلك في طبائع الملك، تحقيق: علي سامي النشار، وزارة الاعلام، عراق، (ت)

**الأستراباذي:نجم الدين محمد بن الحسن الرضي (ت:٦٨٦هـ/١٢٧٨م)**

٦- شرح شافية ابن الحاجب، تحقيق:عبد المقصود محمد، مكتبة الثقافة الدينية(م:٢٠٠٤م).

**اسحاق بن المنجم: إسحاق بن الحسين المنجم (ت: ق ٤هـ)**

٧- آكام المرجان في ذكر المدائن المشهورة في كل مكان، عالم الكتب (بيروت:١٤٠٨)

**الاسنوي :جمال الدين عبد الرحيم بن حسن، (ت:٧٧٢هـ/١٣٧٠م)**

٨- طبقات الشافعية، دار الكتب العلمية، (بيروت:١٩٨٧م)

**الأصبهاني : عماد الدين بن محمد بن صفي الدين الكاتب (ت:٥٩٧هـ/١٢٠٠م)**

٩- البرق الشامي، تحقيق: فالح حسين، مؤسسة عبد الحميد شومان، (عمان:١٩٨٧م).

١٠- خريدة القصر وجريدة العصر، تحقيق: شكري فيصل، المطبعة الهاشمية، (دمشق:١٩٦٨)، قسم شعراء بني ايوب .

١١- الفتح القسي في فتح القدسي، دار المنار(مصر:٢٠٠٤).

**ابن أبي أصيبعة : موفق الدين أبو العباس أحمد بن القاسم الخزرجي، (ت: ٦٦٨هـ/١٢٦٩م)**

١٢- عيون الأنباء في طبقاتالأطباء، تحقيق:نزار رضا، دار مكتبة الحياة، (بيروت :ت)

**الأنباري :ابو بكر محمد بن القاسم بن محمد بن بشار(ت:٣٢٨هـ/٩٤٠م)**

١٣- الزاهر في معاني كلمات الناس، تحقيق: حاتم صالح الضامن، مؤسسة الرسالة، (بيروت:١٩٩٢)

**بدر الدين: أبو عبد الله محمد بن إبراهيم بن سعد الله(ت:٧٣٣هـ/١٣٣٣م)**

١٤- تحريم الأحكام في تدبير أهل الاسلام، تحقيق: فؤاد عبدالمنعم، ط٢، دار الثقافة، (الدوحة:١٩٩٨)

**البرزالي: ابو محمد القاسم بن محمد بن يوسف، (ت:٧٣٩هـ/١٣٣٨م)**

١٥- المقتفي، ديراسة وتحقيق:يوسف ابراهيم الزاملى، رسالة مقدمة للنيل درجة الدكتورا، جامعة ام القرى، (سعوديا:١٩٩٥م)

١٦- الوفيات، وعلق عليه:ابو يحيى عبدالله الكندرى، غراس للنشر والتوزيع، (كويت:٢٠٠٥م)

**ابن بطوطة : ابو عبد الله محمد بن عبد الله الطنجي (ت:٧٧٩هـ/١٣٧٧م)**

١٧- تحفة النظار في غرائب الأمصار وعجائب الأسفار(رحلة ابن بطوطة )، اكاديمية المملكة المغريبية، (الرباط:١٤١٧).

**أبو البقاء: أيوب بن موسى الحسيني القريمي الكفوي(ت:١٠٩٤هـ/١٦٨٢م)**

١٨- الكليات، تحقيق:عدنان درويش ومحمد المصرى، مؤسسة الرسالة، (بيروت:١٩٩٨)

**البقاعي: برهان الدين إبراهيم بن عمر(ت:٨٨٥هـ/١٤٨٠م)**

١٩- النكت الوفية بما في شرح الألفية، تحقيق: ماهر ياسن الفحل، مكتبة الراشد ناشرون، (م: ٢٠٠٧).

**البكري: أبو عبيد عبد الله بن عبد العزيز بن محمد البكري الأندلسي (ت:٤٨٧هـ/١٠٩٤م)**

٢٠- المسالك والممالك، دار الغرب الإسلامي(بيروت: ١٩٩٢).

٢١- معجم ما استعجم من أسماء البلاد والمواضع، ط٣، عالم الكتب، (بيروت:١٤٠٣).

**البلاذري: أحمد بن يحيى بن جابر بن داود(ت:٢٧٩هـ/٨٩٢م)**

٢٢- جمل من أنساب الأشراف، تحقيق: سهيل زكار ورياض الزركلي، دار الفكر( بيروت:١٩٩٦)

**بهاء الدين الجندي: محمد بن يوسف بن يعقوب (ت:٧٣٢هـ/١٣٣٢م)**

٢٣- السلوك في طبقات العلماء والملوك، تحقيق: محمد بن علي، ط٢، مكتبة الارشاد، (صنعاء:١٩٩٥م)،

